ئیسماعیل حەمە ئەمین



# نەوەکان

# گەڕەلاوژەکانیان

2006

# کتێب

ناوی کتێب : نەوەکان و گەڕە لاوژەکانیان

بابەت : کۆمەڵە وتار

نوسینی :ئیسماعیل حەمە ئەمین

تایپ : شکار غەریب

دیزاینی بەرگ : هاوبەش عوسمان

هەڵەچن : بیشوی ـاهر حەمە ئەمین

شوێنی چاپ : چاپەمەنی هیمن

تیراژ : ٥٠٠ دانە

چاپی یەکەم ٢٠٠٦

ژمارەی سپاردن : (731) ساڵی ( ٢٠٠٦ )

# پێڕست

# چەند وشەیەکی پێویست

ئەم گوتارانەی بەردەستان پابەندن بەکۆمەڵێك ڕووداوی جۆراوجۆر و کێشەئامێزەوە ، کەهەموو یەکێك لەوانە چەمکێك ، بیرۆکەیەك ، کێشەبەندیەکی فیکری و فەلسەفی لەمەڕ جیهانی لەلامان هاروژاندووە. هەموو ئەو چرکەساتەنەی بەریەکەوتنمان لەبەرامبەر دنیایەکی پڕ کێشەیەندی کوردی، چرکەساتی بیرکردنەوەی خودێکن دەیەوێت ئەو شوێنایە داگیربکات کەبیرکردنەوە پێی بەخشیوە..دیارە نوسین لەم بارەدا کێشە ئامێزە و جۆرێکە لەڕایەڵکردنی هەموو گومانێك بەسەر تەنافەکانی کۆنەخوازی و کۆنزەرڤاتیزمەوە.

ئەم گوتارانە لەزۆر شوێنی جیاواز و لەسەر کۆمەڵێ بابەتی جوداواز نوسراون ، زۆربەیان لێرەو ولەوێ لەگۆڤارو ڕۆژنامەکاندا بڵاوبوونەتەوە، بۆ ئەوەی خوێنەرێکی ڕەدوکەوتووی گوتارەکان و تێکستەکان خۆشیان لە پەرتبوون و پەرەوازەیی بپارێزم ، هەستمکرد پاراستنی لەدووتوێی کتێبێکدا پێویستە، هەم بۆئەوەی خوێنەر لەبەردەم زنجیرەیەك بیرکردنەوە و لێکدانەوەی جۆراوجۆربێت ، هەم بۆ ئەوەیە کە ڕووداو سەرسامیەکانمان ئاوەها لەنێو ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا نەچنە خانەی لەبیرچوونەوە.

گوتارەکان وەکوخۆیان بڵاوبوونەتەوە، بێئەوەی جارێکی دیکە کار لەسەر ناوڕۆکیان بکەم، بۆ ئەوەی دەربڕینێکی بێ پێچ وپەنا بێت لەمەڕ بیرکردنەوەی ئەوساکە و چرکەساتی ئەو زەمەنی چەمك و ئیدیایەکانی هاروژاندووە.

هیوام وایە ( نەوەکان و گەڕەلاوژەکانیان.. ) جێگەی گفتوگۆ و هاروژاندنێك بێت ، کەخوێنەر نێزیك بکاتەوە لەماناکانی توندوتیژی وشە و تیژی ڕەخنەگرانەی ڕاستەقینە لەمەڕ دنیای کوردی ، نەك بۆ ئەوەی ڕەخنە ئامانجێك بێت ، نەخێر، بەڵکو لە پێناو ئەوەی تیژی ڕەخنەگرانە لەخودی خۆیدا،ببێت بە شێوازێك لە شێوازەکانی ژیانمان.

ئیسماعیل حەمەئەمین –نورنبێرگ –ئەڵمانیا – بەهاری ٢٠٠٦

## ئیدوارد سەعید : هەڵگێڕەوەی دیوی دووهەمی ئیمپریالزم ..[1]

-١-

جەنگی ئیدوارد سەعید لەگەڵ نەخۆشی شێرپەنجەی خوێن، جەنگی جەستەیەك بوو بۆ ماوەی سێزدەساڵ خۆی ڕاگرت، خۆڕاگرتنێکی بێوێنە لە پشتیەوە چالاکیەکی زیهنی و دەماغی پڕ جوڵەو ترپە و هەرای ئیدیاکانی لەپشتەوە وەستابوو. لەوانەیە نوسین لە سەر بیری ئیدوارد سەعید و کارەکانی چەندەها دووبارە خوێندنەوەی کتێب و چاوپێکەوتن و ڕیزبەندیەکی ئاوەهای پێویستە بێت ، کەتێدا جیاوازی بکەین لە نێوان سەعیدی فەیلەسوف، سەعیدی ڕەخنەگری ئەدەب ، سەعیدی عەرەبی فەلەستینی، سەعیدی مۆسیقی ، سەعیدی مرۆڤ لەژیانی ڕۆژانەدا، ئەمانە چەندە پۆلێنکردنی دەوێت ، ئەوەندەش پابەستکردنیان بەیەکەوە و کۆکردنەوەی ئەم هەموو شەبەنگانە، خوێندنەوەو ڕادەیەکی باشی ووردەکاری تێگەیشتنی پێویستە. بەڵام دەتوانین بەگشتی لەژێر نێوی [ بیریار/ بیرمەند] دا لەئیدوارد سەعید تێبگەین.

ئەوەی لەم پیاوەدا سەرنجڕاکێش بوو گۆڕینی وێنەی ڕۆژهەڵاتیە لە بونەوەرێکی سادە یاوەکو هەژارێك لەبەردەم دەرگای ڕۆژئاوا دەرۆزە دەکات و تەواوی کاری ئەو دەرۆزەیە، پچڕینی بڕوانامەیەکی زانکۆییە یاوەکو وەرگرێکی بیروڕاکانی ئەوان بێت بێئەوەی شوێنای خۆی لە ئەویتر (ڕۆژئاوا) دیاریبکات، یاوەکو وێنەی ڕۆژهەڵاتیەك کەتوڕەو هەڵچووە و هەموو پرۆژەیەکی ئەقڵانی ڕەتدەکاتەوە، هەموو پرنسیپێکی ئونیڤێرسالی بە دژە پرۆژەی کلتووری خۆی تێدەگات، مادامەکی ئەم پرنسیبانە لە دەوڵەتێکی داگیرکار و ئیمپریالی یاوەکو غەیەرە ئیسلام ، یاوەکو کاپیتالیستەوە بەرهەمهێنراون، لەنێوان ئەم دوو فیگورەدا فیگورێکی نازایانەتر هەیە ، لە مەلەوانێك دەچێت لەمسەری دەریاچەکەوە تاوەکو ئەوسەری بە مەلەدەبیڕێت و لەوسەریشەوە دێتەوە بۆ ئەمسەر ، بەجۆرێك کەئیدی هەموو گەرمی و ساردی و شەپۆلی سەخت و مەنگی دەریاچەکە دەناسێ ، ئیدوارد سەعید ئەو مەلەوانە بوو، لە وسەری کلتووری ڕۆژهەڵاتەوە خۆی کرد بە کلتووری ڕۆژئاوادا ، لەدوای مەلەیەکی سەخت و بێپسان وێ

[1] لەژمارە ١٥٨ و ١٥٩ ی هەفتەنامەی هاوڵاتی بڵاوبۆتەوە.

پشوو ، جارێکی دیکە خۆی کردەوە بە ڕۆژهەلات و بەڕۆژئاوادا، ئەو کەسەیری دەریاچەکە دەکات دەزانێت لەکوێدا دەبێت مەلەباسکەبکەیت و لە کوێشدا دەتوانی بەهێمنی خۆت بدەیتە دەم شەپۆلێکی هێمن و بە مەلەبۆقە لەگەڵ ئەو شەپۆلەدا مەلەبکەیت، سەعید ئەو بیرمەندەیە کەنەدەرۆزەکارێکی بێتامی ئاکادیمیە و نە ڕەتکەرەوەیەکی فوندەمێنتاڵی بیری ڕۆژئاواشە ، بەگشتی ئەو ئەو فیگورەیە لەنێوان دووکلتووری جیاواز و مێژووی بەریەکەوتنی هەردووکیاندا ، چیرۆکی هەردووکیان دەگێڕێتەوە و بەتوندیش ڕەخنەی خۆی پیادەئامێز دەکات.

سەعید ئاوەهابوو .. خۆی کرد بە بیری ڕۆژئاوادا و لە سێنەتەری دەسەلاتدا کە بیری ڕۆژئاوایە کورسیەکی بۆ خۆی داگیر کرد، کورسی بیریارێك کەبێپسانەوە هەوڵی داماڵینی ماسکی جوانی ڕۆژئاوا دەدات ، میشێل فۆکۆیانە ئەو پەیوەندیە ئاشکرا دەکات کەلەنێوان حەیاچوونە خوێناویەکانی دەسەلاتی ڕۆژئاوایی و مەعرفەو ئەدەبی ڕۆژئاوادا خۆی ڕایەڵ کردووە، بەمەش ئەو وێنەیە قلپ دەکاتەوە، کەوێنەی وەرگر و دەرۆزەکارێکی مەعریفەی ئەکادیمیە و تەنها کاری وەرگرتن و کۆپی ئیدیا بێت بۆ ڕۆشنبیرێك بەهەمان میتۆدە وە لە حاڵەتی سەرسامبوونەوە باز هەڵدەداتە بۆ ئەو بەر ، ئەوبەری بەرنگاربوونەوەی دیوی ناشرینی دەسەلات و مەعریفە.

-٢-

ئەو پەیوەندیە تێکچڕژاوە سەختەی نێوان دەسەلات و مەعریفە، بنەمایەکی تیۆری کارەکانی ئەو بوون، هەوڵدانی دۆزینەوەی کۆدەکانی دەسەلاتی کۆلۆنیالی بوو لە بیرکردنەوەی ئێمەی ڕۆژهەلاتیدا ، ئەو خۆتێخزانە پڕ زەبرەی کەبیری ڕۆژئاوا و وێنەکانی لە مەڕ ئێمەو بەدرێژایی زەمەنی مژدەبەرە مەسیحیەکانی ئەورووپا و پەمامنێرەکانیان لە کۆنەستی گشتی و کۆهۆشمەندی خۆرئاوادا بۆ ئێمەیان پێکهێناوە، بەئارەزووی خۆیان وێنەیەکیان لەمەڕ ئێمە پێشکەشی خۆرهەلاتیەك کردووە کە دوورە لە واقعەوە و تاودکو ئێستاش سەدە لەدوای سەدە ، ( بێگومان بەجەنگی دوایی دژی تیرۆیشەوە)، ئەو وێنەیە چەسپاوتر و وەحشیتر دەبن . وەحشیتر دەبن کاتێك بەتەواوی دەچنە نێو دەزگا و کەناڵەکانی یاساوە . ئیدی ڕۆژهەلاتی بەندی و کۆیلە و چەوساوەی ئەو وێنانەیە ، بەشێوەیەك کەخۆشی لەژێر ئەو کلێشەبەندیەی ڕۆژئاوا بۆی

نەخشاندووە ،خۆی کلێشەبەند دەکاتـەوە، هـەمان وێـنەی نەخشەبۆکێشـراو دووبـارە دەکاتەوە، خۆی بەرهەمێنەرەی هەمان وێنەی سەقەتە لە مەڕ خۆی.

کێ لەئێمە کۆمەڵێ پرسیاری مرۆڤێکی ڕۆژئاوایی نەبیستووە، بەوەی کـەئایا ژن لای ئێمە پەچە وحیجاب دەکەن؟ پیاوەکان چوار ژن دێـنن؟ .. ئەمانـەو زۆر پرسـیاری بێتامی دیکە بەردەوام خۆیان دووبارە دەکەنەوە،ئیـدی وەك ئـەوەی ڕۆژهـەڵات وڵاتی فەرشی باڵداری سیندباد بێـت و پڕ بێت لـە حەریمـەکانی هارونـە ڕەشید و ئـەو پیاوانەی گلۆپ دەخۆن و تـابەیانی دەتوانن بەسیحری دەرمانە پڕ جادووەکانیـان لـە گەڵ ئافرەتە پڕشەبەقیەکانی ڕۆژهەڵاتدا جووت بن. بەلای ئەوانەوە گرنگ نیە کەتۆ لەچ مەوقعیەتێکی زانسـتیدایت ، ئـەو وێـنەیەکی ڕەگـازۆکراوی هەیـە لەمـەڕ تـۆ، وێنەیەکە چەندەها سەدەیە پڕاوپڕی کۆنەستی خۆرئاوایی لێوڕێژ کردووە بە پێناسەی شێـواو لەمـەڕ تـۆی ڕۆژهـەڵاتی و نائـەوروپی، بـەلای زۆربەیانـەوە تـۆ کائینێـکی نامەدەنیقی و هەڵچویت، جۆرێکیت لە هارونەڕەشیدێکی و مێبازێـکی ناشارسـتانیت لـە ناختـدا حەشـارداوە، ئـەم وێـنانە لەچـاوەکاندا ، لەتەوقەکانـدا، لـە گفتووگـۆ ناڕاسـتۆخۆکاندا، لـە دواجاریشـدا لـە میـدیای خۆرئـاوادا بـە ئاشـکرا خۆیـان بەرهەمدێـننەوە. ئیـدی ئەووندەبەسـە تـۆ لـە کۆبونەوەیـەکی گشـتیدا بڵێـت هۆمۆسێکسواڵی نەخۆشیەکی دەروونی و عوسابیەو پابەندن بە تێکچوونێـك لـە ڕەوتی گەشەسەندنێکی سایکۆلۆژی و هتد.. ئەووندەبەسە مادامەکی ئەوقسانە لـە زاری تـۆی ڕۆژهەڵاتیەوە گوتراوە ، ئیـدی هـەموو ئـەم قسـانە کەلەگۆشـەنیگایەکی زانسیتەوە گوتـراوە، لە بیرکردنەوەی ڕۆژئـاوایەکەوە یەکسەر پابەند دەکرێت بـە کلتـوری تـۆوە ، بەڵام کامە کلتوور؟، بێگومان ئەو کلتوورەی کە خۆرهەڵاتناسە خۆرئاواییـەکان باسـیان لیوە کردووە، نەك ئەوەی کەهەیە. بێـگومان ئـەو بیرۆکـە ڕۆژهەڵاتناسـیە سـەقەتەی بەدرێژایی تەمەنیان لەگەڵیدا پەروەردەبوون، بەم شێوەیە هەموو مەبەستەکان ، هەموو بیرو ڕاکان لەو پێوانەکاریە وە دەپێورێت و تۆی ڕۆژهەڵاتیش لەو کەوانەیـەدا نەبێـت جێت نابێتەوە. ئەمانە بەشێکن لەو بیرکردنە پەنهانیەی کەئێدوارد سەعید لە پڕۆژەی ڕۆژهەڵاتناسیدا پەردەی لەسەر هەڵداوەتەوەوچۆتە نێو ووردەکاریەکانیەوە.

بەشێکی دیکە کەلە پرۆژەی فیکری ئێدوارد سەعیدەوە فێری دەبین ، دووبارەکردنەوەی ڕۆژهەلاتە بۆ وێنەکانی ڕۆژئاوا ز خۆرهەلاتناسان ، دووبارە بەرهەمێنانەوەی وێنە پێبەخشراوەکانی ڕۆژئاوایە ، بۆ نمونە وێنەی ئێمەی عاتیفی و ساکار و بێ یادەوەری و مێژوو ، وێنەی ئەو مرۆڤەی لە هەموو کەسێک دەبورێت و توانای یەکالاکردنەوەی ڕووداوەکانی نیە، وێنەی ئەو سەربازەی لەپشت ئینگلیز و کۆلۆنیالیستەوە دەڕواو گێلانە بەڕوویاندا پێدەکەنێ ، گەر هاتوو جنێویشی پێبدەن لای ئەو حیکمەتە!!. ئەو کائینەی کەخاوەنی مێژووی خۆی نیەو هەموو شتێکی ژیانی بەئاسانی وبە قەدەریەتەوە بەلادا تێپەڕ دەبێت.

دەتوانین لە سەعیدی بیرمەندەوە لەدیاردەی (خۆ بەکەمزانینە)ی بەنێو سیاسی و سەرکردەی ڕۆژهەلاتی تێبگەین ، کاتێك خواخوایەتی لەبەردەم ژووری کالوکرچترین سیاسی بیانیدا هەلقونە بکات و باوەشی پێدەبکات، لەجیاتی ئەوەی لایەنێکی گفتوگۆکار بێت لەسەر مەسەلەیەك مێژوویی، بەئاسانی لەمەوقعی گوێگرێك و بەندەیەکی زەمەنی مێجەرسۆن نەبێت هیچی دیکە بەخۆی ڕەوا نابینێت.

ئەو هەموو گوڵبارانکردنەی خرفێکی وەك گارنەر و دبلۆماسیەکی کۆنەشەیتانی وەك بریمەر، لەپشتیەوە زۆر کۆدی مەترسیداری ئاوەهای لەپشتەوە وەستابوو کەئێدوارد سەعید لە نوسینەکانیدا ئاماژەی بۆ دەکات. ئەو گوڵبارانکردنەی پرۆفیسۆرەکانی زانکۆ و بەنێو هونەرمەندان نەك هەر هیچ سەنگ و قورسایەکی پێنەبەخشین لەبەردەم ئەمریکاییەکاندا، بەڵکو بەپێچەوانەوە بێ مێژوویی و بێ زاکیرەیی و سادەیی ئێمەی لەبەردەمیاندا قوڵکردەوە، لەهەموانیش سادەتر ئەو هونەرمەند و زانکۆیی و بەناو ڕۆشبیرانەبوون، ئەو سادەیی و نامێژووییانە لە هەڵسوکەوتیاندا ڕەنگی دەدایەوە، باشتر وابوو لە جیاتی ئەو گوڵبارانکردنە داوای ڕووبەڕووبونەوەیەکی کراوە بکرابایە، تێدا چەندەها پرسیار و وەلام و خالی گرنگی تێدا ڕوونبکرایەتەوە، دەکرا زۆر پرۆژەی لەو جۆرە بیری لێبکرایەتەوە،چ نەبێت باشتر بوو لە ڕێزکردنەی منداڵان لەبەردەم گارنەر و بریمەر !!.

لەئێدوارد سەعیدوتێزەکانی لەسەر ڕۆژهەلاتناسی و ئورێنتالیزم زۆر کۆدی ئاوەها مەترسیدار ئاشکرا دەکەین . زۆر کۆدی ئاوەها کەڕۆژانە بەرپەرددمانـدا

تێپەڕیوون و دەرکمان پێنەکردووە، سەعید ئەو پیاوەیە چۆن ئێمە بەدەست سەرکردەی کوردی و ئەقڵی سیاسی کوردیەوە ئازار دەکێشین، ئەویش ئاوەها بەدەست یاسر عەرەفات و پێکەنینە و ماستاوچیەکانی لە ئۆسلۆ و خۆ بەکەم زانین و سادەیی وبێ یادەوەری ئەو دەست و تاقمەکەیەوە ئازار دەکێشێت، لە چاوپێکەوتنێکدا سەرنجی هەمووان بۆ ئەوە ڕادەکێشێت کە سادەیی وخۆش باوەڕی و گەندەڵی ئەو سەکردانە لە ئاستێکدایە، کە زۆربەی ئەوانەی ئیمزایان لەسەر ڕێکەوتنامەی ئۆسلۆ کردووە ئەوەندە زمانی ئینگلیزیان باش نەبووە کە لە ئاستی خوێندنەوەیەکی ساکاری ئەو ڕێکەوتنامەیەدا بوو بێت!!. ئەوانەی ئیمزایان لەسەر ئاشتیەك کرد مەرجی سەرەکی خۆلەبیرکردن و خۆ سڕینەوەی ناسنامە، مەرجی یەکەم و جەوهەری ئەو ئاشتیە بوو.

بەم شێوەیە لە هەموو سوچێکی ئەم ڕۆژهەلاتە ئەو وێنانە خۆیان بەرهەمدێننەوە . وێنەی (ئەوی دیکە/ ڕۆژئاوا) کەچەندەها سەدەیە چیرۆکی تۆ بەوشێوەیە دەگێڕێتەوە کەخۆی دەیەوێت ، درۆیەك بۆ دەکات کە ئیدی دۆرلێکراو بڕوای پێدەکات و خۆیشی دەبیت بە شێك لەو . لێرەوە ئێدوارد سەعید گرنگی دەدات بە گێڕانەوەی چیرۆکەکان و دووبارە گێڕانەوەی بەو شێوەیەی کەخۆی هەیە نەك بەو شێوەیەی ئەویدیکەی خۆرئاوایی گێڕاویەتەوە، پڕۆژەی ئەو قلپکردنەوەی هەموو ئەو کورسیانە بوون کە چەندەها سەدەیە ڕیزکراون، بە پلەی یەکەم کاری ئەو قلپکردنەوەی ئەو کورسیە ناشرینانەبوو کەهەموو یەکێك لەنیمە ئەگەری دانیشتنمان لەسەری ، ئەگەرێکی نێزیکە، لەوانەشە بەخۆمان نەزانیبێت و چەندەها ساڵە لەسەری دانیشتبێتین. سەعید ئەو فەیلەسوفەیە کە لەو کالفامیە و سەرسامیە دەرۆزەکارانەیە وەئاگامان دێنێتەوە.

—٤—

چیرۆك و چۆنێتی گێڕانەوەی چیرۆکەکان بەشێکی گرنگی کاری چەند ساڵەی ئێدوارد سەعید بووە، چۆنێتی گێڕانەوەی چیرۆکەکان و خۆشەرعیکردن و ڕەوابەندیکردنی خۆ لە ڕێگەی ئەو چیرۆکانەوە بەشێکی دیکەی پڕۆژەی ئۆرێنتالیست و لە دوایشدا بەشێکی دیکەی چیرۆکی کۆلۆنیالی بووە، لەزەمەنی ئێمەشدا ئیمپریالیەت بەهەمان شێوە چیرۆکەکانی خۆی دەگێڕێتەوە و دووبارە بەرهەمی دەهێنێتەوە، ئەم

پرۆسەی دووبارە کردنەوەی چیرۆکەکان و بەرهەمهێنانەوەی بەدرێژایی زەمەن هاوشانی پرۆسەی داگیرکردن و تالانی و کوشتن و برین بووە، لە ئیسرائیلەوە بیگرە تاوەکو ئەمریکاییەکان لە هەموو کونجێکی دنیا، تاوەکو رژێمی ئاپارتید و و رژێمی بەعس و ئەتاتورکیەکان و مەلاکانی سیاسەت . هەموو یەکێك لەم سوستێمانە خەریکی [گێڕانەوە] ی چیرۆکی خۆیەتی ، لە پاڵ داگیرکردنەوە بەوەخەریکە خۆی بکاتە ئەفسانەیەك کە هەموو چیرۆکەکانی ئێمە دواویستگەیی بکات و هەمووان لە وێستگەی ئەو و لەسێبەری ئەودا بتوانین چیرۆکی خۆمان بگێڕینەوە.

پرۆژەی ئۆرێنتالیستی لە بنەچەوە مێژووی [گێڕانەوە- السرد]ی ئەو چیرۆکانەن لەمەڕ ئەو ولاتانەی کە خەڵکی ڕۆژئاوا نەیانبینووە وشارەزای نین، پرۆژەی ئۆرێنتالیستی گواستنەوە و گەیاندیکی شێواوی ئەو چیرۆکانەیە دەربارەی (ئەوی دیکە/ الاخر)ی موسوڵمان، هیندۆس ، ئاسیاوی ، ئەفریقایی ، بەجۆرێك سەدەلەدوای سەدە لەزەمەنی موبەشیرە مەسیحیەکانەوە تاوەکو ئێستا کەڵەکەبوونێکی سەیری لەخۆ گرتووە، چەندەها کلێشەی ئاوەهای پێکهێناوە کە ئۆتۆماتیکی و بەشێوەیەکی نەستی کلێشەیەکی بیرکردنەوەی ڕۆژئاوای لەمەڕ ڕۆژهەلات پێکهێناوە . بەشێکی گەورەی ئەم پرۆسێسەلەڕێگەی کردەی گێڕانەوە خۆی بنیاکردووە، گێڕانەوە لە شێوەی کتێبی سەفەر و کۆکردنەوەی ئەرشیفی میللەتانی غەیرە مەسیح و ئەوروپییەوە تاوەکو نوسینی کتێب لەسەر جۆری هەڵسوکەوتی ئەو بونەوەرە نامۆیەی بەجیهان کەناوی ڕۆژهەلاتیە، ئەو چیرۆکانەی کە لە شێوەی مێژوو نوسراوە و کتێبی قەبەی خوونەریتی ڕۆژهەلاتی و جوگرافیاو سامانی سروشتیەوە نوسراون ، ئەمانە پابەند بوون بە لێکۆڵینەوەی هەمەجۆر و بیروڕای نوسەری ڕۆژئاوایی دەربارەی ڕۆژهەلاتی .

کردەی گێڕانەوە میتۆدی سەرەکی دروستکردنی بنیاکردنەوەی ڕۆژهەلاتە لەکۆ هۆشمەندی خۆرئاوادا، ئەمەش بودجە دانانی ملیارەها دۆلارو پاوەنی پێوویست بووە بۆ کردنەوەی پەیمانگای لێکۆڵینەوەو سێنەری ئەرشیفی و بەشی تایبەت لە وەزارەتەکانی دەرەوەیان تاوەکو دەگاتە کردنەوەی بەشی تایبەتی ڕاوێژ لە نێو جەرگەی سوپادا بۆ زیاتر شارەزا بوون لەو بونەوەرە ناشارستیانەی کە پێویستە [حوکمبکرێن نەك حوکمی خۆیان بکەن].

—٥—

گێڕانەوەی چیرۆکەکان لە تێکستی گەشتیاری سەدەی ناوەڕاستەوە بیگرە تاوەکو لێکۆڵینەوەی ئەنترۆپۆلۆژستێک و ڕۆژهەڵاتناسێک . ڕاخاودراوە بە هێزێک لە گێڕانەوە و چەمکی ( گێڕانەوە/ گێڕانەوەخوازی ) چەمکێکی گرنگەو یەکەیەکی میتۆدی ئیدوارد سەعیدە لە توێژینەوەو قوڵبوونەوەی لە پرۆژەی ڕۆژهەڵاتناسی و ڕەهەندە جۆراوجۆرەکانی . سەعید هەرتەنها بەمەشەوە نەودەوەستا ئەو کەڵەکەبوونەی گێڕانەوە شیتەڵبکاتەوە بۆ سەر بنەما سەرەکیەکانی وورووتیان بکاتەوە لە مانا دیارەکانیان ، بەڵکو دەچووە ئەو دیوو مەبەستی گوتراوی تێکستی ڕۆژهەڵاتناسیەوەو نەبینراو و نەگوتراوی دەهێنایە ئاخافتن، گێڕانەوەی ئەسڵی و مەبەستی شاراوەی ئەو تێکستانەی ئاشکرا دەکرد کەلە پشت ووشەی بریقەدار و تایتڵی زانستی زانستگاکاندا خۆی حەشار دابوو، ئەو بەهەمان شێوەش لە دیدی ڕۆژهەڵاتناسیەوە ڕەخنەی توندی ئاراستەی جیهانی ڕۆژهەڵات دەگرت، هیچ شتێک لای ئیدوارد سەعیدی بیرمەند بێگرنگی و بێکۆد نەبووە، هیچ شتێکیش بەدەر نەبووە لەو گێڕانەوانەی سەرجەم دەمووچاوی سیاسی و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەکانی مرۆڤایەتی، کەخۆی بەدرێژایی چەندەها سەدە پێکهێناوەو لەهەمانکاتیشدا خۆیشی خۆی شێواندووە .

—٦—

لەم گۆشەنیگایەوە سەعید باس لەئەدەب دەکات ، بەتایبەت هونەری ڕۆمان، وەك باڵاترین پلەی گێڕانەوە، لەئەدەبدا بیروڕاکان تێدا یاری خۆیان دەکەن، ڕۆمان بەریەکەوتنی چرکە ساتی یادەوەری مێژووییە بە خەیاڵ و یۆتۆبیای کەسی نوسەر. لەئەدەبەوە گرنگی گێڕانەوە، وەك ساتێکی مێژوویی نوسین و بەریەکەوتنی لەگەڵ خەیاڵدا کە پڕێتی لە وەهم و مەزەندەگەرایی (تەسەورات)ی جۆراو جۆر. پڕێتی لە مێژووی کەسی و پارچەبەجێماوەکانی ڕابوردوو، پەرچەکردارەکانی ئێستاو ساتەکانی ڕق و هەستەشاراوەکان. لێرەوە ئەدەبی گێڕانەوە، کەلەچیرۆك و ڕۆماندا زیاتر خۆیان بەرجەستە دەکەن، گرنگیەکی سێنتراڵی هەیە لە چەقی بیرکردنەوەی ئیدوارد سەعید لە تێگەیشتنی نێوان ئەو پەیوەندیە سەختە وئاڵۆزەی نێوان مەعرفە و دەسەڵات. نەۆ پەیوەندیەی نێوان ئیمپریالیەت و ئەدەب ، ئیمپیریالیەت و ڕۆشنبیری .

-٧-

ئیمپریالیزم لای ئیدوارد سەعید پرۆژەیەکی بەردەوامی گێڕانەوەیە،کە بەردەوام هەوڵدەدات ئەفسانەی خۆی بکاتە چەقی جیهان و ئەوانی دیکەش لە پەراوێزی گێڕانەوەی ئەودا بەرهەمهێنەوەی ئەوبن، بەم شێوەیەی ئیمپیریالیزم تەنها پرۆسەیەکی داگیر کردنی سەربازی زەوی وولاتانی دیکە نیە. تەنها گەشەسەندنێکی بالای سەرمایە نیە، بەڵکو پرۆژەیەکی بەردەوامی نەپچڕاوی بەرهەمهێنانی گێڕانەوە و بەرهەمهێنانی ئەفسانەیی خۆیەتی ، پرۆژەیەکی داگیرکردنی بیری ئازادە لەوەی وەك خۆی بیربکاتەوە ، بەمەش ئیمپریالیەت دژی نۆیترالیەت و سروشتگەرایی جیهانە. گرنگترین خاڵیش لای سەعید ئەوەیە کە ئیمپریالیەت لە فینۆمینێکی تایبەت بە دەسەلاتێکی عەسکەری و سیاسیەوە دەگوازێتەوە بۆ نێو ئەدەب و مێژوویی تێکستە مێژوویی و زانستیەکان، ئەو بێلایەنی لەهەموو ئەو تێکستانە دادەماڵێ کەتاوەکو ئێستا لە ژێر پەردەی هونەر وئەدەب و زانستدا پرۆژەیەکی مەترسیداری ئیمپریالیەت بوون لە نێو مەعرەفەدا، ئیدی بەشێکی گرنگیش لە ئەدەب و زانستیش بەرهەمهێنەوەی ئیمپریالیەتن و نیەتی ڕاستەقینەیی خۆیان لە شیتەڵکردنەوەکانی سەعیدا ئاشکرادەکەن، ئیدی جارێکی دیکە دەسەلات نەك هەر لەدەرەوەی مەعریفە نیە و ڕێگرنیە لەبەردەمی مەعریفەدا، بەڵکو خۆی بەرهەمهێنی مەعریفەیەکی دیاریکراوە بەخۆی .

-٨-

ئەوەی کەدەمەوێت لە دواخاڵدا لەسەر ئێدوارد سەعیدی بیریار باسی بکەم ئەوەیە ، کەزەمەنی ئیمپیریالیەت تەنها زەمەنێکی تایبەت نەبووە و بەسەرچووە، بەڵکو زەمەنێکە درێژە بەخۆی دەدا، کلتورێکی تایبەتی بۆ خۆی پێکهێناوەو لەڕێگەی دەزگاکانی بلاوکردنەوەو پرۆفیسۆرەکانی زانکۆ و ڕۆژنامە و میدیاکانەوە درێژە خۆی نوێدەکاتەوە، پرۆسێسێکە بەردەوامیەکی ترسناکی هەیە ، وەحشێکە لەهەموو کون وکەلەبەرێکدا پەلامارت دەدات. ئەو وەهمەی لای ئێمەی کورد لەدوای ڕاپەڕین دروست بوو ، بەوەی سەردەمی ئیمپریالزم بەسەرچووەو ئێستا شنەبایەکی دیموکراسی و ئاشتی لەدنیادا هەڵیکردووە!!، وەهمێك بوو سەرکردەی کوردی و ئەقڵی سیاسی کوردی بەهەموو هێزێکیەوە

دەیویست قەناعەتمان پێبکات، ئیدی ئیمپریالزم وەك پرۆژە شتێك بوو تایبەت بوو بەزەمەنێکی بەسەرچوو، گوزەشت !!.

بەهەمان شێوەش کاتێك یاسرعەرەفات و فەتح ئیمزای ڕێکەوتنامەی ئۆسلۆیان کرد ، دەیانەویست قەناعەت بە فەلەستینییەکان بهێنن کەزەمەنی داگیرکاری و سیاسەتی ئیمپیریالی پشتگیریکردن لە ئیسرائیل کۆتایی پێهات، ئیدی لە شەو و ڕۆژێکدا ئەمریکا بوو بە ڕابەری ئاشتی و شارۆن و باراکیش بوون بە کۆترێکی بێتاوان.. دیارە ئێدوارد سەعید هیچ ڕێکەوتنێکی ئاشتی ڕەت نەکردۆتەوە، بەلام ئەوەی ئەو دژی وەستاوە ئەوە بووە، کاتێك خاوەن مافەکان وەك گوێگر دەچنە نێو گفتوگۆکانەوە، وەك تەلەبەیەکی ئاقلی جوجك ترسێنراوی بەئەدەب گوتار دەخوێننەوەو ئیمزا دەکەن لەسەر ڕێکەوتنامەکان. ئەو پێش بیست و پێنج سال زیاتر لەمەو بەر یەکێك بوو لەو کەسە دانسقانەی کەبڕوای بەوە هەبوو ڕژێمی ئاپارتید بە ڕێکەوتنامەی ئاشتی توانای هەلوەشاندەوەی دەبێت، دەکرێت [ڕابوردوو کاری تێدابکرێت] و هەلبەوەشێنرێتەوەو پێکەوە ئەفریقایی و کۆچبەرەکان ژیانێکی نوێ دەستپێبکەوە، بەلام بێگومان بەیەکلاکردنەوەی ڕابوردوو نەبێت ئەوە ڕوونادات، ناکرێت ئەوەندەسادەبین و بلێن ئەوەی ڕوویدا ڕۆیشت و بابەردەکی بخەینە سەر و ئێمە کوری ئەمڕۆین، لای ئیدوارد سەعید ئەو پاشەڕۆژە پڕئاشتیە مەحالە بێ یەکلاکردنەوەی ڕابووردوو پێکبێت و مەشروعیەتی خۆی وەرگرێت و سەرکەوێت.

--٩--

گەر بەنێو سیاسی کوردی ( بەوانەشی کەئیدیعای ڕۆشنبیربوون دەکەن) تۆزێك، چ نەبێت کەمێك شارەزای کارەکانی بیریارێکی گەورەی وەك ئێدوارد سەعید بوونایە ، ئاوەها بە سادەیی و کالۆکرچیەوە نەماندەبینین لەبەردەم ئەمریکاییەکاندا گولبارانیان بکەن، دەبوونە تەرەفێکی مفاوەزکار نەك گوێڕایەل، چ نەبێت ئەو کەسە لاوازانە نابن کەبێ مێژووی خۆیان ئاوەها ئیعلان بکەن ، وەك ئەوەی ئەمڕۆ دەیبینین، بەجۆرێك لاواز کەحەوزەویەك ئازایانەتر خۆی دەکاتە تەرەفێکی مفاوەزکار وەك لە سەرکردەیەکی کورد کە سەدەیەك خوێنی لەدووی خۆی جێهێشتووە.. گەر برێکی کەم شارەزا بووونایە لە نوشستی ئۆسلۆ و گەمەی ئیسلامی فوندەمێنتال و یاریان لەسەر گۆڕەپانی سیاسی فەلەستینی و تیزەکانی ئێدوارد سەعیدیان بەگرنگیەوە لەو

بارەیەوە بخوێندایەتەوە، ئەو فیگورە لاوازەمان نەدەبینی کەبەبێ پڕۆژە خۆی دەکات بەعیراقیەك کەنەك هەر بەدرێژایی مێژوو بوونی نەبووە، بەڵکو خۆشی هیچ تەسەورێکی نیە بۆی !!. ئەمە هەمان کێشەی عەرەفاتە کەهیچ تەسەورێکی نیە کە فەلەستینی داهاتوو بەو شێوەیەی ئەو داوای دەکات لە چوارچێوەی غەزەو ئەریحادا چۆن هاوڵاتیەکی فەلەستینی لێدەدەرچێت؟،یاخود چ جۆرە ئیسرائیلەیەك؟! ..

ئیمپریالیەت پڕۆژەیەکی بەردەوامە، ماشینێکە لەوەتەی هەڵبووە تاوەکو ئێستاش نەکوژاوەتەوەو بەردەوامیشە لە تازەکردنەوەی خۆی، داگیرکردنی ئێراق و پشتگیرکردنی لەژێرەوەی مەلاکانی باشوور و هێزە کۆنزەرفاتیفەکانی ئێراق بە حیزبە کوردیەکانیشەوە، بەشێکی ئەو پیلانانەن ، کاتی خۆی لەبیستەکاندا پیادەیان کردووە، ئەو زەمەنە کۆلۆنیالیست پێی شەرم بوو بڵێت ئێمە داگیرکەرین ، بەلام ئێستا بەئاشکراو بێشەرمانە هاوار دەکات و یاسایەکی نێو دەوڵەتش هەیە کە داگیرکردن وەك (ماربەجاش) ی لای خۆمان ڕەوابەندی دەکات، ئەم دژ وەستانەوەی سەعید لەدژی جەنگی دوایی لەو پرنسیبە سادەیەوە نەهاتووە کەئەم پیاوە عەرەبێکی شۆفێنیە یاوەکو شۆفێنیەکی شاراوە هەیە لە بیروڕاکانیدا و لایەنگری سەدام حوسێن بووە، ئەوانەی ئەو مەزەندەی ئەوەدە دەکەن، ئەوانەن کە تێزەکانی ئێدوارد سەعید لەیەك ڕوانگەی ناسیونالستی تەسکەوە دەخوێننەوە، ئەوانەن لەو سوستێمە ڕەهەند جیاوازەی ئێدوارد سەعید تێنەگەیشتوون، کەلەپشتیەوە ئیمپریالزم وەك پڕۆژەیەکی بەردەوامی دژ بە بەختەوەری مرۆڤایەتی تێدەگا، نەك وەك چەند نەخوێندەوارێك مەزندەی دەکەن کەگوایە ئیمپریالیزم کۆتایی هاتووە ، بەڵکو بەردەوام لەرێگەی دەزگاکانیەوە دەموچاوی خۆی دەگۆڕێ، ئیدی چ لەژێر ناوی گلۆبالیەت بێت یاخود لەژێر ناوی ئاشتی جیهانی یاخود دژە تیرۆر بێت، ئیمپیریالزم مەکینەیەکی بەرهەمهێنەری تیرۆرە بەهەموو جۆرەکانیەوە، لە سەروو هەموو شیانەوە تیرۆری فیکری ،کەلە پرۆژەی ئیستشراقەوە ڕەگەکانی خۆی ڕاکێشاوە.

—١٠—

نمونەیەکی زیندوو لەسەر دووبارەکردنەوەی خۆرهەلات بۆ وێنەکانی ئیمپریالزم لەنێو کلتووری خۆیدا ، نمونەی بەرگریکردنێکی کوێرانەی هەموو تێزێکی

ۆرئاوایــه ، بــەبێ گوێــدانه هــەموو هەستێــکی بــەراوردکاری لەشــیتەڵکردنەوەی
وداوەکان.

نمونەی ئەم تەسەوورە سادەیە ،بەئاشکرا لە پاشکۆی ئـەدەبی کوردســتانی نوێــی
۳٠ دا هاتووە، کەلەیادی کۆچی دوایی ئێدوارد سەعیدا ئەو هەڵوێستەی دژ بەجــەنگی
ەدەکات بەعەبیە، لە و چەند دێـڕەدا هــاتووە [ ماوەتــەوە بڵێـن لەجــەنگی ئــازادی
ێراقدا ئیدوارد سەعید دژی ئەو جەنگەبوو، ڕونــاکبیرە ئێــراقیەکان زۆریــان هەوڵــدا
،ئەو هەڵویستەی بگۆڕێت، بەڵام ئەوە قەناعەتی بوو تاکۆتایی ... هەرچۆنێـك بــوو
ێت لە پێگەی زانستی ئەو ڕووناکبیرە کەمناکاتەوە..]، ئەم چەند دێڕە گەر بە تەواوی
ۆشمەندیــەوە نوسرابێــت ، یــاخود کۆپیــەکی خراپــی خوێــندنەوەی چــەند ووردە
ِسێنێـکی ڕۆژنامــەیی بێــت لــە ســەر ئێــدوارد ســەعید ،یــاوەکو بیرێـکی تێــپەڕی
ژنامەنوسیکی ( بیگومان لەکەوانەیەکدا) هەفتانەمەیەکی ڕۆشنبیری بێت، ئەو کــۆدە
،ترسیدرانە دووبارە دەکاتەوە کە ســەعید بەدرێــژایی توێــژینەوەکانی باســی لێــوە
ردووە، یەکەمیان: کە پڕۆژەی ئیستشراق تەنها لەلایەن خۆرئاواوە بەرهەمناهێنرێت
،ڵکو لەلایەن خۆرهەڵاتیەکانیشەوە جاریکی دیکە بەر هــەم دەهێنرێــتەوە، بۆنمونــە
ِتەزایەکی وەك (جەنگی ئازادی عیراق ) لەلایەن ئەمریکاو نەتەوەیەکگرتووەکانــەوە
،ڕەسمی بوونی نیە!!، ئــەمریکا بەئاشــکرا هــاوار دەکــات و دەڵێــت مــن دەوڵەتێــکی
گیرکەرم و لێپسراوێــتی داگیرکــەرم هەیــە لەبەرامبەرتــان،بــەمانای داگیرکــردنم بــۆ
،بەستی خۆمە و ئەمە بۆ هەفتەنامەیەکی ڕۆشنبیری حیکمەتی قــوڵ و خوێــندنەوەی
وڵی فیکری ناوێت بۆ ئەوەی لێی تێبگات، ئیدی نازانم بۆ ئەمریکا دەبێــت ڕزگــارکــار
ێت و جەنگەکەشی جەنگی ئازادی بێت. دووهەم: وێناکردنەوەی وێنەکان و دنیا بینینە
،چاوی ئیستشراقیکەوە، لە پڕۆژەکانی دیکەیدا ئێدوارد سەعید زیــاتر ئــەم مانایــە
وڵدەکاتــەوە و مەبەســتی وێــناکردنەوەی وێــنەکانی ئیمپریالیــەت و کۆلۆنیالیەتــە
،لایــەن خــودی کۆلۆنیــالیزەکراو و داگیراوەکانــە. ئــەو دێــڕە ئەوەنــدە ناشــرینە
،هەوڵدەدات ســەعید بەشێــوەیەکی دیکــە وێنەکێــش بکــات کەدەڵێت کــەڕوناکبیرە
ێراقیەکان هەوڵیان داوە قەناعەت بە ئێدوارد سەعید بکەن بــەڵام ئــەو قەناعــەتی
،کردووە، ئەوەی ئەمە بخوێنێتەوەو شارەزای تێــزەکانی ســەعید نەبێت واتێــدەگات
ەعید لەحزبێك یاخود لەکوتلەیەك عاجزبووەو کۆمەڵێ کادێــر هــەوڵی ئــەوە دەدەن

هەڵوێستی بگۆڕێت بەلام کابرا کەللەڕەقەو قەیدی ناکات خۆنەو کەللەڕەقیەش بەسنگفراوانیەوە قبوڵدەکەین مادامەکی نازی هەیە بەسەرمانەوە!! ئایا ئەم وێنە شێواندنەی سەعید لەلایەن هەفتەنامەیەکی ڕۆشنبیریەوە شایەنی پێکەنین نیە!!، ئایا ئەمە بەرگریەکی بێسەروبن داگیرکەرێك نیە لەدژی فەیلەسوفێك، داگیرکەرێك کەبەئاشکرا دەڵێت من نەهاتووم ئازادتان کەم بەڵکو من داگیرکەرم.

جارێ دەبێت بزانین گەر شتی وەها ڕوویدابێت و خەڵك هەبووبێتن لەگەڵ ئێدوارد سەعیدا قسەیان کردبێت ، مەزەندەی ئەوە ناکەم ئەو بڕیارە گەورەیە ئەوەندە کالفامبێت و کەللەڕەقانە و کوێرانە دژی ئەو جەنگەبێت، دیارە کاتیگۆریەکانی بیرکردنەوەی ئێدوارد سەعید و ڕەهەندەکانی دژ بەئەمریکایی و پابەندکردنی بە پرۆژەی ئیستشراقیەت و ئیمپریالزم و کلتووەرەوە، چەند ژوورێکن بەچەندەها ڕاڕەویی ڕوناك و تەسك و فراوان پێکەوە گرێدراون، ئەمە جگە لەوە تەنها ئێدوارد سەعید نیە کە دژە ئەمریکایە ، بەڵکو چەندەها بیریاری گەورەی وەك نوام چۆمسکی و تاریق عەلی و بەشێکی گەورەی ڕۆشنبیرانی ئەورووپاو ڕۆژهەلات هەڵگری ئەو تێزەن و تێزبەندی خۆیان لەو بارەیەوە هەیە، کەئاسان نیە ئاوەها بەئاسانی وەلام بدرێنەوە. ئیدی کاتێك ستوون نووسێکی هەفتەنامەیەك هەموو ئەو مەبەستانەی سەعید قڵپ دەکاتەوەو لە چەند دێڕێکدا سادەی دەکاتەوە و بەئارەزووی خۆی ساناخوازی دەکات ، ئەوا دیسانەوە بێ ئەوەی بەخۆی بزانێت ،ئەو فیگورە ڕۆژهەلاتیەیە کەخۆی بەشێوەیەکی ئیستشراقیانە و ئیمپیریالزمانە بەرهەمدەهێنێتەوە ، کەتەسەور دەکات ئەمریکا فریشتیە بەمەرجێك خۆی دەڵێت من داگیرکەرم.

بەهەر حاڵ بێدەنگی سەعیدو هەڵوێستی سەعید لە زۆر زەمەنی ئاوەهادا ، هەڵوێستێکە چەندەها بوعدی خۆی هەیە و خۆزگەی منیش ئەوەبوو کە نەخۆشی ئاوەها پەلاماری نەدایە ، چ نەبێت تائەو کاتەی بەهێمنی لەسەر ئێمەی دەنووسی ، ئەوکاتە تەئکید بووم، بەهێمنی هەموو وەهمەکانی ئێمەی دەڕاوەنەوەو دیوێکی ترسناك و ناشرینی ئیمپریالیەتی لە ئێراقدا نیشان دەدایین کەئێمە ئێستا بەهۆی حەماس و چەوساندنەوەی چەند ساڵمان لەژێر هەڕەشەی جینۆسایدا نابیینین و ناشمانەوێت بیبینین، تەئکید بووم چەندەها ئاوێنەی جوانیشی بۆ ڕادەگرتین بۆ ئەوەی دیووی جوانی خۆمان ببینین و بەردەوام بەخۆمان بدەین وەك پرۆژەیەکی بەمرۆڤبوون، بۆ

ئەوەی پڕۆژەیەکمان هەبێت لەژیاندا ، پڕۆژەی گەڕانـەوە بـۆ خۆمـان، وەك مرۆڤێـکی ئازاد..

سڵاو هەزاران سڵاو لە ڕۆحی ئاسودەت...

---تەواو---

# کێن ئەوانەی سەردەبڕدرێن؟

١

ئەو پرسیارەی بەردەوام وەك چیرۆکنوسێك لەخۆمی دەکەم ، ئەوەیە کێن ئەوانەی لە گەرمەی ڕووداوەکاندا لەبیر دەکرێن و بەر دەست قاچی پیاوەکانی مێژوو دەکەون؟، ئەی کێن ئەوانەی کە لەژێر ناوی پیاو و ژنەکانی مێژوو خۆیان ڕیزبەند دەکەن؟، پەیوەندی ئەوانەی بەر دەست و قاچ دەکەون وووندەبن و گۆڕیان گومدەبێت چیە بەوانەی کەوەك فیگورێکی سێنترالی هەمیشە هەبوون لە نێو زمانی گێڕانەوەدا؟، چ فەیرانێکە لەپشت دیاردەی سەربڕینی جەستەیی و سەربڕینی ڕەمزی مرۆڤەکانەوە وەستاوە ؟!، لەکامە کەلێنی سەختی مێژوویدا مرۆڤەکان سەردەبڕدرێن و سەریان لەجەستەیان دەکرێتەوە؟..

ڕووداوەکانی ئەم دوایەی ئەو وڵاتەسەیرەی کەنێوی ئێراقی لێدەنێن و کەسیش خۆی بە هاوڵاتی ئەو وڵاتە نازانێت، ئەو پرسیارانەی سەرەوەی لەلا هاروژاندم ، بەتایبەت کاتێك لەکەناڵە عەرەبیەکانەوە وێنەی ئەو پیاوانەم دەبینی لەبەر قاچی تیرۆریستە دەموچاو بەستراوەکان بەزەلیلیەوە دانیشتبوون و بە ترس و چاوی بەزەیی داواکردنەوە سەیری کامێرا و لەوێشەوە سەیری تەماشاکاران دەکرد، ماوەیەکیشی نەدەبرد دڵم دادەخورپا کاتێك لەهەمان کەناڵەوە دەمبیست کەئەوانە سەربڕاون، هەستێکی سەیر دایدەدگرتم و ئێستاش هەمان هەست لێمجودانابێتەوە کەدوورە لەهەموو هەڵسانگاندنێکی سیاسی ، دوورە لەهەموو سەیرکردنێکی تەرازووی هێزەکان و کێشەی داگیرکردن و یەکلایکردنەوەی گرفتە مێژووییەکان، هەستێك دوور لەمانە هەمووی ، ئازارم دەدات . زۆرجاریش ناتوانم بیری لێنەکەمەوەو خەومدەزڕێنێت، هەستێك بە قێز هاتنەوە لە کردەی پیسی و قێزەوەری مرۆڤ!!، هەستێك بەوەی کەئێمە لە دنیایەکی بێ مۆراڵدا دەژین ، گەیشتۆتە ڕادەیەك کە باڵاترین هۆکاری کۆمۆنیکاتسیۆن ببێتە هۆکاری بڵاوکردنەوەی قێزەوەری و بۆگەنی .

ئەوانـەی کەلەسـەر لا پـەڕەکانی ئینتەرنێـت دەڤیژێـنن و وەك کاریلـەی تۆقیـوو لنگەفرتێنانە لەنێو خۆێنی خۆیاندا و کەس توانـای بەدەنگەهاتنـەوەیان نیـە. ئـەو هەستەم لا دەهاروژێنێت کە تیرۆر و دوژمنکـاری چیدی ئەوەنـدە دوور نیـە لێمانەوە، بەڵکو لەنێو ڕۆحی ئەم سەدەیەدا خۆی بەرهەمدەهێنێتەوە، گەر شێـوەکانی جەسـتەیش نەبن ، ئەوا چەندەها شێوازی دیکەی سەربڕین ئەنجامـدەدەن، بەشێـوەیەك کەئێـمەی سەربڕاو هەستنەکەین بەوەی لەنێو دنیایەکدا دەژیـن . بێسـ[illegible]کـەمی سەرکەوتنە لەژیاندا. هەر ئەو بێسەریە لـەو سـاتەویە،کە ئێـمە بەیـەك کلیککـردن دەتوانین چێژ لە بینی حەرام (تابۆ) ببینین!، ئەو شـتە ببیـنین کەنـەمانبینیوە، ئـەو تەماشاکردنە تێرکەین، کەناماقوڵ و نامرۆییـە لەگـەڵ مـۆراڵی مـرۆڤ و دژە مـۆراڵی مرۆییە، بەمانایەکی دیکە گەر ئێمە پەیوەندیشمان نەبێت بەوسـەربڕینانەوە . ئـەوا بەتەماشاکردنی دەبین بەیەکێك لەو کەسانەی کەبەشدار دەبین لەو سەربڕینە! ، هـەر وەك ئەوە وایە کەمن لەو ژوورەدا بم ئـەو کەسـانەی تێداسەردەبڕێـن کـە تیرۆریسـتە ئیسلامیەکان سەریان لەجەستەیان دەکەنەوەو لەبەردەم کامێـراکە هەڵیـدەبڕن! . مـن هەست بەتـاوان دەکەم چونکە زۆر جار ناتوانم کۆنترۆڵی خۆم بکەم کەسەیری نەکـەم، هەستکردن بـەتـاوانکردن تێـکەڵ بەهەسـتکردن لـە قێـزەوری دەبێـت لـەم دنیایـە . بەتایبەت کاتێك لامسەلایی هەندێك هەست پێدەکەین لەوانەی کەوامەزنـدە دەکـەن کەئیدی ئەم کۆمەڵگایانە هەر وابوون و هەر واش دەمێننەوەو ئـەوەش ڕۆتـینی ژیـانی داگیرکردنە وەکو چۆن هەندێك لە کۆلکەنوسەرە عەرەبەکان پۆزشی بۆ دەهێننەوە..

٢

لایەکی دیکەی مەسەلەکە ئەوەیە کێن ئەوانەی سەردەبڕدرێن؟!، ئایا دیك چینی و بۆش و ڕامسفێلدن !! یاخود کۆمەڵێك هەژارو بێدەرەتـانن کەبەدوای نـانی ڕۆژانەیان دەگەڕێن و شەو و ڕۆژ حەماڵی دەکەن و لۆری لێدەخوڕن و زەویەك نیە تێدا بحەوێنەوە جگە لەو ساتـانە نەبێت کەبۆچەند ڕۆژێك لەدوای چەند مـانگ و سـاڵی دەربـەردەری وغـەریبی مەنفاکـانی ئاندا، لەنێو ماڵ و منداڵی خۆیاندا دەحەوێنەوە، لەوێش ئەوەندە کێشەیان هەیە کەناتوانن بەو چەند ڕۆژەی لەوێبوونیان چارەسەری کـەن، چـارنیە دوای چـەند ڕۆژێك دەبێت جانتا شڕەکانیان وەپێچن و بگەڕێنەوە بـۆ کۆمپانیاکانیـان و دیسـانەوە

ڕاکردن بەدووی ئاندا وێڵی ئەملاوئەولایانـدە کـات و لـەدوا جاریشـدا لەبـەر قاچـی تیرۆریست وجەردەیەکی ئیسلامیست دەگیرسێنەوەو هەڕەشەی سـەربڕینیان لێدەکرێـت و لەدوا وێستگەی ژیانی هەندێك لەو هەژارانـە، لەسـەر لاپـەڕەی ئینتەرنێـتدا بـەدەم هاواری ئەلاهولئەکبەرەو قیژەی خۆیانەوە سەریان لەلەشیان دەکرێـتەو و ملیۆنـەها تەماشاکاری ئینتەرنێتیش سـەیرکارین و لەوانەشـە وێـنەی سـەربڕینەکە لای خۆیـان بپارێزن و و ببێتە نۆبێکتێکی تێرکردنی تەماشا و سەیرکردن..

ئەمە چ سیناریۆیەکی پیس وبۆگەنە کەئەم زۆرانبازیانەی دنیا بەرهەمی دەهێنێت و چ ئاستێکی نزمی مۆرالی مرۆڤایەتیە ، کامـە زۆرانبازیـە کـەمرۆڤ دەگەیەنێـتە ئاسـتی قەساب و سـەربڕوا و تەماشـاکار و سـەربڕاو ، ئـەوەی بەچاوێـکی ووردەوە بڕوانێـتە مەسەلەکان ، ئەو پرسیارە دەکـات کامەیـە پرسـیاری مـۆراڵ لەنێـو هـەناوی دنیـای مۆدێرنە و کامەیە ئەزمونی مۆدێرنە؟!!.

٣

فۆکـۆ سـەرەتای کتێـبی( سـزاو چاودێـری) بەوەسفێـکی ترسـناکی لـەتکردنی پیاوکوژێك و کافرێـکی دژ بەکڵێسـا بەچـوار لەتـەوە، دەستپێـدەکات. لەئیسلامیشـدا لەتوپەتکردنی سۆفی و شاعیری گەورە حەلاج و چەندانی وەکو ئـەو لاپـەڕەی مێـژووی ئاینەکان پڕکردۆتەوە، بەهەمان ڕەوتیش دنیای مۆدێرنە و پێشـکەوتنی تەکنـەلۆژیا چەندەها کارەساتی لەو جۆرەی لەشێوەی بۆمبی هێشـوویی ونابـاڵم وچـەکی کیمیـاوی کۆمەڵکوژی بەرهەمهێنـاوە. ئیدی بیروڕاو جیدالی ئاینی وفەلسەفی لە لایەکن و مێـژووی ڕیالیستی سەر زەوی ڕووداوەکان لەلایەکی دیکـەن، لەنێـوان ئـەم دوودنیایـە کەلێـنی گەورە و ترسناك هەیە ، ڕۆژ بەڕۆژ ئەو کەلێنە گەورەتر و فروانتر و ترسناکتر دەبێت.

کوشتن لە نێو ئەم کەلێنانەوە سەردەردەدێنێت ، لەکەلێنی نێوان دنیای بیروڕاکـان و دنیـای واقعیـدا ، کوشـتن فینومێنێـکە ،دیاردەیەکـە، کەلێـن و دژە کاریـەکانی خوێندنەوەو تەفسیری نێوان دنیای بیروڕاکان و دنیـای مامەڵـەی ڕیالیسـتی پێـکەوە گرێدەدات ، ئەو خوێنەی دەڕژێت و ئەوەی سەردەبڕدرێت شەڕی ئەو کەلێنانەن کـەمۆراڵ و بەهاگشتیەکانیان تێدابەتاڵبۆتەوە، لەو بۆشاییە مۆراڵیەی بیروڕاکاندا ، مرۆڤەکان سەردەبڕدرێن و خوێنینان حەڵاڵ دەکرێت.

کاتێك نیولیبرالیزم دەبێتە تاکڕەهەندیەکی هیمۆگینالیتێتی و دەسەلاتخوازی یەك دەوڵەتی و بەنێوی مافی مرۆڤەوە تانك و زرێپۆش و ڕاکێتی زیرەك و هەلیکۆپتەری ئەباشی و کیشوەربڕ دەکات و پەلاماری ڕژێمێك دەدات کەخۆی بۆ ماوەی سی و پێنج ساڵی ڕەبەق پشتگیری ئێکردووە، سی و پێنج ساڵی ڕەبەقە چاوی لێپۆشیوە، بەلام لە پڕێکدا لەشێوەی ڕزگاکارو بەدیهێنەری دیموکراسی شەرعیەتێك دەدا بەخۆی و ڕژێمێك دەڕوخێنێت کەخۆی پێکیهێناوە، سوپایەك چەك دەکات کەخۆی چەکی کوشندەی داوەتێ و وەك سەگی هار بەریداوەتە گەلان و میللەتان بۆ ئەوەی ئازادیان لێ زەوتبکرێت، ژەهری داوەتێ بۆ ئەوەی بەهەزاران مرۆڤ و گوڵ و گیانەوەر و مێروو ژینگە لەچەند چرکەیەکدا لەناوببات، لەوساتەوەختەدا زۆر کەلێنی گەورە لەدنیای ئێستادا کەبەهاوچەرخ ناسراوە، حەیاچوونەکانی خۆیان ئاشکرا دەکەن. ئەمە لەکاتێکدایە کەمافی مرۆڤ دەبێتە حونجەتێك بۆ بەجێهێنانی (سوستێمی تازەی جیهان) ، هەستدەکەین کەلێن و قەیرانەکانی مۆدێرنە و دنیای مۆدێرنە ئەو فینۆمینە ترسناکەی خوڵقاندووە کە هەموو دووبارە ـ کۆلۆنیالیزەکردنێکی(ڕیکۆلۆنیالیزەکردن) دنیا دەموچاوی دیار و ئاشکرایەتی، لە وکەلێنەوە مرۆڤەکان، ئەو سەربازانەی لەمبەر وئەوبەری جەنگەکاندا دەکوژرێن ، ئەوانەشی بەر هێرشی سەربڕین دەکەون ، هەمووان باجی ئەو ناتێگەیشتنە دەدەن کەلەنێو هەناوی مۆدێرنەوە سەرهەڵداوە ، ئەمە دەتوانرێت بەقەیرانێکی مێژوویی دیکەی مۆدێرنە لەقەڵەمبدرێت .

پێدەچێت پرسیاری مۆراڵ تاکە پرسیاری دواخراو بێت بۆ کاتێکی نادیار ، کاتێك مرۆڤی هاوچەرخ مامەڵە لەگەڵ دنیای دەرەوەیدا دەکات ، تاکە پرسیار بێت کەناکرێت و گەر بشکرێت ئەوا دوادەخرێت بۆدوای پراکتیزەکردنی پیلانەکان! ، هەمیشە پرسیاری مۆراڵ لەدوای مامەڵەوە کراوە ، هەمیشە لەدوای ئەوەی تفەنگ داهێنرا مرۆڤ گووتویەتی بۆچی ئەم تفەنگەم دروستکرد!، کە زرێپۆش بەو ترسناکیەوە داهێنرا و ماڵەکان وێران بوون و شارەکان باشتر لەڕێگەی چەکەکانەوە خاپور کران، زاناکان وداهێنەران گووتیان بۆچی ئەوەمان کرد!! ،هەندێکیشیان ئەو پرسیارەیان نەکرد و قازانجی داهێنەنەکانیان کرد بەخەلات بۆ ئەدەب و جوانی !!، و هەندێکیشیان دوور

لەهەموو پرسیارێك لە سالۆنی ئۆرستۆکراتیەتی ئەوروپی و ئەمریکادا شەرابیان دەخواردەوەو باسیان لە جیهانێکی ئاسودە دەکرد.

پرسیاری مۆراڵ لەنێو هەناوی زانست و ئایدۆلۆژیای سیاسی و بیروڕاو کاندا کاتێك لەڕێگەی مامەڵەوە پراکتیزەدەبن ، پرسیارێکی ونبووە و بەدوای ڕووبەرێکدا دەگەڕێت کەهەگیز نایدۆزێتەوە. پرسیاری مۆراڵ لەچوارچێوەی مامەڵەی مرۆڤدا لەگەڵ دنیای دەرەوەیدا پرسیارێکی دواخراو و شەرمنە، باجەکەی ئەوانە دەیدەن کە لەسەر لاپەڕەی ئینتەرنێتەکاندا سەردەبڕێن و لەبەرەی شەڕی نیو کۆنزەرڤاتیڤیسمەکاندا(موحافزکارە نوێیەکان) دەکەون و لەناو دەچن ، ئەوانە باجی دەدەن کە بۆمبی زیرەکی دنیای پۆست مۆدێرنەیان بەسەردا دەتەقێتەوە .

مۆراڵ و ئەخلاقێکی مرۆڤانە چەندە لەفەلسەفەدا زیندووە، ئەوەندە لەمامەڵەدا پشتگوێخراوە، ئەو کەلێنەی لەنێوان بیروڕاکان و کردەکاندا بەدرێژایی مێژوو خۆی درێژکردۆتەوە، باجەکەی ئەوانە دەیدەن سەردەبڕدرێن و دەکوژرێن.

٥

یورگن هابرماز پێیوایە کە پرۆێکتی ڕۆشنگەری هەوڵدانێکی بەردەوام بوو بۆ بە [شێوەبازکردنێکی ئەقلانی مامەڵەی ژیان)[1] ، ئەوەشی لەو ڕستەیەوە تێیدەگەین، ئەوەیە کە لەسەدەی هەژدەوە مۆدێرنە لەڕەوتی پێشکەوتنیدا هەوڵدانێك بووە لەڕێگەی زانست و هونەرەوە بۆ کۆنترۆلکردنی هەموو (هێزە سروشتیەکان) ، ئەوەشی هێزی سروشتیە، هەموو کردارێکی مرۆڤە لە پەیوەندی و بەریەکەوتنیدا لەگەڵ جیهانی خۆی ، مامەڵەی مرۆڤە لە گەڵ خۆی و سروشت و پەیوەندیەکانی . مۆدێرنە هەوڵدانێك بوو بۆ بەئەقڵانیکردنیکردنی فۆرمی ژیان و کۆنترۆلکردنی هەموو کەلەبەرە سەختەکانی پێشکەوتنی مرۆڤایەتی، ڕۆشنگەران و سەدەی ڕۆشنگەری ئەو هیوا و ئاواتەیان لەئاسۆ هەڵهێنا، کە دادوەری و جوانی و یەکسانی ، شان بەشانی پێشکەوتنی تەکنەلۆژی و ماتریاڵی بەهێڵێکی یەکسان ڕێگەی خۆی ببڕێت، هەر ئەوەندەش نا ، بەڵکو لەهەوڵداندایە بۆ کۆنترۆلکردنی هەموو بوارەکانی کۆمەڵگە.

نابێت ئەوەمان لەبیر بچێت کەمۆدێرنە پابەستە بە تێزێکی زانستی و تەکنەلۆژی و لەدوا جاردا هەمووی دەچێتە خانەی (بەرژەوەندیخوازیەوە) ، ئادۆرنۆ لەژێر ناونیشانی(ماتماتیکردنی دنیا)دا تێزەبەندی خۆی کردووە ،ئەویش کردنی دنیایە بەفابریکێکی گەورەو کردنی مرۆڤ بەو ژمارە و نوسروانەی لەسەر کارتی بانق و کۆمپانیاو

لیستی حکوماتەکاندا لەنێوان بەکەڵك و بێکەڵکدا دابەشدەکرێن.(بۆنمونە ئەوروپا ئێستاکێ دەیەوێت لەجیاتی پەناهەندەوەرگرتن، کۆچکردنی ڕەسمی بخەنەگەڕ، ئەمەش مانای ئەوەیە ئەوانە وەردەگیرێن کەخاوەن بەهرە و توانا و بڕوانامەی تایبەتن و ئەوانی دیکەش بێبەش دەکرێن. پۆلێنکردنی مرۆڤەکان بەپێی سودمەندیان سیاسەتی کۆچە و لەژێرناوی گونجاندن و تێکەڵبوون وپێکەوەژیان پەناهەندە و مافی پەناهەندەیی بۆ مرۆڤەکانی دیکە کارێکی گران دەبێت ). پۆلێن کردنی مرۆڤ لەخودی خۆیدا بەرهەمی ئەقلانیەتێکی بێبەزەیە، کەبەبێ ئەوەش هیچ پێشکەوتنێکی تەکنەلۆژی وزانستی ڕوونادات، مرۆڤەکان لەنێو نەخشەسازی و کۆمپیوتەرەکاندا تەواوی لۆژیکی ژیانیان دەپێورێت و دابەش دەکرێن و لێیدەردەکرێن و تواناکانیان وەگەڕ دەخرێن. ئەوەی هیومانی و مرۆڤانەیە، ئەوەی مۆراڵیکی مرۆڤانەیە . ئەوەی ڕۆحە و ڕۆحزەدیەکانی مرۆڤە. ئەوەی کەنێوی فاکتۆری مرۆڤانەیە لەو هاوکێشەیەدا جێگەی نابێتەوە.

ئەقلیەتی ماتماتیکی ئەوەندە زیرەکە کەحەزنەکات هیچ شتێك هەبێت لەدەرەوەی هاوکێشەی ئەودا بێت، هەر بۆیە بۆ مەسەلە هیومانیەکانیش چەندەها فۆرمی ڕووکەش دەدۆزێتەوە. ئەقلی ماتماتیکی (ئەقلانیەتێکی ترسناکە) بەتەعبیری هابرماز ، ئەقلانیەتێکە، دووبارەکۆلۆنیالیزەکردنەوە و وێرانکرد ن و تێکدانی پرۆدێکتەکانی خۆی لە نێو سوستێمە شمولیەکاندا دەکاتە کارێکی هیومانی!! ، ئەقلیەتی ئاوەها ترسناك دەیەوێت ئێمە مامەڵە لەگەڵ دەرئەنجامەکاندا بکەین بەبێ گەڕانەوە بۆ هۆکارە دوورەکانی.

هەر ئەو ئەقلیەتەیە حەزدەکات هەموو شتەکان لە ڕووکەشیدا بمێنێتەوە، هەموو شتێك لە فۆرمدا بێت بەبێئەوەی باس لەنێوەڕۆك بکەین، بەمەرجێك خۆی لەخودی مومارەسەی نێوخۆی وڵاتی خۆیدا، ئەوەی کەنێوی دەنەنێن (ڕۆژئاوا) ، لەنێو مومارەسەی جەوهەر و کرۆکدا سوستێمی دیموکراسیە و دەزگای چاودێرانی دیموکراسی دامەزراندووە، مەسەلەبنەڕەتیەکان لەنێو خودی وڵاتە ڕۆژئاویەکاندا لەفۆرمدا نین ئەوەندەی لەجەوهەردا مامەڵەی لەگەڵدا یەکتردا دەکەن، بەڵام ڕووکاریەت و نیمچە دیموکراسی و هەژاری و داگیرکردن و دروستکردنی دیکتاتۆرەکان لەدەرەوەی خۆیاندا بەرهەمدێنن!. ئەمەیە دووڕوویی دنیای مۆدێرنە، لەکاتێکدا بانگەشەی هیومانیەت و مافی مرۆڤ دەکات، لەهەمانکاتدا پشتگیری پیسترین و بۆگەنترین سوستێمی تۆتالیتاری دەکات، بەشێوەیەك

لامسەلایی وگوێ پێنەدان دەبینین ، یاخود فەرامۆشکردن دەبینینلەبەرامبەر بیروڕایەکی هیومانی،کە لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی خۆیاندا نەگونجێت.

ئەم دووڕوویە ئەو کەلێنەیە کەفوندەمێنتاڵی کریستی و ئیسلامی و ناسیونالی تێیدا گەورە دەبێت ، ئەو کەلێنەیە کەمرۆڤەکانی تێدا سەردەبردرێت. ئەو کەلێنە کەلێنی (ئەقلانیەتی ترسناکە) کەمرۆڤایەتی بەرەو ڕووتبونەوەی مۆراڵ و بەها بالاکانی لێبوردن و پێکەوە ژیان ڕا پێچدەکات.

ئەوانەی کەبەخۆیان وجانتادبلۆماسیەکانیانەوە لەسەر مێزەکان پەیمانبەستی هاریکاری نێوان ڕۆژئاواو میللەتانی دیکە لەڕێگەی پێدانی قەرزی دوورو درێژخایەنی چەك وزرێپۆش و فرۆکە و ڕاکێت ،دادەنیشن، هەرئەوانەن کەبەرهەمهاتووی ئەقڵیەتی ماتمانیکی و بازارخوازی ڕۆژئاوان، هەر ئەوانەشن کەباس لە پێکەوەژیان دەکەن. بەلام لەڕاستیدا ئەوانە لەنێو ئەو کەلێنەوە سەریاندەرهێناوە کەنێوی ئەقڵیەتی ترسناکە.

٦

ڕۆژئاوا پرۆژەیەکە هێشتا کارەسات بۆ ئەوانی دیکە بەرهەمدێنێ، هێشتا لەنێو خەونی نێوەند و سێنرالیزەبوونی خۆیدایە، ئەمە ڕستەیەکی زۆر سادەی دانیشتووانی ئەوروپادا خۆی وەردەردەخات ئەویش ڕستەی [ ئاخر ئێمە جیاوازین!!]، نوسەری ئەم بابەتە لە مێزگردێکدا کەلەلایەن ڕێکخراوەچەپەکانی شاری نورنبێرگدا بانگهێشتکرابوو، لەگفتوگۆیەکدا لەگەڵ چەپێکی ئەڵمانیدا لەمەڕ بەنێو (بەرگری ئیراقی ) ، چەپەئەڵمانیەکە لەگەڵ بەرگریدا بوو، لەگەڵ بەکارهێنانی هەموو توندتیژیەکدابوو دژی ئەمریکا، کوژراوە مەدەنیەکانیشی بەدەرئەنجامێکی ئاسایی هەموو بەرگریەك تێدەگەیشت. بەلام کاتێك لێمپرسی: لەجیاتی ئەوەی تۆ پارەکۆکەیتەوە بۆ بەرگری ئیراقی ، بۆ ناچیت لە ولاتەکەی خۆتەوە دەستپێبکەیت، بۆچی ناچیت لێرە لەئەڵمانیا، کەلێواو لێوە لە سەربازگەی گەورەی ئەمریکی ، بەرگری ئۆرگانیزە بکەیت، بەگاڵتەوە پێمگووت: من ئامادەم نارجۆکێکی دەستی بخەمە هامەرێکی ئەمریکیەوە، گەر تۆ لێرە لەنێزیك ئەم نورنبێرگەوە نارجۆکێکی چرووك و دەمەقاچانێك لەنێزیك سەربازگەی ئەمریکاییەکان بتەقێنیتەوە!!، لەوەلامدا گووتی : ئاخر ئێمە جوداین!!..

لـەو ڕستەیەوە هەست بـەو (ڕەگەزپەرستیە شاراوەیە) دەکـەین، هەست بـەو هەستکردنە بەنێوەندخوازیەدەکەین، کـە ئـەوانی دیکـە لەدیـدی (نێـوەندخوازیزم)وە جگەلە پەراوێز نەبێت هیچی دیکە نین، هیچ نـین جگەلـەوەی ئەوانـە ئەزموونـەکانیان بەهیچ شێوەیەك لەئەوانـەی ئێـمە ناچێـت. لێـرەوە لـە ( کەئێـمە جـیاداوازین) ڕەواخوازی سەربڕینی ئەوی دیکە ،وەك ئۆبێکتیکی بیرکردنـەوەی ڕۆژئـاوا لەبەرامبـەر میللەتان وکولتورەکانی دیکە، شێوەی سیاسی و فیکری خۆی وەردەگرێت.

سەربڕینی ئەوانی دیکە ،بە مەرگی ئەوانی دیکە بـەراووورد دەکرێـت ، بـە مـەرگی نێوەند، سەربڕینی ئەوانی دیکە بەراوورد دەکرێت بە سەربڕینەکانی خۆ، بۆنموونە گەر تەقینەوەیەك لە ئیسرائیل تیرۆر بێت، ئەوا کوشتنی سەدەها کەس لەشـاری (جـەنین) بەدەسـت ئیسـرائیلیەکانەوە، بەرگریکردنەلـەخۆ. لێـرەوە دەتـوانین لـە سـادەترین پرنسیپی هەڵسوڕێنەری گەورەترین پڕۆسێس (کردە) تێبگەین، دەتوانین لەوە تێبگەین کەکاردەسـاتەکانی ڕۆژهـەڵات لەسـەر بنـەمای چ جـۆرە پرنسیپێکی سـادەوە خـۆی هەڵدەسوڕێنێ، پرنسیپێکە گەر لە سـەر ئاستی هەست و هۆشـەمەندی بیرکردنـەوەی مرۆڤی ڕۆژئاوایی خۆی ئاشکرا نەکات، ئەوا لەنەست و ئەودیوو بیرکردنەوەدا زۆر بڕیار هەڵدەسوڕێنێ.

لەڕۆژئاوادا کاتێك مەکینیەك بەرهەمدەهێنرێت ، بەسـەدان چاودێـری تـەکنیکی جگەلە هەڵسەنگاندنی بەرهەمەکانی مەکینەکە، گرنگیەکی تەواو دەدەن بەسـەلامەتی مرۆڤەکان و کاریگەری ماکینەکە بـۆ سـەر مرۆڤـەکان، بـۆ سـەر ژینگـە، بەشێـوەیەك کەزۆرجار توندڕەویشی تێدا دەکرێت، پاکوخاوێنی بەشێوەیەك (بۆنموونە لەئەڵمانیادا) پارەی بۆخەرج دەکرێت، کەئیدی دەگمەنە شوێنایەکی گشتی پیس ببینیت، ئـەوەی کـە ڕۆژهەڵاتیە سەرەتا سەرسام دەبێت بەو هیومانیەتە لە مامەڵـەکردنی ڕۆژئـاوا لەگـەڵ ژینگە و ئاژەڵ و سروشت، بەڵام گەر بڕێك ڕۆحی بەراوردکاریمان تێدا بجولێـت و لـەو سەرسامیە بەچەند هەنگاوێك بێینە دەرەوە، ئەو پرسیارە لەخۆمان دەکەین، بۆچی هەر هەمان وڵات بەلایەوە گرنگ نیـە گـازی ژەهـر بفرۆشێـت بـە دیکتاتۆرێـکی سەرکێـش وشێت؟!، بۆچی بەلایەوە گرنگ نیە چی شـتی بێـکەڵکە ڕەوانـەی ڕۆژهـەڵاتی بکـات؟، بۆچی بەلایەوە گرنگ نیە کە سروشـت و ئاژەڵـەکانیش بەخـەردەل و گـازی جۆراوجـۆر بفەوتێن وژەهراوی بن!!، ئەم دووڕووە ئەخلاقیە، ئـەم دەبـڵ مۆراڵیەتـە، سیفەتێـکی

ترسناك و بێبەزەیی بیرکردنەوەی ڕۆژئاوایە، ئەو ڕۆژئاوایەی لەنێو خودی خۆیدا دیموکراتە و دیکتاتۆریەت وجەنگ و هەژاری دەنێریتە دەرەوەی خۆی.

ئەقڵیەتی ماتماتیکی و بەرژەوەندخوازی ئەوانە بەرهەمدێنێت کە پێمان دەڵێن: ئێمە تەنها بەرهەمی خۆمان فرۆشتووە، دەتوانن نەیکڕن!!. بەمەرجێك هەر خۆشی کڕیارەکەشی دروستکردووە!، کەکۆمەڵێك دیکتاتۆر و بازرگانی جەنگ و شەقاوەی ئەو کۆدێتایانە، کە خۆیان (ڕۆژئاوا) پشتگیریان کردووە، نابێت هیچ یەکێك ئەو گوتەبەناوبانگەی بەعسیەکان لەبیربکەین کەدەیانگووت: ئێمە بەدەبابەی ئەمریکیەوە هاتینە سەرحوکم!!.

٧

ئەم (دووڕووە مۆراڵیە) دیارترین مومارەسەی ڕۆژئاوایە لەزەمەنی (کریستۆفۆکۆلمبس) ەوە تاوەکو ئێستا ، لەزەمەنی کۆلۆنیالیەتی تەقلیدیەوە تاوەکو ڕیکۆلۆنیالیزەکردنی( دووبارەکۆلۆنیالیزەکردن) نوێی ئێستای ئەمریکا لەدنیادا. لە نێوان ئەم دوو مۆراڵیەتە،لەنێوان دیوی شەیتان و فریشتەدا مرۆڤەکان سەردەبڕدرێن ، چ بەمانای جەستەیی و چ بەشێوەیەکی سومبۆلی لەڕێگەی چەوسانەوەی جۆراوجۆرەوە.

سەربڕینەکان، ئەوەی لەسەر لاپەڕەی ئینتەرنێتەکانەوە دەیانبین، زۆر ڤێرزیۆنی و دووری ئاوەهای لەخۆ گرتووە، لەهەمانکاتیشدا زۆر بیرکردنەوەی بێبەزەیانە یاری بەچارەنوسی مرۆڤەکان دەکەن، بەشێکی ئەوانەی لەم ساڵەی دوایدا سەربڕدران ئەو مرۆڤانە بوون بەڵێندەری سوپای ئەمریکی بوون، ئەوانە بوون لەگەڵ زرێپۆش و ئەمنیەت و چەك و تفاق فرۆشتن و ئۆرگانیزەکردندا دەست بەکاربوون، ئەوانەی بەسەر پردەکەی فەلوجەوە سوتێنران و سوکایەتی بەلاشەکانیان کرا. سەر بەو کۆمپانیایانە بوون کە کاریان جاسوسی و گرتن و کوشتن و نەیارانە و لەو پۆلیس و سەربازە درانە پێکهاتوون بە ئارەزووی خۆیان بە پەیمانبەستی جۆراوجۆرەوە کاری کوشتن و تیرۆری سیاسی ئەنجامدەدەن، هەمان ئەوکەسانە کەسانی ناسك و ئاژەڵ خۆشەیستن لەوڵاتی خۆیاندا!. ئەمەیە کەنیوکۆنزەرڤاتیزمی ئەمریکایی بەرهەمی هێناوە، لەوڵاتێکی وەك ئێراقیشدا هەموو نەتەوەو مرۆڤەکان دەخاتە بەردەم هەڵبژاردنی سەخت و ناماقوڵ و ناجۆر، لە تێکەڵکردنی وەرەقەی یاریەکانیدا مرۆڤەکان دەخاتە بەردەم هەڵبژاردن

لەنێوان ئیسلامیەتیرۆیستەکان و بەڵێندەرەکانی جەنگ و بازرگانەکاندا!، لەنێوان سەدامێکی دیکتاتۆری خۆکردە و ژیان لەژێر سایەی هەڕەشەی سوپای ئەمریکیدا کەلەهەموو کاتێکدا ئامادەیە، هەموو سیاسی ورۆشنبیرێکی نەیار لەناوبیات کەلەگەڵ سیاسەتیدا نەگونجێت، (بێگومان بەوانەشی پێدادەگرن لەسەر بەکوردستانیبوونی کەرکوك). ئیدی هەرخودی ئەم هەڵبژاردنە بەزۆر داسەپاوانە جۆرێکە لەسەربڕینی رەمزی مرۆڤەکان لەنێوان خراپ و خراپتر، دەگاتە ئاستێك کەئیدی بڕیاردان خۆی لەخۆیدا جۆرێکە لەسەندنەوەی بڕیار و ئیرادە لەمرۆڤ، جۆرێکە لەسەندنەوەی سەرێکی هۆشمەند و خاوەن ئیرادە لەجەستەیەکی دروست، بەجۆرێك جیهان دەبێتە شوێنای ئەو هەڵبژاردنە قوڕ وبێمانیانە، وای لێدێت ئادۆرنۆ گوتەنی کە [ لەماڵی جەلادا پیاو نابێت باس لەقەنارە بکات][ii] .

## ٨

نیو کۆنزەرڤاتیزمی ئەمریکایی و بەتایبەت هەڵۆکانی واشنتۆن ، دەیانەوێت بەسەرجەم نێوەندەسیاسی ورۆشنبیرەکانی دنیا بڵێن : مێژوو لە یازدەی سێپتێمبەرەوە دەستی پێکردووە، مێژووی تیرۆر هەر لەرۆخانی ئەو دووبورجە زەبەلاحەوە دەستییێکردووە، دەیانەوێت قەناعەت بەهەمووان بکەن ، کەتیرۆ کردەیەکە (لەدەرەوەی ئەمریکایە) و ئەمریکاش دەبێت رێگەی لێبگرێت!!. دەیانەوێت بڵێن هەموو کردەکانی دوژمنکاری و سەربڕین و کوشتن لەدەرووەی ئێمەیە، ئێمەی جوداواز . لەنێوەکی ئەم قسەیەدا هەمان بیرۆکەی کۆلۆنیالیزەکردنەوەی دێرینەیەبەشێوەیەکی دیکە دووبارە دەبێتەوە، کەدەیانگووت ئەو میللەتانە وەحشی و درەندەن و ئێمە شارستانیەتیان بۆ دەهێنی، یاخود ئەوانە ناتوانن حوکمی خۆیان بکەن ن بەڵکو دەبێت لەژێر حوکمدا بن!!.

کردەی دوژمنکاری لەدیدی ئەمریکاو ئەوروپاشەوە کردەیەکە لەدیدی جاك دێریداوە، پابەندە بە پێناسەکردنی رۆژئاوا (بۆ خۆی و لەخودی خۆیەوە) و (لەگەڵ خۆیدا)، لەو ساتەوەختەیەوە کە رۆژئاوا خۆی بەکەللەسەری بیرکاری کاپیتالی کولتوری ئەوروپایی ورۆژئاوایی تێدەگات!، (کاپ) بە (Kap ) بەپەیی دێریدا [ تایتلێکە، ناونیشانێکە ، سەری گەورەی کاپیتاڵە وەك ناونیشانێك][iii] ، گەر

خوێنەری ئازیز لەخەمە نێو مامەخولەکانی یاری زمانەوانی دێریداوە دەتوانین بڵێین: ڕۆژئاوا کە نیوەندی کلتووریەکەی ئەوروپایە، خۆی بەکەللەسەر و کاپی کلتوری دنیا تێدەگات،هەر بۆیە سەیر نیە کەئیسلامیە توندڕەوەکان ڕەهەندێکی ڕەمزیش دەدەن بەسەر لێکردنەوەی ڕۆژئاوییەکان و سروشتی ئەوە دەدەن بە لایەنگرەکانیان کەلێکردنەوەی کەللەسەری ئەوان سەرتایەکە بۆ لێکردنەوەی کەللەسەری گەورەی عەلمانیەت کەڕۆژئاوایە . ئەوروپا خۆی بەسەرچاوەی مێژووی چیرۆکە مەزنەکان تێدەگات و پێناسەی خۆی دەکات، خۆی وەك دێریدا گفتوگۆی لەسەر دەکات ، لەخودی خۆیەوە پێناسەی خۆی دەکات. ئەمەش کێشەبەندی گەورەیە کەلەسەرەوە ئاماژەمان پێدا کە لەخودی خۆتەوە و لەگەڵ خۆتدا پێناسەی خۆت بکەیت، ئیدی ئەوانی دیکە کەلەدەرەوەی ئەو کلتووردان ، هەڕەشەن و نامۆن بەکلتووری کاپیتاڵ، گەر بڕێکی دیکە ئەم تێزە شیبکەینەوە دەتوانین زۆر ئیدیاو تێزی دیکەی لەسەر بینا بکەین، دەتوانین لەو کێشە بەندیەوە سەیرە بگەین کە دێریدا باسی لێوە دەکات و دەڵێت: [ نوسەرێکی وەك ڤالێری ئاوەها چاودێری ئەوروپا دەکات ، ئاوەها سەیری دەکات ، کەئەوروپا دەموچاوی کەسێکە،هێزێکی ڕێبەرایەتی لەگەڵ خۆدا هەڵگرتووە، بەمانای کاپێکە. سەرێکە چاوی هەیە و هەمیشە لەگەڵ ئاسۆگەدا خۆی دەسوڕێنێت، بەئاگایە لەو ڕێڕەوەی بۆی دەگەڕێتەوە... ئەوروپا ئەو شوێنە باشەبووە، کەئەوروپایەکان و ڕۆحی ئەوروپا ، موجیزەیان تێدا خولقاندووە] هەمان سەرچاوە ل٢١

دیارە کەلێنی گەورە لەم جۆرە بیرکردنەوەیەوە سەرهەڵدەگرێت، خودی خۆ ناسین وەك دوا پێناسەی کولتور، کولتورێك کەدەگاتە کۆتایی وخۆی بەدوا کولتور تێدەگات، کلتورێك لەهۆشمەندی ئەقڵی ڕۆژئاوایدا خۆی بەتاکە پێوەر تێدەگات، یاخود ئەو ڕاستە پێوانەیە کەهەموو کولتورەکانی دیکەی پێدە پێورێت، بەجۆرێك ئەم (ڕۆژئاوا سێنترالزیمە ) گەشەی سەندوە کەئیدی بواری بەهێشتنەوەی هیچ لێوار وپەراوێزێك نەهێڵێتەوە، ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە لەنێو خودی ڕۆژئاوادا گەیشتە ڕادەیەك کەیەکێکی وەکو فۆکۆیاما بکەوێتە سەر ئەو ڕاهەڵەیەی کە کاپی ڕۆژئاوایی لەکلتووری ئەمریکیایدا بەرجەستە بووە و ئەویش کۆتایی مێژووە!، دوا نوێنەرە و دوا نمونەیەی مرۆڤایەتیە، دوا نموزەجی سوستێمی سیاسی و کۆمەڵایەتیە، بەشێوەیەك کەئەم کەللەسەرە گەورەیە تەنها پێوەری خۆی بەتاکە پێوەر بزانێت، لەمەوە توند ڕەوی

لەوەزیاتر پێی ڕاکێشا کە کە (هێمنگتون) جۆرێك لەو ڕاسیستی و کۆلۆنیالیزەنوێیە تێورەبەند بکات و ناوی (شەڕی کلتورەکان) ی لێبنێت!!. ئەمە کەرانەترین بۆچوونە!، من پێموایە هەر چەمکی کولتور خۆی لەخودی خۆیدا دژە زۆرانبازی لەوجۆرەیە. کولتورەکان یەکتری دەدوێنن وتەواو دەکەن، زانستەکان دەرژێنەوە نێو یەك بواری مەعرەفەی شمولی مرۆڤانەوە، هونەرەکان سنورەکان دەبەزێنن و بەهەمووان یەك کەش وهەوا پێکدەهێنن ، کەئەویش ناوی کەش و هەوای کولتوری هاوچەرخە. چەمکی کولتور هەرگیز لەگەڵ چەمکی زۆرانبازی یەك ناگرنەوە، دەشێت زۆرانبازی خۆی خاوەنی کلتورێك بێت، ئەم کولتورەشی کاتێك پیادەدەکرێت دیسانەوە کەلتور بەرهەمدێنێت، بەلأم دوو کولتور زۆرانبازی بکەن ئەوە ناتێگەیشتنێکەو خوێندنەوەیەکی سیاسیانەی بەرژەوەندیدکارەی تاکرەهەندە ، دوو شارستەنیەت زۆرانبازی بکەن، ئەوە لەوانەیە هێزە سیاسیەکان بەنێوی شارستەنیەت وکلتورەوە شەڕ بکەن، هەر وەك چۆن هەموو تاوانێك لەدنیادا لەژێر چەندە ناوێکدا خۆی ڕەوابەندی دەکات، بەلأم کلتوورەکان مانای شەڕ نازانن، لەبەر ئەوەی جەوهەری کلتور جەوهەرێکی گفتوگۆئامێزانە و تەواوکارانەیە.

٩

هەستکردن بەوەی کە کلتوری ڕۆژئاوا تەواوکارە و گەیشتۆتە ئەو بڕوایەی هەموو کولتورەکانی دیکە بەهەڕەشە بزانێت و هەموو کولتورێك لەدەرەوەی خۆی بەبێگانە تێبگات، فۆبیای هەبێت لەهەموو کولتور و ئاینێك لەسەر زەوی خۆی چالاك بێت و بەتێکدەری کولتوری تێبگات ،لە پشت ئەم هەڵەکاریەوە کۆنزەرڤاتیزمی ئەوروپایی و ئەمریکایی وناسیونالیستەکان وەستاون، ئەوانە هەڵسوڕێنەری ئەم جۆرە خۆ زلکردنەن ، بەجۆرێك کەزۆر لەو فەیلەسوف و ڕۆشنبیرە ئۆرگانیانەی دەرەوەی دەزگای ڕۆشنبیری ڕەسمی وەك دێریدا و هابرماز و چۆمسکی و ئێدوارد سەعید و تاریق عەلی و هەزارەها ڕۆشنبیری ڕۆژهەلأت و ڕۆژئاوا دژی ئەم ناماقوڵیەتانە لە جەنگێکی فیکریدان.
هەر لەنێو خودی ڕۆژئاوادا هابرماز لەگوتاری (ڕوخانی پەیکەر مانای چیە؟)[iv] لەبڕوایەدایە کەلێنی گەورەی دنیای ئێستامان لەو بیروڕا هەڵانەوە سەرچاوەی هەڵگرتووە کە نیوکۆنزەرڤاتیزمی ئەمریکایی بەڕابەرایەتی هەڵۆکانی واشنتۆن

وپنتاگۆن پیادەی دەکەن. ئەوان لەو پێشینەی بیروڕایانەوە کەوتونەتە ئەو بڕوایەی کە دەبێت چ نمونەیەك لەدنیای ئێمەدا هەبێت ، لە نموزەجی ئەمریکایی باشتربێت؟، نموزەجێك شەڕی ساردی بردەوە و لەگەورەترین زۆرانبازی مێژوویدا بەسەرکەوتیی هاتەدەرێ نموزەجێك کەبازاڕی ئازاد دەهێنێتە گۆڕێ و گلۆبالیزەکردنی دنیا لەئەستۆ دەگرێت، دەبێت لەم نموزەجە باشتر هەبێت لەدنیادا؟!. تاکرەهەندی ئەم بۆچونانە سیاسەتی چەندەها ساڵەی ئەمریکایەکانە و هەوڵدانە بۆ سێنتراڵیزەکردنی ئەمریکانیزم وەك نموزەجێکی تەواوکار و ڕەها لەدنیای ئێمەدا. دووبارەکۆلۆنیالیزەکردنەوەی ناوچەکانی نەوت و گۆڕینی دەسەڵاتەکان لەئێراقەوە سەرەتای زنجیرەیەکە کەهێشتا چەندەها ئەڵقەی دیکەی بەدوودا دێت.

هابرماز لە گوتارەکەیدا لەمەڕ ئەم تێزی جەنگخوازی و دووبارە کۆلۆنیالیزەکردنەوەی دنیا دەڵێت: [ڕوخانی پەیکەرەکەی سەدام ئارگومێنێکەکە ڕەواخوازی دەبەخشێت بەوان]. بەڵام لەهەمان کاتیشدا هابرماز پێی وایە کەئەم جەنگانەی ئەمریکا دەوڵەتی ئەمریکاو دنیا بەرەو شێواندن ڕاپێچ دەکات [ دەوڵەتێك هەموو توانا و خاسیەتەکانی کورت بکاتەوە لە نێوان جەنگ وئاشتی ، زۆر ئابات ڕووبەڕووی سنوری توانای ئۆرگانیزەکردنەکانی و هۆکارەیارمەتیدەرەکانی خۆی دەبێتەوە،هەموو تێگەیشتنەکان لەمەڕ کولتورە بێگانەکان و زۆرانبازی دەسەڵاتەکان بەرەو چەندەها کەناڵی پڕهەڵەکاری ڕاپێچدەکات]، نمونەش لەسەر ئەوە هابرماز دەڵێت [ لەهەزارو نۆسەدو نەوەدویەکدا ئەمریکایەکان کوێتیان ئازادکرد بەڵام نەیانتوانی دیموکراسیزەی بکەن ].

لێرەوە دیموکراسیزەکردنیش لەچوارچێوەی هەڵبژاردنی داهاتوودا جێگەی گومانە لەڕووی ئەتمۆسفێرە فیکری و کەشوهەوای نیوکۆنزەرڤاتیزمدا ،بەدگومانیێکی گەورەمان لەلابەجێدەهێڵێ، بەجۆرێك کەهەڵۆکان بەهەر نرخێك بێت هەڵبژاردنیان دەوێت. تەنها بۆ ئەوەی لەداشی دامەکانی دیکە بدەن. لەو دەوڵەتانەی دیکە بدەن کەساڵاهایە خۆیان چ بەچاونوقاندن لەتواناکانیان ، چ بەچەکفرۆشتنی نهێنی پێیان و چ بە ڕاوێژکاری سی ئای ئەی لەمەڕ هەڕەشەی هێزە دیموکرازخوازەکان و بەچەندەها شێوەی دیکە پشتگیریان کردوون. هەموو ئەمانە لەژێر دووڕوویی ئەمریکانیزمدا کەخاوەنی چەمکێکی تایبەتە بەتیرۆرریستی خۆی کۆرپەیی دەکات، چۆمسکی گوتەنی [

تیرۆریستی لەدیدی حکومەتی ئەمریکاوە ئەوەیە کەزەرەد لەئێمەبدات، بەڵام گەر ئێمە خراپتریشیان لێبکەین ن ئەوە تیرۆر نیە][7]، ئیدی هەموو هەڵبژاردنەکان لەچوارچێوەی ئەو کەشوهەوایەدا لە کەنارەکانی رووکەشیدا دەگیرسێتەوە، هەمووی دەچێتە خانەی یاریەك کە کۆنزەرڤاتیزمی نوێی ئەمریکایی نەخشەی بۆ کێشاوە.

نابێت ئەوەش لەبیربکەین کەهێزەدیموکراسخوازەکانی نێو ئەوروپاو ئەمریکا و رۆژئاوا بەگشتی لەدژی ئەم هێڵەجەنگخوازی و مێژووە رەشەیە کەکۆنزەرڤاتیزم و تەوژمی راسترەو بەگشتی لەنێو دەسەڵات ولەدەردوەی دەسەڵات بانگەشەی بۆدەکەن خەباتدەکەن . نابێت ئەوەمان لەبیربچێت کەنیوکۆنزەڤاتیزمە ئەو ژوورانەیان بیناکرد کە فوندەمینتالیزم تێدا بحەوێتەوەو گەشەبکات، ئەوانە بەچاوپۆشین لەهەموو هێزەدیموکراخوازەکانی نێو پاکستان و ئەفغانستان ، تاڵیبانیان لە(پیشاودر) لەرێگەی موخابەراتی پاکستانی و ئەفغان عەرەبەوە پەروەردەکرد، خوێنەری ئازیز نابێت ئەوەی لەبیربکات کەتالیبان زۆربەیان ئەو منداڵ و مێرد منداڵانەبوون کەلەقوتابخانە ئاینیەکاندا پەروەردەکران، لەپاڵ خوێندنی ئاین وەك رەوشێکی لێبوردن و خۆشەویستی ، فێری ئەویانکردن چۆن کوێرانە جیهاد بکەن ، فێریانکردن کەتەکفیرکردن وکوشتن بەشێکە لەجیهاد، ئەو مێردمنداڵانە دوای چەندەها ساڵ نێردرانە نێو ئەفغانستان و شەڕی لایەنەناکۆکیەکانیان یەکلاکردەوە، ئیدی کەکاریشیان پێنەمان، لێیاندان و قاعیدەیان بەلەسەکرد بۆ ئەوەی ئەو جونجەتانەیان پێبەبەخشێت بۆ ئەوەی (سیاسەتی نوێی جیهان) پیادەبکەن. ئەو سیاسەتەی لەزەمەنی رۆلاند رێگانەوە لەژێر تایتلی (دووبارە ئۆرگانیزەکردنەوەی نەخشەی دنیا) باسی لێوەکراوە. لەسەر ئاستی ئەوروپیش ئەم جەنگە سامناکانە و ئەم یەك جەمسەریە ئەمریکانیزمیە، ئاسیونالیستەکانی ئەوروپاشی هاروژاندووە، نەك لەبەر ئەوەی ئەوان دیموکراسیخوازترن و دژەجەنگن، وەك لەهەڵوێستی شیراك و شرۆدەردا بینیمان، نەخێر بەڵکو لە پشتیەوە برینداركردنی شانازیەکی ئاسیونالستیە، تێکەڵە بەترسێك لە لەدەستچوونی رۆڵی سێنترالی ئەوروپا لەدنیادا، ئیدی جاك شیراك لەکاتێکدا پەستە بە بوونی سەربازی ئەمریکایی لەئێراق و ناوچەکە و بەناشەرعی تێدەگات، هەر خۆشی ئیمزای ناردنی سوپای فەرەنسی دەکات بۆ ئەفریقا

(ساحل العاج) ، بەمەرجێك خەڵكی ئەم وڵاتە لەم ماوەیەی دوایدا بەردەبارانیان کردن!.

ئەم دووفاقیە ، ئەم دووڕوویە، ئەم دەبڵ مۆراڵیە، بۆتە بەشێك لەو زۆرانبازیەی کەئەمریکا و ئەوروپا لەسەر جەستەی میللەتانی دیکە بەرپایان کردووە. لەبەرامبەر ئەمەدا ئەورپا جگە لە پەیمانی ناتۆ بیر لە پێکهێنانی هێزێکی سەربازی ئەوروپایی گەورە دەکاتەوە، لێرە و لەوێ بەهۆی ئەم زۆرانبازیە ناجۆرانەوە ، بەهۆی ئەم کەش و هەوایەی نیوکۆنزەرڤاتیز م و ئەمریکانیزمەوە،ڕۆڵی ئاسایش و سوپاو پۆلیس و دەزگاکانی چاودێری بەزەقی دێنەوەسەر شانۆی سیاسەت، کۆنزەڤاتیزم هەمیشە لەژێر ناوی هەڕەشەی دەرەکی دەگەشێتەوە، بەمەش دیسانەوە ئاینی ئیسلام وموسوڵمانان لەئەوروپا و ئەمریکادا، گەر هاتوو ئەوانە کەسانی عەلمانیش بن، ئەوا بەچاوی گومان و شێوەتاوانباریەکەوە سەیر دەکرێن، ئەو ڕاسیستیە شاراوەی کەجاران لاواز بوو، ئێستا لەگەڵ هەر تەقینەوەیەك وکارێکی تیرۆریستیدا زیاتر بەهێزتردەبن، ئوسامەبن لادن و قاعیدە نەك هەر دژی ئەمریکا و ڕاسیزمی جیهانی نین، بەڵکو تەواو لەخزمەتی تێزەکانی ئەواندا کاردەکەن ولەمنداڵدانی ئەوانەوە سەریانجوقاوە، ئەوان ئەو بەڵگانە دەخەنە بەر دەستی ڕاستڕەو و ڕاسیست ونیوکۆنزەرڤاتیزمانە، کەسەربڕین و شانازیکردن بەلێکردنەوەی سەری مرۆڤ لەجەستەی ،نیشاندانی کولتوری ئەویدکەی ڕۆژهەلاتی وموسوڵمانە. ئەوان زیاتر دیکۆمێنت دەدەن بە ئەقڵی جەماعی تەماشاکاری ئەوروپایی کاریگەر لەژێر میدیا وڕۆژنامەڕەسمیەکاندا، کەبەشێکی زۆریان لە ژێر کۆنترۆڵی ڕای ڕەسمیدا نیمچە حەقیقەت و حەقیقەت بەتەڵخی و وێنەی ناتەواو لەسەر ڕۆژهەلات و کولتورەکانی دیکە دەبیستن و دەبینین. بۆنمونە کەرپیۆرتەرێکی تەلفیزۆنێك دێتە بەغدا یان سلێمانی ، بەلایەنەوە گرنگ نیە چەندە شانۆ و شانۆکار هەیە، بەلایەنەوە گرنگ نیە چەند ڕۆژنامەی ئازاد و ئەدەبی جوان هەیە، چەندە ڕۆشنبیری ئەکتیڤ هەیە کەساڵاهایە سەڕەرای نەبونی وجەنگ و چەوساندنەوە کاریان کردوە و ئەدەب و هونەری جوانیان بەهەرمهێناوە، ئەمانە هیچیان بۆ چاوی کامێرەکانی ئەوان جێگەی سەرنج نیە ، بەقەد هێندەی مەلایەکی توڕەی توندڕەو بدۆزنەوە کەف لەدەمی بێتەدەرێ و هەڕەشەبکات لەهەموو پرنسیبەکانی دنیای تازە، بەلای میدیای ڕەسمی ئەوروپایەو گرنگ نیە چەندە ئافرەتان خەبات دەکەن بۆ ئازادی خۆیان

وتائێستا چیان کردووه، بەقەد هێندەی بەدوای چەند موحەجەبەیەکی توندڕەودا بگەڕێن کەتەنها چاویان بەدەرەوەیە و وەك خێوی ترسناك هەڕەشە لەهەموو ئازادیەك بکەن کەئافرەت پێویستە بەدەستی بهێنێت. ئەو ڕوانینە ئیستشراقیانە هێشتا دینامیکیەتی زۆربەی میدیای ڕەسمیە، کەبەداخەوە نیوکۆنزەڤاتیزم و ئەمریکانیزم زیاتر ئەو جۆرە میدیایە زەقدەکانەوە و کەش و هەوایەکی ئاوەهای بەسەر ئەوروپا و ئەمریکاو جیهانی دا پۆشیوە کە پڕێتی لە توندڕەوکردنی هەموو ڕاسیسیزمێکی لاواز و پشتگیرکردنێکە بۆ هەموو ئەو هێزانەی داوای چاودێری وکۆنترۆلکردنی ئازادیەکان دەکەن،بێگومان دەیانەوێت لەکلتوری بێگانەوە دەستپێبکەن پاشان بێنە سەر دیاریکردنی ئازادیەکانی نێو ئەوروپا (هەر لەبیمەی بێکاریەوە بیگرە تاوەکو سوستێمی تەندروستی و پەروەردە)، بێگومان لە پشت ئەمانەوە دنیایەك کۆمپانیای گەورە وەستاوە کەجەنگەکان بەرهەمدێنین و دەیانەوێت سوستێمی دەوڵەتی کۆمەلایەتی بگۆڕن بەسوستمێکی شێوەئەمریکایی کە زەمانەتە کۆمەلایەتی و تەندروستیەکان تێیدا کورتبکرێتەوە و تەسکربکرێتەوە تارادەی خنکاندنی هەموو هەڵبژاردنەکان..

١٠

تەماشاکاری سەربڕین و سەربڕدراو و جەلاد لەنێو ئەو کەلێنانەی بەدرێژایی ئەم گوتارەدا باسمان لێوەکرد، دەسوڕێنەوە، بەجۆرێك کەنیوکۆنزەرڤاتیزمی ئەمریکایی لەسەرێکەوە و لەسەرێکی دیکەشەوە دووڕوویی ئەخلاقی دنیای مۆدێرن پۆست مۆدێرنی ئەوروپاییش بەرهەمی هێناوە.

کردەی سەر بڕین تەنها کردەیەك نیە کۆمەڵێك تیرۆریست وپیاوکوژ بەناوی ئیسلام و جیهادەوە پێیهەڵبستن، بەڵکو کردەیەکە لەقوڵایی کەلێنەگەورەکانی نێوان مۆراڵ و بەرژەوەندیەکانی دەسەڵاتی ئەمریکاو ئەورپاوە خۆی پێکهێناوە، هەموو ئەو فیگورەپیاوکوژانەی قاعیدە وبەعس و پیاوکوژەکانی سەدام و سەرکردەو دیکتاتۆرچکەکانی ناوچەکە . بەرهەمهاتووی پرۆسێسێکی دوورودرێژیی مێژوویە کەلەپشتیەوە تەنها یەك زەرقاوی بچوکی ئێستاکێ نەوەستاوە، بەڵکو زەرقاویە گەورەکانی دنیای مۆدێرنی ئێمە هەڵیدەسوڕێنن!. کەلەداهاتووشدا بەناوی دیموکراسیەتەوە هەموو دیموکراسیەتێك سەردەبڕن کە هەناسە بدات، هەموو

ڕۆشنبیرێکی چالاك و ئۆرگانی لەژێر پەستاوتنی مەنفاو ڕاونان و گۆشەگیرکرا
ڕامدەکەن گەر ڕامبکرێت، گەر بۆشیان ڕام نەکرا ئەواچەندەها چەقۆو کێرا
جۆراوجۆریان هەیە کەئامادەباشن بۆ سەربڕینی هەموو ئازادیەك کەبچێتە نێ
ووردەکاریەکانی ژیانەوە . کردەی سەبڕین و چێژی تەماشاو سەربڕدراو پێویست
دیسانەوە پرسیارە قوت بکاتەوە لەبەردەمان، پرسیاری ئەوەی: بەڕاست ئەمجارەی
کێن ئەوانەی کەسەردەبڕدرێن!!.

# سەرچاوە و پەراوێزەکان


هابرماز : مۆدێرنە وەك پرۆژەیەکی ناتەواو ـ ١٩٩٤ دەزگای بڵاوکردنەوەی ریکلامی ئەڵمانی.
Jürgen, Habermas. Die Moderne ein unvollendetes Projekt. Reclam Verlag ١٩٩٤

[١] ئادۆرنۆ: پەروەردەکردنێك بەرەو پشت بەخۆبەستن.١٩٧٥ دەزگای بڵاوکردنەوەی سورکامپ.
Theodor W. Adorno. Erziehung zur Muendigkeit. Suhrkamp ١٩٧٥.

[١] جاك دێریدا: کاپێکی دیکە و دیموکراتیەکی دواخراو. دەزگای چاپی سورکامپ ١٩٩٢ . ل١٥
Jacques Derrida. Das andere Kap , die vertagte Demokratie. Shhrkamp verlag ١٩٩٢

[١] بگەڕێوە بۆ گوتاری هابرماز بەزمانی ئەڵمانی (ڕوخانی پەیکەر مانای چیە؟) لە کتێبی ( ڕۆژئاوایەکی پەرتبوو) ، دەزگای چاپی سورکامپ ٢٠٠٤ .
Juergen Habermas. Was bedeutet Denkmalsturz?."Der gespaltene Westen" . SV. ٢٠٠٤.

[٧] نوام چۆمسکی ز کۆنترۆڵکردنی میدیا.بەزمانی ئەڵمانی لەلایەن دەزگای چاپی ئەورپاوە.ل٢٢ .
Noam Chomsky. Media Control. Europa Verlag ٢٠٠٢

# دۆزی کەرکوك و گرەوێك لەسەر ڕۆشنبیری!!

(چەند سەرنجێك لەمەڕ گوتاری ڕێزدار مەسعود بارزانی لەدیداری ڕۆشنبیرانی کورد وعەرەب لەهەولێر)

گوتاری ڕێزدار مەسعود بارزانی لەدیداری ڕۆشنبیرانی کوردی و عەرەبیدا لەهەولێر، جێگەی سەرنج و لێدوانێکی هێمنانەیە لەسەرجەم ئەو خاڵانەی گوتارەکە هاروژاندوویەتی ، دیارە گرنگترینیشی لەوەدایە لەلایەن یەکێکەوە پێشکەشکراوە کەلەهەرەمی دەسەڵاتدایە و ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە و هەیەتی لە گۆڕەپانی سیاسی کوردی وعیراقی وناوچەکەدا . ئەمەش وامان لێدەکات کە ئەو گوتارە وەك بەڵگەنامەیەکی مێژوویی تەماشابکەین کەوەکو شمشێرێکی دووبڕ وایە ، یەکێکیان تیژ ملی دوژمن دەپەڕێنێ و ئەویدیکەش لێپسراوێتی مێژوویی لێدەکەوێتەوە ، بەمانای چەندە لەنێو هەرەمی دەسەڵاتدا بیت ،ئەوەندە دیکۆمێنتارکردن و بە بەڵگەنامەکردنی هەڵوێستەکان دەبن بە پێوانەیەکی مێژوویی و هەموو پاشگەز بوونەوەو پاشەکشێیەك لەو گوتارانە پاشەکشێی ڕەواگیریەکی سیاسیانەیە.

دەبێت ئەو ڕاستیانە بڵێن کە گوتارەکە لە بۆنەیەکدایە کەبەشێك لە ڕۆشنبیرانی تەقلیدی عەرەبی و کوردی لەیەك هۆڵدا کۆبوونەوە، لەوانەیە هەندێکیش لە ڕۆشنبیرانی (ئۆرگانی ) بەپێناسەی گرامشی یاخود بە پێناسەی فۆکۆ ( ڕۆشنبیرانی تیژڕەو ) و چالاکیشیان یشیان تێدا بێت .

ئەوەی لەگوتارەکەدا هەوڵی بۆ دەدرێت وەئاگاهێنانەوەیەکی بیرەوەریەکی خەوتووە ، کەدەیەوێت لە ژێر تاتیلی برایەتی کورد و عەرەب و دیموکراسیدا پێناسەو مێژووی میللەتێك و کۆمەڵگایەکی زمانەوانی وکلتووری داپۆشێ ، گوتارەکە هەر لەسەرەتاوە بەو هەستەوە ڕوو لەدەمی ئەو ڕۆشنبیرانە دەکات و وەبیر هێنانەوەیەك پێشکەش دەکات کە بوونی کورد چی بووە و ڕۆڵی چی بووە لە مێژووی ناوچەکەدا. ئەمە جگە لەوەی گوتارەکە سەراحەتێکی بێپەردەی لەخۆ گرتووە کەبێ هیچ ڕازاندنەوەو پێچ و پەنایەك جەخت لە کوردستانیبوونی کەرکوك دەکات پاشان دێتە سەر چەمکی پێکەوە ژیان.

لەوەتەی سیاسی کورد چۆتە پرۆسەی بەعێراقیبوونە وە ئاوەها بە بەسەراحەت و بەبێپەردە و ڕوونی جەخت نەکراوەتە سەر بەکوردستانی بوونی کەرکوك ، ماوەیەکە ئەوەندە بەعێراقی بووین کەئیدی هەندێکمان شەرمان لەخۆمان دەهات کە عەرەبی نازانین. گوتارەکە زۆر خاڵی ونبوو دەخاتە سەر پیتەکان و پێویستی بەزیاتر ڕوونکردنەوە نیە.

ئەوەی لای من گرنگە ئەوەیە ئەم گووتارە لەبۆنەیەکی یەکگرتنەوەی ڕۆشنبیرانی عەرەب و کورد پێشکەشکراوە ، کەئەمەش وامان لێدەکات لەو مەبەستە ئاشکرایە تێبگەین. کەگوتارەکە ئاراستە کراوە بۆ ئەو ڕۆشنبیرە عەرەبانەی هاتوون، بەمانای هەستکردنێکە لە لایەن دەسەلاتی کوردیەوە کە مەترسی لەکوێوە سەر هەڵدەدات ، لەکامە جۆری هێز کەبەردەوامی خۆی، لە دەستەجەمعی و کۆلیکتێڤی و گردبوونەوەیدا نیە! ، بەڵکو لە هێزێکی تاکرەو و ئیندیڤیدوالە، تاکێکە ، فیگورێکە ، مرۆڤێکە لە دەوەرەی هەموو ڕەشبەڵەکەکاندا سەمای خۆی دەکات و خاوەنی دەسەلاتێکی ماتریالی نیە ، بەلام خاوەنی دەسەلاتێکی بەردەوامی ئۆرگانی چالاکە ، ئەو فیگورە ،ئەو مرۆیە، ڕۆشنبیرە بە هەموو دووریەکانیەوە.. گوتارەکە ئاراستەی ئەوان کراوە و بۆ ئەوان گوتراوە، ئەوانە (مەبەستم لە ڕۆشنبیرانە بەگشتی ) بەڕای هەموو دەسەلاتێکی دنیا، ڕۆشنبیران نەدۆستی هەمیشەیین و نەدوژمنی هەمیشەین ، بێگومان من باس لە ڕۆشنبیری چالا ك و جیدی دەکەم کە بواری تایبەتی خۆی ، بواری بەکارهێنانی دەسەلاتی خۆیەتی لە نێو ئیدیاو زمان و ئەدەبدا چالاکە و خاوەنی جیهانبینی خۆیەتی.

گەر بمانەوێت باس لەکێشەی کەرکوك بکەین بەڕای من ناکرێت ئەم دۆزە لەسەرجەم کێشەی ڕۆشنبیری جیابکەینەوە، ئەو جودا کردنەوەیە لە نێوان ڕۆشنبیری و مامەڵەی سیاسیدا کاریگەریەکی زۆر نێگاتیفانەی هەبوو لە ئاستی نوێنەرایەتی کوردی لە عێراق و لەسەر ئاستی نێو دەوڵەتیدا، هەر ئەمە بوو کە ڕۆشنبیرە تەقلیدیە ناسیونالی و ئیسلامیەکانی عەرەبی لەعێراقدا هاندا دەم گەرمتر بێنە پێشەوە و لە پەنا ئەو کورسیەوە دانیشین کە سەرکردەیەك یاوەکو ئەندامی حزبێکی سیاسی کەساڵاهایە دژی دیکتاتۆریەت جەنگاوە و خەباتیکردووە بۆ ئازادی، دانیشن و درێژە بەو میراتیە بدەن کەناسیونالیستی عەرەبی لە ئەزمونی سەدامیەتدا بۆ ئەوانی

بەجێهێشتووە. سیاسی کوردی بەگشتی ئەوەندە ئەو دوو چەمکەی بەجودا لەیەکتر دەبینی ، کەئێستا وورده وورده بۆی دەردەکەوێت کەکاری عەرەبە ئێراقیەکان بە پێچەوانەی ئەوانەوەیە ، بەمانای گەر سیاسی کوردی بەدوور لەتێزەکانی کلتووری سیاسی و ڕۆشنبیرانەی سیاسیانەوە ، تەئکید بکاتە سەر هاوکێشەی تەرازووی هێزەکان و تەحالوفاتەکانیان و جۆری گرەو کردن لەسەریان بکات، ئەوا سیاسی عەرەبی عێراقی بەئاراستەیەکی پێچەوانەوە کاری کردووە، بەمانای گرنگیداوە بەبیروڕا و کلتوورێك کەبتوانێت خۆی لەسەر بینا بکات ، پاشان هاتۆتە نێو تەحالوفاتەکانەوە. لێرەشەوە کێشەی کەرکوك و بەکوردستانیبوونی چەندە لەسەر ئاستی مێژوویی و واقعیدا بوونی هەیە ، ئەوەندە ئێمە نەمانتوانیوە لەسەرئاستی سیاسی لە پێشینەی مەسەلەسیاسیە گرنگەکانی ئێراقدا بێت !، ئەوەی کە تاوەکو ئێستا گوتراوە چەند ڕستەیەکی شەرمنی سیاسیانە بووە لە مەڕ گەڕانەوە، کەباس لە گەڕانەوەش کراوە تێکەڵی بەگەڕانەوەی ئەوانی دیکە کراوە، ئەوەندەی تەئکید لە عێراقیبوونی کەرکوك کراوە ، ئەوەندە تەئکید نەکراوە لە کوردستانیبوونی !، ئەمە یەکەم جارە حزبێکی سیاسی لەدەرەوەی نێوەندی کوردی ئاوەها بەڕاشکاوی و بێپەردە باس لەکوردستانیبوونی کەرکوك بکات.

ئەوەی کەدیسانەوە دەمەوێت تەئکیدی لەسەر بکەم مەسەلەی ئەو دوو ئاراستە پێچەوانەیەی (شێوازەکانی بیرکردنەوە)ی سیاسی کوردیە لە سیاسی عەرەبی عێراقی ، بۆ ئەوەی زیاتر ئەم مەسەلەیە ڕوونبکەمەوە دەتوانین چەند وێنەیەك بهێنینە پێش چاومان کە مەبەستەکانم زیاتر ڕووندەکاتەوە، مادامەکی ئێمە باس لە پەیوەندیەکی نێوان ڕۆشنبیرانی عەرەب وکورد دەکەین و مادامەکی بەڕێز مەسعودبارزانی لەو دیدارە دەیەوێت چەند پرنسیبێك ئاڕاستەی ئەوانە بکات کەنێویان ڕۆشبیرە و بەتایبەت ڕۆشنبیری عەرەبی .

سیاسی عەرەب ئەو مێژووەی نیە لە خوێندا وەکو ئێمە، بەمانای گەر ڕۆشنبیری کورد بە حوکمی شەڕی بەرگری لەقەوارە و بوونی جەستەیی و مێژوویی و کێشەکانیدا نقومبووبێت، ئەوا ڕۆشنبیری عەرەب وازی هێناوە ، کۆدێتاکان کاری خۆیان بکەن ، پاشان هاتۆتە نێو جومگەکانی دەسەڵاتەوە، ڕوونتر قسان بکەم ، دەڵێم ، بەحوکمی کوردبوونمان ، بەشدارێکی ڕاستەوخۆبووین لە شەڕێکی بەرگری دوورودرێژ کەتاوەکو

ئەمڕۆش بەردەوامی هەیە، شەڕێك زیاتر بۆ مانەوە بووە، بۆ لێرەبوون نەبووە، گەر شەڕی مانەوە شەڕێکی بەرگری بێت لە هەموو کلتور و زمان و خاك و جەستەیەك، ئەوا شەڕی (لێرە بوون) شەڕی پێناسە و پەرپێدانی ئەو پێناسەیە بەهەموو دووریە سیاسی و ڕۆشنبیرەکانیەوە، ئێمە دەبێت یەکە مجار بوونمان هەبێت ، پاشان دەتوانین لێرەبوونمان بسەلمێنین. ئەمەتارادەیەك کێشەی عەرەب بووە لە سەردەمی کۆلۆنیالی بەریتانی فەرنسیدا ، عەرەب ئەوسا بەرگری لە بوونی خۆی دەکرد ، بەلام بەهاتنە کایەی ڕژێمە عەرەبیە (پۆست کۆلۆنیالیەکان) ئەم کێشەیە بەڕوویەکی دیکەدا وەرچەرخا، ئیدی هەموو کێشەکانی عەرەب لە سیاسەت و کلتووری سیاسیدا دەسوڕایەوە، هەوڵدانێك بوو بۆ بەخشینی شێوازێکی ناسیونالیستی سۆسیالستی بە (لێرەبوونی ) دەسەلاتی عەربی لە زەمەنی جەمال عەبدولناسر وە و لەسەردەمی قاسیمیشدا دوو پێناسە لەشەڕو ململانێی سیاسیدا بوون بۆ بەخشینی پێناسەیەکی جیگیر بە دەوڵەتی عەرەبی ، بەشێك قەومیە عەرەبیەکان بوون و بەشێکیش کۆمۆنیستەکانی لایەنگری قاسم بوون ، لە نێوان ئەم هێزانەدا لە میسردا ئیسلامیەکان چەکەرەیان کرد و لەعێراقیش بەعسیەکان لەژێر سایەی ئەفلەق وورده وورده گەشەیان کرد. ڕۆشنبیری تەقلیدی عەرەبی زۆربەیان لەڕووی سیاسیەوە پێگەیشتووی ئەو ئاو وهەوایەن و لەژێر ئەو کەش و هەوایەدا کاریان کردووە، ئەگەر هاتوو هەندێکیشیان ڕای جیاوازیان هەبووبێت ،ئەوا کەنارگیر کراون و دەنگیان کز و شەرمنانەبووە. وەك بەراوردکاری دەتوانین بڵێینکە زۆربەی ڕۆشنبیرانی کورد لەنێو کەشیگەرایی شۆڕش و بەرگری و مل ملانێی خوێناوی پێگەیشتوون و کاریان کردووەو کاریگەری بەرگری هێشتا جێگە پەنجەی خۆی لەسەر بیروڕاکانیان بەجێهێشتووە، چ ئەگەر هاتوو ئەوانە چەپ بن یاخود ناسیونالیستی کوردی بن ، بەتایبەت ناسیونالستەکوردیەکان ئەو تیژبەندیەیان پێوە دیارە.

لێرەوەگەر بێنەوە سەر مەسەلەی ڕوونکردنەوەی شێوازی کارکردنی ڕۆشنبیرانی سیاسی کوردی و عەرەبی دەتوانین بەم شێوەیە بیربکەینەوە، و ڕووداوەکانیش ئەو وێنازەدکردنەمان زیاتر دەسەلمێنێ ، بۆنمونە ، سیاسی کوردی فێرە ئەوەبووە هەموو تێزەکانی خۆی بە زەبر و هێزە پابەندبکات، سەیری هەموو هێزێکی سیاسیش دەکات لەو ڕوانگەیەوە، بەمانای ئەوەی لەنێو تەحالوفاتەکاندایە ئەوەیە کەقسانی لەگەڵدا

دەکات و مامەڵەی لەگەڵدا دەکات وەك واقعی حاڵ، کێ لەدەرەوەی ئەو تەحالوفاتانەیە جێگەی سەرنج نیە !، هەر کاتێکیش بوو بەهێزێك و هاتە نێو کوتلەیەکەوە سیاسی کوردی مامەڵەی لەگەڵدا دەکات، بەمانای لەکاتی نەبوونی هێز و نفوزی سیاسیدا حسابیان بۆ ناکات و بەمەترسیان تێناگات، کەچی کەتۆزێك دێنە پێشەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن، بازیاتر نمونەیەکی زۆر سادە بهێنمەوە، زۆربەی ئەندامانی حکومەت ومەجلیسی حوکم بەعەلاویی بڕیاردەر لەحکومەتی عێراقیشەوە، لەنێو هەناوی شۆڕشی کوردیدا پێگەیشتوون و شوێنایەکیان بۆ خۆیان پێکهێناوە، چەلەبی ئەوەندەی نانی کوردی خواردووە ، ئەوەندە لەنێو ئەمریکادا نەماوەتەوە، بەمانای هەمووومان ئەمانەمان دەبینی کەباسیان لە مافی کوردی دەکرد و کوردستانیەتی کەرکوك و ئیدانەی تەعریب و تەبعیسیان دەکرد ،لەکۆنگرەی سەلاحەدیندا دانیان بە بڕگەگرنگەکاندا نا ، کەچی لەدوای ڕوخانی سەدام یەکەم کەس کەدژی قانونی ئیدارەی دەوڵەتی عێراقی بوو ،چەلەبی بوو!. ئایا دەبێت کێشەکە لەمەسەلەی خیانەت و دڵسۆزیدا لێکبدرێتەوە؟، یاخود دەبێت بەشێوەیەکی دیکە ئەم ئەزمونانە چەند تێگەیشتنێکمان پێبەخشێ لەمەڕ جەوهەری ڕۆشنبیرانی تەقلیدی عەرەبی؟!،بێگومان پرسیارەکە لەمەڕ جەوهەری ڕۆشنبیری عەرەبیە پاشان ڕۆشنبیری/کلتوری عەرەبی خۆیەتی.

ئێمە سەردەمانێکە ئەوەندەی گرنگی دەدەین بەمامەڵە و تەحالوفات بەستن ، ئەوەندە گرنگی نادەین بەداڕشتنی گوتارێکی سیاسی کوردی کەئێمە لەوانی دیکە جیابکاتەوە، بەهەمان شێوەش لەنێوان حزبەکوردیەکانیش هەمان کێشە هەیە، گەر هەریەکێیان بدوێنی وەکو ئەوی دیکە دەوێت ، هەمووان لە گشتگیری و عمومیاتی سیاسیدا نقومبووین، بەشێوەیەك ئەو پرسیارەی کەئێستا خەڵکی کوردستان وهەموو چاودێرێکی سیاسی بەویژدان دەیکات ئەوەیە ن ئەی کەواتە ئەم دووحکومەتە بۆچی هەیە؟، گەر ئێمەش فیدرالیەتی پارێزگاکانمان پێ قبوڵ نەبێت، ولەسەر ئاستی تیۆری ڕەتی بکەینەوە ، ئەی بۆچی لەسەر ئاستی عەمەلی و واقعی ئێمە یەکەم هێزین لە عێراقدا پێش دەرچوونی یاسای فیدرالیەتی پارێزگاکان ، ئەو یاسایەمان بەعەمەلی پراکتیزە کردووە!!.. ئەمەیە جیاوازی نێوان مامەڵەی سیاسیانەو کلتوور بەهەموو مانا سیاسی و فەرهەنگیەکانیەوە.ئەمەیە دژەکاری سیاسەتی کوردی

کەخەنجەرێکی دووبڕە وامان لێدەکات دۆزی کەرکوك ببێتە قوربانی ئەو دژەکاریەی نێوان مامەڵەی سیاسەنەو و کلتووری سیاسیانە ، بەمانایەکی دیکەوە غیاب و ئامادەنەبوونی کلتوورێك بۆ سیاسەت، دەموچاوێك بۆسەلماندنی لێرە بوونی کوردی دیاردەیەکی زەق و ئاشکرایە،بێگومان ئەمە دوای ئەوە دێت کەلەکوردستانی باشوردا، کورد هەنگاوێکی خوێناوی و پڕکێشەی کێشەی شەڕی بوونی خۆی کردووە و لە پارچەکانی دیکەش هێشتا ئەو شەڕە بەردەوامە ..

بانمونەیەکی دیکە بهێنمەوە لەسەر شێوازی کارکردنی ڕۆشنبیرانی عەرەبی و خۆکردنیان بەدەسەلاتدا لە دەرگایەکی دیکەوە، کەلەوانەیە لەچاوی هەندێك سیاسەتمەداری کوردیەوە ، دەرگای پشتەوەی دەسەلات بێت ، بۆنمونە عەرەبێکی عێراقی پێش ئەوەی بێتەوە نێوگەمەی سیاسی و بەتایبەت دەسەلات ، وەکو هەموو ڕۆشنبیرێکی سیاسی سەیری جولەی هێزەکان دەکات لە گۆڕەپانەکە، بەلام پێش هەموو شتێك بەرنامەیەکی ڕوون و ئاشکرا بۆخۆی دادەنێت ، جێگیرەکان (الپوابت) ی قەومی و ئاینی لەلا ڕوونەو گەر نەشتوانێت بەئاشکرا دەریانبڕێت ئەوا تەسریحێك نادات بەتیژی دژی ئەو جێگیرانە بێت . ئەوان سەرەتا بیروڕاکان دادەڕێژن پاشان دێنە نێو مامەڵەوە، مامەڵەش لەسەر مەسەلە مەبدەئیەکان ناکەن، بەمانای نالێن بامامەڵەبکەین و بێینە نێو دەسەلاتەوە پاشان قەوارەیەك دەدۆزینەوە بۆ گوتاری سیاسیمان، ئەوان بەئاسانی بیر لەدەمارە هەستیارەکانی کۆمەڵگەی عێراقی عەربی دەکەنەوەو دێنە ناوەوە، بەخشکەیی جانتاکانیان لە مەنفای ئەوروپی وئەمریکایی دەپێچنەوە و بەرەو بەغدا یاخود نەجەف و کەربەلا ملی ڕێگە دەبڕن، ماوەیەکی کورت نابات کۆمەڵێ تەسریحاتی ئیستیفزازی و سوژن لێدەر دەدەن ، یاخود دژ بەئەمریکاییەکان لێدوانی ڕۆژنامەنووسی دەڵێن و لەکۆتایدا بەداخەوە لەلایەن حزبەکانی نێو مەجلیس و ئەمریکایەکانەوە ڕازیدووەکرێن و دێنە نێو گۆڕەپانەکەوەو ڕۆژنامە دەردەکەن و ئاوەها لەتەنیشت هەموو ئەوانی دیکە دادەنیشن و بەردەوامی دەدەن بەگەمەی سیاسی خۆیان. حوسێن مۆزانی کە ڕۆمانووسێکی عێراقی کەوەرگێڕێکی بەتواناشە لەزمانی ئەڵمانیەوە بۆ عەرەبی، باس بەوە دەکات کەزۆربەی ئەندامانی حوکمەتی عێراقی لە بێکارەکانب ئەوروپابوون و جانتایان پێچاوەتەوە بەرەو بەغدا. لەنوسینێکدا سەری دەسوڕمێت لەوەی کەئەمانە بوون بەبڕیاردەری گرنگ لە

دیاریکردنی چارەنوسەکان!، ئەمە وێنەیەکی دیکەمان پێشکەشدەکات لەمەڕ شوێنای رۆشنبیرە مەسلەکیەکانی عەرەب، چاوخشاندنێك بە مێژووی کەسی ئەو سیاسیە عەرەبە ئێراقیانە ، زامنی چەندەها نمونەی زیندوون. کەواتە کێشەکە لەکوێدایە ؟ ، بۆ ئەوانە رۆشنبیرانی عەرەب، سەرای ئەوەندەی مێژوویەکی دوورودرێژیان نیە لەکاری سیاسی ، تەنانەت کلتوریش ، هەر وەك حوسێن مۆزانبی باسی دەکات، ئەوەندە زیتەڵەن ؟. ئێمەش سەرەرای ئەو هەموو توانا و ئیمکانیەتە ئەوەندە سست وتەمەڵین؟!.

دیارە وەڵامدانەوەیەکی تەقلیدی هەیە کەرۆژانە لەسەر ماڵپەرەکان دەیبینین و گوێمان لێیدەبێت، ئەویش تاوانبارکردنی هەردوو حزبە گەروەکەیە و یەکنەختستنی دوو ئیدارەکە، دیارە ئەمە وەك هەنگاوێکی سەرەتایی تارادەیەك راستە، بەلام ئەمە هەنگاوێکی سادەیە گەر هاتوو کرۆکی کێشەکە دیاری نەکەین ، من پێموایە کێشەکە لەئەقڵیەتی سیاسی کوردیدایە ، ئەویش نەبوونی کلتوورێکی سیاسیە کەسیاسەت وەك بیرورا نەمێنێتەوە بەڵکو بچێتە ئاستەکانی جێبەجێکردنەوە، بۆ ئەوە دیارە پێویستمان بەشەفافیەتێکی زۆر فوندەمێنتاڵ هەیە بۆ ئەوەی بتوانین ماڵی کوردی رێکخەینەوە و زۆرانبازیەکان ئاراستەخوازبکەین ،چ لەسەر ئاستی نێوخۆی کوردی و پاشان لەسەر ئاستی دەرەکی لەگەڵ عەرەب ومیللەتانی دیکە، بەمانای پێکهێنانی ئالیەت و میکانزمێکی کارکردنی هاوبەش لەسەر خاڵە بنەرەتی و جێگیرەکان ، عەرەب گووتەنی سەوابتەکان. یەکەم هەنگاوی خۆشکردنی زەمینەی ئەو کلتووره هەوڵدانە بۆ پێکهێنانی کایەك و نێوەندێکی جولاوە بۆ بیروراکان و گەیشتنە بەمانای بوونی (گوتارێکی ئەقلانی سیاسی) ، گوتارێك لەئەنجامی گفتوگۆیەکی هەمەلایەنە و بەشداری هەموو لایەنەکانی کۆمەڵگەی کوردی پێکهاتبێت، گوتارێك زامنی ئەوە دەکات سەرەتاکانی رەنگرشتنی هێڵی ئاسنینی شێوازی گەمەی سیاسیانە بێت لە نێو هێزەکوردیەکان و تاکانی کۆمەڵگەی کوردی .

ئەم سەرەتایە پێك نایەت گەر هاتوو هەمووان بەشدار نەبین لە دارشتنی وەرەقەیەکی گشتی چارەنوسی ، چارەنوسێك لەسەر بینچینەی گفتوگۆ پێك بێت، لێرەوە چەمکی یورگن هابرماز بەکاردەهێنم کە باس لە (دەسەلاتێکی کۆمۆنیکاتیفی) دەکات ، بەکوردی یەتی (دەسەلاتێکی گفتوگۆخواز و پەیوندخواز) ، هابرماز ئەمە بەمەرجێکی سەرەکی دەبینێت بۆ چاودێری کردنی (دەزگاکانی دەوڵەت و جێبەجێکردنی یاسا) ،

بەبێ بوونی (قەناعەتێکی گشتی) کەئەویش بڕوا بوونە بە دیموکراسی وپرنسیبەکانی، بەبێ ئەو قەناعەتە هاوبەشە ، ناتوانین بچوکترین کێشە لەماڵی کوردیدا چارەسەر بکەین ،ئەگەر هاتوو هەر دوو ئیدارەش یەکبگرێتەوە. مەترسی رۆشنبیری تەقلیدی عەرەبی بەمەسلەکیەکانی نێو دەزگادەوڵەتەکانی دراوسێشەوە، کەلە پشت هێزە ئیسلامیەکانن و ماددی ومەعنەوی یارمەتیان دەدەن،مەترسیەکی گەورەیە بۆ سەر کورد ومەسەلەی کەرکوك. بێگومان نابێت ئەوە لەبیر بکەین کە دووکەناڵی گەورە و بەتوانای وەك جەزیرە وعەرەبیەیان لە پێناوی ئەواندا، رۆشنبیرە مەسلەکیە ناسیونالیستەکان، خراوەتە گەڕ. کەناڵی عەرەبیە ماوەیەکی کەم بەر ەستپێکردنی شەڕی عێراق کرایەوە، ئەوان پێویستیان بەوە بوو ئەو بەرەیە ەرۆشنبیرانی ناسیونالست وقەومەجی وئیسلامیست بەهێز بکەن کەدوای ڕوخانی سەدام ڕژێمەکەی بەلاوازی سەردەردێنن ، ئەوان مێژوویەکیان بۆ پێکدێنن کەلەبنەڕەتەوە ناوەنی نین، بۆنمونە فەقێیەکی وەکو ئەحمەد شیبانی ئەوەندە زلکراوە کەئێستا ەداهاتوودا ئەگەری ئەوەی لێدەکرێ لە پەنا هەر سیاسیەکی جیدی کورد وئێراقی نیشێت!. بۆ جەنگان دژی ئەم تەوژمە ناسیونال ئیسلامیە، دەبێت کورد خۆی لەژێر ایتڵی کلتووریکی دیموکراسیانە ڕێکبخاتەوە، لەبەر ئەوەی ئەوە ساناترین پرنسیبی باسیە، کەبەبێ بوونی کلتورێکی دیموکراسی مەحاڵە دیموکراسی وهەڵبژاردن نجامێکی دروستی هەبێت.

لەوانەیە یەکێك بپرسێت ئەمانە هەمووی چ پەیوەندیەکی هەیە بە ڕۆشنبیرانی رەب و دۆزی بەکوردستانیبوونی کەرکوکەوە؟!،بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دەتوانین چەند خاڵێکی کورت وچڕ سەرنجەکانمان بخەینە ڕوو، یەکەم: هەموو کترناسینێکی ئەوی دیکەن بەبێ خودناسینی خودی خۆمان ، یەکتر ناسینێکی ەواوە، بەمانای گەر دیدارەکان تەنها تەئکیدکردن بێت لەسەر مەسەلەگشتیەکان، ا لە ئاهەنگێکی یەکتر ناسین نەبێت هیچی دیکەی لێدەرناچێت!. نابێت ئەوەشمان یر بچێت کەزۆربەی ئەو ڕۆشنبیرە عەرەبیە، ئەوەندەی ڕۆشنبیری مەسلەکی و لیدین، ئەوەندە چالاك و ئەکتیف نین. بەداخەوە لەرۆژهەلاتی ناوەڕاستدا، ،رئەوەی دەلاقەیەکی گەورە هەیە لەنێوان دەسەلات و ڕۆشنبیر، لەبەر ئەوە لەو نە و تەنانەت لەبۆنەکوردیەکانیشدا، بەپێی ئەزمونی خۆم، هەمیشە ئەوانە

ان و گەڕەلاوژەکانیان..

بەناوی ڕۆشنبیرەوە قسان دەکەن و خۆیان بە دەسەڵات دەناسێنن کە لە ئاستی مەسلەکی و تەقلیدیەتدان، هەر بەهەمان پێودانگە دەبێت بڵێین کە ڕۆشنبیری تەقلیدی ئەو مەترسیە بینادەکات لەسەر دۆزی کەرکوک و فیدرالیەت. ئەرکی دەسەڵاتی کوردی و دەزگا ڕۆشنبیرەکانی کوردی ئەوەیە ڕۆشنبیرە چالاک و ئۆرگانی و (تیژڕەوەکان ) بدۆزنەوە بەکوردو عەرەبی و تورکمانیەوە، ئەوانە تۆوی پێکهێنانی کلتووریکی دیموکراسین وخاونی بەردەوامین وئەوانەن کە بڕوایان بەسکولاریزم و عەلمانیەت هەیە ، نەك ئەوانەی لە کلتووری عەشیرەت و عروبەی تەسکبین ڕیز پەڕیان نەکردووە. دووەم: مەسەلەی سووربوون لەسەر کوردستانیبوونی کەرکوك لەمەترسیدایە ، هەتاوەکو ئێمە (دەسەڵاتێکی کۆمۆنیکاتیف)مان نەبێت، بەمەرجێك زەمینەی ئەو دەسەڵاتە لەئارادیە و کاری لەسەر دەکرێت. مرۆی کوردی بە ئەزمونێکی تاڵدا تێپەڕیووە، ئەزمونی هەڵبژاردنێکی گەورە و کێشەی ناوخۆیشی زیاتر ئەو ئەزمونەی چاتر کردۆتەوە، ئێستا قەناعەتێکی هاوکۆیی پەیدابووە و زەمینەیەکی ئازاد هەیە کە بتوانین جارێکی دیکە بەشداری هەمووان زامن لە پرۆسەی دیموکراسیدا ، هەر وەکو گۆتم مەحاڵە زامنکردنی گەشەکردنی دیموکراسی بەبێ بوونی کلتووری دیموکراسی ، هەموو تێگەیشتنێکی پێچەوانە لەم بارەیەوە ، دووبارە کردنەوەی ئەزمونی حکومەتی یەکەمی هەرێمە. هەموو وەکەنار خستنی حزبێکی سیاسی یاخود هێزێکی کۆمەڵایەتی یاخود تاکێکی کۆمەڵگەی کوردی لەبەشداریکردن لە پرۆسەی سیاسیدا ، دوورکەوتنەوەیەلە کێشەی کەرکوك و درزبردنی ماڵی کوردیە. خاڵی سێهەم ئەوەیە : ئێمە ناتوانین فیدرالیەتێکمان هەبێت لەژێر سایەی دەوڵەتێکی شێوە ئیسلامیدا، یاخود بەشێوە عەلمانی و سێکولار، بەمانای هەموو موجامەلەیەك لەگەڵ هێزێك کەبڕوای بەعەلمانیەت و پرنسیبەکانی نەبێت کەگرنگترینیان جیاکردنەوەی ئاینە لە دەوڵەت و داڕشتنی یاساکانی ئەحوالی شەخسیە و پەروەردە بەبێ گەڕانەوە بۆ هیچ مەرجەعیەتێکی ئاینی ،( بێگومان لەگەڵ بەبەشدارکردنی ئەوان لە گفتوگۆدا و ڕۆڵی ئیستشاری و ڕاوێژکاری نەك بڕیاردەر). یەکێك لە هەرە پرنسیبە گرنگەکانیش ئەوەیە دەبێت ئەو هێزە بڕواهێنەربن بەدیموکراسیەت ، نەك شورا، بەتایبەت هێزە ئاینەکانیش ولەسەروو هەمووشیانەوە (سیستانی) یە بە نۆرمە ئاینی مەرجەعیەتیەکانیەوە، دۆزی کەرکوك پابەندە بەخەباتکردن بۆ پرنسیبەعەلمانیەکان،

هەموو لیدانیکی دیموکراسی لەسەر ئاستی کوردی لیدانیکە لە بەکوردستانیبوونی کورد.

خالی چوارەم ئەوەیە ، خەباتکردن لەسەرانسەری ئیراقدا بۆ دەولەتیکی عەلمانی و پرنسیبەکانی دیموکراسی ، نیزکیبوونەوەمان زامن دەکات لەو هیزە رۆشنبیرە عەرەبیە (چالاك و تیژرەوە)ی کەلەئامان جو بۆچووندا لەگەل هەموو تیزیکی هەمەلایەنی و پلورالیەت یەکدەگرنەوە، ئەرکی ئیمەدۆزینەوە و گرنگیدانە بەرۆشنبیری چالاك و تیژرەو نەك پشتئەستورکردنی رۆشنبیرە تەقلیدی مەسلەکیەکان.

لەکۆتایدا هەر ئەوەندە دەلیم دەسەلاتیکی کۆمەنیکاتیفی کوردی ، کردنەوەی دەرگاکانی گفتوگۆ بەکراوەیی و گواستنەوەی سیاسەتەوە لە شیوازی دیموکراسی بۆ پرۆسەی دیموکراسی خۆی ، زامنکردنی ئەو شەرە دووروودریژەبە کە مرۆڤی کورد لەو ناوچەیەدا لەبەردەمیدایەتی ، گریدانەوەی کلتووره بەمامەلەی سیاسیانەو بوونی گوتاریکی سیاسیانەی هاوبەش لەشیوەی بەستنی کۆنگریەکی فراوانەی هەمەلایەن لەسەر بینچینەی دارشتنی ( بەلگەنامەیەکی کارکردن ) و ئیلتیزام پیوەی ، دەرچوون لەو سیاسەتەی کەدەلیت [گووتن و نوسین و قسەکردن بۆ ئیوە و سیاسەت و مامەلە بۆ ئیمە] ، دەرچوون لەو جۆرە بیرکردنەوە سیاسیانەیە و پەیوەستکردنی سیاسەت بەرۆشنبیریی و رۆشنبیرانی چالاکەوە، زامنکردنی بەهیزکردنی جیگە پییەکانمانە لەسەر ولاتی خۆمان، شەری ئیستا وەکو بینیمان شەری بیروراو عەقیدە و سیاسەتە، شەریکە تەنها سیاسەتیك دەتوانیت بیکات کەکلتووریکی کاملی لە پشتەوە بیت.

تەواو

# سیستانی و ریفراندۆم و دیموکراسیەتێکی ئەقلانی

ئەو ئالۆزیەی لە نەخشەی سیاسی ولاتێکی وەك ئێراقدا خۆی گرێداوە، ئالۆزیەکە گەر لەئاستی سیاسیدا مەترسیدار بێت ، ئەوا لەسەر ئاستی کلتوری سیاسیدا هەرەشە لە زۆر پرنسیبی گشتی دیموکراسی دەکات، ئەو مەترسیەش لەهەمان وشەوە سەر هەڵدەدا کەلەژێر ناوی (دیموکراسی) خۆی شێوە باز دەکات.

پرسیارەکە ئەوەیە ئایا دەکرێت لە ژێر داواکردنی دیموکراسیەت و پیادەکردنی دیموکراسیەت ، هێزێکی نادیموکراسی و فوندەمێنتاڵ گەشە بکات؟، باشتر پرسیارەکەم فۆرمولە بکەم بڵێم : دەشێت لەرێگەی دیموکراسیەتەوە هێزێکی نادیموکراسیەت دەستەلات بگرێتە دەست ؟ بۆ وەلامدانەوەی ئەم پرسیارە و لە پێناو خوێندنەوەیەکی دیکەی کێشە هەنوکەییەکانی ئەمرۆی کوردستان و ئێراق ، هەوڵدەدەم لەگەڵ خوێنەری ئازیزدا، برێك بە دەنگی بەرز بیربکەمەوە.

یەکێك لەو کێشانەی کە سەرجەم بیریارانی دنیای هەژاند و هەموو نێوەندە سیاسی و رۆشنبیریەکانی دنیای خستە بەردەم کێشەیەکی چاوەروان نەکراوەوە ، کێشەی جەزائیر بوو، کێشەی سەرکەوتنی هێزێکی توندرەوەی نادیموکراسی،وەك بەرەی ئینقاز بوو کەلە دێسمبەری ١٩٩١ بەسەر پەیژەی میتۆدەکانی دیموکراسیدا ، کەهەڵبژاردنە ، هەڵگەرا، بۆ حوکم گرتنە دەست و کردنی کۆمەڵگە لە کۆمەڵگەیەکی مەدەنیەوە بۆ کۆمەڵگەیەك شوراو شەرع حوکمی بکات و یەکەم ئامانجی ئاشکرای هەڵوەشاندنەوەی سوستێمی دیموکراسی و مەدەنی بوو لە جەزائیرد. ئەوەی کەئەو هێزە دەیوویست پیادەی بکات تێکشکاندنی هەموو نەشونمایەکی دیموکراسی بوو لە کۆمەڵگەی جەزائیریدا، بەمەرجێ خۆیان وەك بەرەی ئینقازی جەزائیری لەرێگەیەی ئەوجۆرە نەشونما دیموکراسیەوە ، مومارەسەی شەری هەڵبژاردنیان کرد و شەری هەڵبژاردن و دەنگدانیان بردەوە!!. کەس ناتوانێت بە ئیسلامیەکی ئینقاز بڵێت: تۆ بە زەبر هاتوویت ، نەخێر ئەو بەهەڵبژاردن هات و مەشروعیەتی دیموکراسی و مافی دەنگدان بەتەواوەتی مومارەسە کرا ، ئەمان بەزۆرینەی دەنگی میللەتی جەزائیری دەنگیان هێنا !!، ئەمەش کرۆکی کێشەکەبوو ،

ئەوان دژە پرنسیبی دیموکراسی نەبوون لەممارەسەی حوکم گرتنە دەست ، بەلام وەك خودی خۆیان و بەرنەمەیان ، جەبهەی ئینقاز بڕوای بە دیموکراسی نەبوو ، شورا ،شەرع، ئەمر و نەهی ئیسلامیانە و دارشتنەوەی کۆمەلگە لە ژێر زەبری شمشێر لەسەر مۆدێلی ئێران و ئەفغانستانی تالیبان پرۆژەی داهاتووی ئەوان بوو. چیرۆکەکە لەڕووی کلتووری دیموکراسیەوە ئالۆزتر بوو کاتێك هێزێکی عەسکەری بەزەبری چەك ئەوانیان کردە دەرەوەی بازنەی گەمەی سیاسی و ئەندامەکانیان لەجیاتی ئەوەی پۆستی گرنگ لە حکومەتی جەزائیردا بگرنە دەست توندکرانە زیندانەوەو بێبەش کران لەمافی ممارەسەی سیاسیانە و دەسەلات، کەمافی سروشتی خۆیان بووا. بەو شێوە جەبریە هێزە سیاسیە مەدەنی و شێوە دیموکراسیەکان لە جەزائیر لە سیازدەی یانواری١٩٩٢ لە ڕێگەی جەنەرالەکانەوە،جارێکی دیکە شەمەندەفەری سوستێمی دیموکراسیان خستەوە سەر هێلی ئاسنینی خۆی!!. ئەمە چەندە لە ڕووی سیاسیەوە مەشروعیەتێکی هەبوو ، دەئەوەندە لەڕووی کلتووری دیموکراسیەوە چەندەها کێشەی فیکری هێنایە سەر ئاستی گفتووگۆ .

ئەوەی لەسەرەوە ئاماژەمان پێدا بەهەمان شێوە بەسەر ئەزمونی نازیەتدا پراکتیزە دەبێت، هیتلەر کە پیاوێکی نەخۆشی نیمچە نەخوێندەوەار بوو بەهەلبژاردن هاتە سەر حوکم ، نازیەت ( ناسیونال – سۆسیالیزم ) بەزۆرینەی دەنگ و و بەتەجروبەیەکی پەرلەمانی هاتنە سەر حوکم، نەکلاشینکۆف و نە میلیشیا و نە بەهیچ شێوەیەك زەبرێك لە پشتەوە هەبووە کە بەزۆر و ساختە دەنگبهێنن. ئەمەش کرۆکی کێشەکەیە کاتێك گروپەیەك ئامانجی زەوتکردنی ئازادی کۆمەلگەبێت و دژە دیموکراتی بێت لەڕێگەی پرۆسەیەکی دیموکراتیانەوە بێتە سەر حوکم.

لێرەوە گەر ئەم کێشە فیکری و تیۆریانە پابەند بکەینەوە بە بارودۆخی کورستان و ئێراقەوە دەتوانین لە فینۆمین و دیاردەی [ سیستانی ] تێبگەین ، وەك سروشبەخشێکی جیاواز کە دەیەوێت لە ڕێگەی هەلبژاردنی دیموکراتیەوە بگات بە ئامانجێکی نادیموکراتی ، کەئەویش لە بنەمادا هەولدانی مەرجەعیەتێکی ئاینی – شیعیە بۆ ڕێگەگرتن لە لەدایکبوونێکی قەیسەری ماندووی کۆمەلگەیەکی مەدەنی – ڕیکۆلۆنیالیزە یاخود دووبارەکۆلۆنیالیکراوی چاوەڕوانکراو، بەهەمان شێوەش پان عەرەبیزمی ئێراقی گرەویی داهاتووی خۆی لەسەر هەلبژاردنێکی ئاوەها بینا دەکات .

کێشەیە کاتێك هێزێکی دژ بەدیموکراسی و ئازادی دەیەوێت ئازادی بکاتە کەلێنێك و لێوەی بێتە نێو ژووره تاریکەکانی دیسپۆت و چەوساندنەوە. فەتوای ئەم دوایەی سستانی لەبەئەنجامدانی هەڵبژاردنێك لە ئێراقدا لەسەر بنەمای پسوڵەی خواردن دابەشکردن، فەتوایەکە بەڕێز دکتۆر نوری تاڵەبانی چەند لایەنێکی گرنگی کێشەی یاسایی و سیاسی ئەو فەتوایەی دیاریکردووە کە خوێنەر دەتوانێت زۆر خوێندنەوەی خۆی لەسەر بینا بکات و پێوویست بەدووباره کردنەوە نیە. ئەوەی کە من دەمەوێت باسی لێوە بکەم مەترسی ئەو کلتووره سیاسیەیە کە لەداهاتوودا گەمەی سیاسی لەم وڵاتەدا هەڵدەسوڕێنێ ، ئەوەی لای من گرنگە پێکهاتەی چەند ڕیتواڵ و کەشیگەرایەکی سیاسیانەیە گەر ئێستا لەژێر ناوی برایەتی و تۆلەرانس و لێبوردن و دیموکراسیەتی مافی هەڵبژاردنەوەرێگەی پێبدەین ،ئەوا ئەوەی داهاتوو نیو سەدەی پێویستە بۆ ئەوەی ئەنجامەسلبیەکانی بنەبڕبکات و یەکلای بکاتەوە ، دیاره ئەرکی هەمووانە ڕێگرەکان لەبەردەم ئەوەکانی داهاتوو کەمکەینەوە نەك بەمیراتی کێشەی تازەیان بۆ جێبهێڵین !!.

لەم گۆشەنیگایەوە کێشەی من لە گەڵ ئەو مامەڵە سیاسیانەیە کە لەداهاتوودا دەبێتە پرنسیبی تەقلیدی مامەڵە لە نێوان دەزگای حکومی و مەرجعیەتە دینیەکاندا ، لەهەمانکاتیشدا کێشەی من لەگەڵ ئەو ئەقلیەتەیە کە چۆن مۆراڵی مرۆیی و مافی سروشتی دەکاتە قوربانی مافێکی سیاسی و ڕۆحانی مەرجعیەتێك پێیوایە هەموو تەفسیرەکانی دنیا لەوەوە سەرچاوە هەڵدەگرن.

بۆ ئەوەی زیاتر لە ئیدیەکانم نێزیك ببمەوە حەزدەکەم برێکی کەم لە چەند چەمکێکی فیکری ، بیریارێکی وەك یورگن هابرماز لەمەڕ سوتێمی عەدالەت نێزیك ببمەوە ، هابرماز باس لەدوو چەمکی گرنگ دەکات یەکەمیان فاکتەکان یاخود بەشێوەیەکی دیکە بڵێن ڕاستەیەکان و حەقیقەت دەگرێتەوە و دووهەمیشیان باس دانپێدانان دەکات بە حەقیقەت و فاکتەکان. بەشێوەیەکی دیکە Geltung دانپێدانان، وەك ئیعتراف پێکردن هابرماز لە گەڵ چەمکی فاکتەکاندا Faktizitaet بەکاریان دەهێنێ ، بۆ نمونە ڕاستە کەرکوك شارێکی کوردیەو فاکتێکی مێژوویە، بەڵام دانپێدانان و ئیعترافکردنی ئەو دانیشتووە دێرینانەی ئەو شاره لە ڕووی مۆراڵ و ئەقڵانیەتەوە پایەکەی گرنگی سەلماندنی ئەو فاکتە مێژوویە.

لەم نێوەندەدا بۆ ئەوەی بتوانین ڕاستیەکان بسەلمێنین پێویستمان بە سوسیتمێکی بیرکردنەوەو دەزگای کۆمەلایەتی هەیە بۆ ئەوەی ڕاستەیەکانی ئێمە و ڕاستیەکانی ئەوانی دیکە بگەنە ئاستێکی گونجاندن لە گەڵ یەکتری و دژبەیەکدی نەوەستنەوە.
لەم گۆشە نیگای فاکت و دانپێدانانەوە، گەر دیموکراتیەتیەت ڕێگەبدات مەرجعیەتێکی وەك سیستانی وەك فیگورێکی سیاسی ڕۆحانی باس لەخۆی بکات و فاکتەکان بەوشێوەیە تەفسیر بکات کەخۆی دەیەوێت ، ئەوا نابێت ئەو پرسیارە نەکەین ، کە تاچەندە ئەو وەك بەشێك لە واقعێکی کۆمەلایەتی ئێراقی مافی هەیە یاسا و دەستوور ئیلهام بەخش بکات و ئەمرو نەهی دابەش بکات ؟ ، ئەوەندەش کەقسەی ئەو وهەموو هاولاتیەك بەیەك ئاست وەربگرین، دەبێت ئەو ڕاوبۆچوونانە بەراورد بکەین لەگەڵ گونجاندن و دانپێدانانی ئێمەش و بەراوردکردنی لەگەڵ فاکتەکانی دیکەدا کەلەسەر ئەرزی ئەم ولاتەدا دەژین و بیروڕای خۆیان هەیە، بەئاوڕدانەوەیەکی ساناش لە تەشکیلەی فرە نەتەوەیی وئاینی و مەزهەبی کۆمەڵگەی ئێراقی ، دەبێت ئەو پرسیارە پێوانەییە بکەین، کە تاچەندە پێویستە ئەو فەتوایە بەهەند وەربگرین و تەنانەت وەك مەرجەعیەتێك سەیری بکەین ؟ گەر مەرجەعیەت ڕۆڵی فەتوای هەبێت ، کەواتە با کریست و دیانەکانیش و ئێزیدیەکانیش مافی تەسریحات و فەتوای لەو جۆرەیان هەبێت! ، مادامەکی ئەوانیش خاوەنی سەرچاوەگیری ڕۆحی ومەزهەبی خۆیانن، دەبوایە هەر لەسەرەتاوە ئەم خالانە لەلایەن سیاسی و سەرکرەکانەوە ڕوونبکرایەتەوەو گومانی خۆیان لەمەڕ ئەم جۆرە فەتوایە دەربڕیایە، نەك بەرەوپیری بچوونایە بۆ ڕەجالێکردن.
ئەم فەتوایە یەکەم فەتوا و دوا فەتوا نابێت گەر هاتوو لە ئێستاوە نەخرێتە ژێر گومان و پرسیارەوە ، ئەوا لەداهاتوودا هەموو نەتەوەو مەزهەب و گروپە سیاسیەکانی دەرەوەی مەرجعیەت پێوەی دەنالێنین. ئەمەسەیرکردنێکی ئەقلانی ئەو فەتوایانە کەدەبێت بەردەوام بخرێنە ژێر پێوانەکاری پرسیاری ئەقلانی .
ئەو هۆیانەی دکتۆر نوری تالەبانی ئاماژەی پێداوە لەڕووی یاسایەوە چەندە گرنگن ، ئەوەندەش لەڕووی ممارەسەکردنی دیموکراسیەت و کەشی دیموکراسی و دروستکردنی ترادیسیۆنی سیاسیانە لەم ولاتە گرنگی خۆی هەیە.
ئەی کەواتە چیبکەین؟ ، پێوانە چیە بۆ ئەوەی لە نێوان مافە سروشتیەکانی ئینسان و فاکتەکان و حەقیقەت لەیەکسانی و مافی ژیان و ئازادی لە گەڵ ئەو دەزگا یاسایی و

حکومی و ئایدۆلۆژیا جیاوازانە، هاوسەنگیەك دروست ببێت، بەتایبەت ئەو بۆچوونانەی کە دەیانەوێت جیهانبینی خۆیان بکەنە یاسایەك و پیادە بکرێت؟.
دیویکی دیکەی کێشەکە ئەوەیە کەهەموو ئەومەسەلانەی کەحەقیقەتە دەکرێت لە پرۆسەیەکی دەزگاییکردندا ( هەڵبژاردن ، داداگا، دەستوور و لیژنەکانی) ،لە نێوان چەند ئارگومێنتێکی زیرەکی چەند پارێزەرێکدا ( پرۆفیسۆر و پسپۆری تایبەت)بەوویستی هێزێکی نادیموکراسی دیسپۆتیدا فۆرمولەبکرێتەوە و ملی بابدرێت!، ، کەواتە دەکرێت ئەندامانی دەستووردارێژ لە ڕێگەی هەڵبژاردنێکی سەربەستەوە بەزۆرینەی دەنگ هەڵبژێرێن و ئەوسا ئەوان بە حوکمی دیموکراسیەت ئەوە لەدەستووردا بهۆننەوە کە سیستانی و مەرجەعیەتە ئاینیەکان دەیانەوێت!!.
پارێزەرە زیرەکانی مەرجعیەت، کەئەمانەش وردە وردە لە زۆر لاوە لەژێر تایتلی پسپۆری یاسایی و سیاسی و تەکنۆکراتدا دەردەکەون، دەتوانن فەتوای مەرجعیەتەکان لە شێوەی ئارگومێنت و حونجەتکاری یاسایی و سیاسی کە لەڕووی سیاسیانەوە بگونجێت لەگەڵ پرنسبەکانی دیموکراسیەت، فۆرمولە بکەن و هەوڵبدەن لە نێو ڕارەوەکانی پەرلەمان و جەنگی هەڵبژاردندا بیسەلمێنن!!. دەکرێت ئایەتوللا ئەعزەمی سیستانی لەداهاتوودا فەتواکانی لە شێوەی چەند یاساو ئارگومێنتێکدا وەپێچێ گەر نەتوانێت بڕیارەکانی دەزگای حکومی و پەرلەمانی داهاتوو هەڵوەشێنێتەوە ، ئەوا دەتوانێت بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بیوەستێنێ و تەگەرە بخاتە بەردەمی.
بۆ ئەوەی بتوانین ڕوونتر ئەم کێشەیە تاوتوێ بکەین دەگەڕێینەوە بۆ لای یورگن هابرماز و تێزی ئەو لەمەڕ بەکارهێنانی یاسا و دیموکراسیەت لەسوستێمی عەدالەتدا، هابرماز پێیوایە تاوانبار بوونی نابێت، ئەگەر پارێزەرەی زیرەك و شارەزا هەبێت، کەواتە [تاوان بوونی نیە بەڵکو پارێزەرەکان خراپ و نەشارەزان] ، ئەمە لایەنێکی تراژیدی گەمەی دیموکراسی و یاساییە کەزۆر ماف و تاوان دەشێت لەو پێچەدا جێگەی خۆی بکاتەوە و خۆی پەردەپۆشبکات.کەواتە چار چیە بۆ ئەوەی ئەم گەمە ناشرینە ڕوونەدات ؟، بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە پست دەبەستین بە هابرماز و دەڵێین پشت بەستن بە دیموکراسی لەسەر بنەمای [ گوتارێکی ئەقلانی] ، ئەوەی لە ژێر ناوی گوتاری ئەقلانی تێیدەگەین [نۆرمی مامەڵەکردنی هەموو بەشدارانە لە گوتارێکی ئەقلانیدا] ، ئەوەی لەژێر چەتری ئەم ڕستەیەدا تێیدەگەین بەشداریکردنی

هەمووانە لەسەر بنەمایەکی ئەقڵانی بۆ گەیشتن بە (تێگەیشتنێکی هاوکۆیی) ، ئەم جۆرە تێگەیشتنە هاوکۆیە ئەقڵانیە، ئەو دەستەڵاتەیە کە هابرماز لە ژێر ناوی دەستەڵاتێکی هاو پەیوەندی و هاوبەش ، دەسەڵاتێکی کۆمەنیکاتیڤ پێناسەی دەکات ، دەسەڵاتێکە لەسەروو هەموو مەزهەبیەت و قەومەچێتیەکی توندڕەوانەیە ، دەستەڵاتێکە تێگەیشتنی گشتی و بەشداری گشتی و گفتوگۆیی ئەقڵانیانە بنەمای هەڵسوڕێنەری بڕیارەکانێتی، ئەم دەسەڵاتە کۆمۆنیکاتیڤە بنەمای دەسەڵاتی دووهەم دادەمەزرێنێ کە هابرماز ئادمینستراتیڤ یاخود بەکوردی دەسەڵاتی بەجێهێنەر و دەزگایی پێناسەی دەکات، لێرەوە و لەم نێوەندەدا فەتوای کەسێك ـ سەرۆکێك ، هەر کەسێك بێت گەر لەسەر بنەماکانی گوتاری ئەقڵانی نەگونجاو بێت لەگەڵ دەسەڵاتی هاوکۆیی پەیوەندیدار ، فەتوا یەکە چەندە مافی دەربڕینی هەیە ، مەرجی بەجێهنانی زەحمەت دەبێت ، چونکە لەگەڵ هاوکۆیی ئەقڵانیەتدا ناگونجێت. گەر هەر حیزبێکیش بیەوێت لەسەر هێڵی پارێزگاری کردنی ئەقڵانی بێتەگەمەی دیموکراسیەوە ، ئەوا ممارەسەی ئەو ممارەسەیەکی مەشروع و لیگیتیم دەبێت ، گەر هاتوو ئەو کەسە سیستانیەکی مەرجیعیش بێت .

بەلام لەڕووی گوتاری ئەقڵانیەوە چۆن لە مافەکان تێدەگەین؟، بۆ وەڵامدانەوەیەکی سادە ، نەك فەلسەفیانەی ئەم پرسیارە، دەتوانین بڵێن هەموو مافە سروشتیەکان مافێکی ئەقڵانین،مادامەکی لەچوارچێوەی ئەقڵ و لۆجیکی سروشتیدا هەڵدەسوڕێت، بۆ نمونە مافی ڕادەربڕین ، مافی ژیانی کەسێتی و فەردانیەت ( ئیندیڤیدوال) ، مافی جەستەیی و سەربەستی سێکسی، هەموو مافەکان ڕەواو ئەقڵانین کاتێك ڕێگر نەبێت لە مافی ئەویدیکە و زەرەد بەوی دیکە نەگەیەنێت و بەلانس و هاوئاستەنگیەکی لەخۆ گرتبێت ،بۆ نمونە تۆ دەتوانینت ئاهەنگ بکەیت بەمەرجێك دراوسێکەت بێزار نەکەیت، ئەمە پرنسیپێکی ئەقڵانی سادەیە، هەمان ئەقڵانەتیشە دەبێت لە پێکەوە ژیانی نەتەوەکان و ئاینەجیاوازەکان و زمانەجیاوازەکاندا پیادەبێت، بەم پێیە و بەهەموو پێودانگێکی ئەقڵانی ، فەتوای سیستانی یەکەم: دژە هاوکۆیی و پەیوەندیداری گشتیە پێکەوە، دووهەم: وەك مەرجەعیەتێکی شیعی لەنێو خۆیدا تەعبیرە لە خۆی نەك لەهەموو شیعە، سێهەم : دژە مافی ئاین و مەزهەبەکانی دیکەیە کە ئیسلام وشیعیەت وەك جیهانبینیەك نابینین و موسڵمان نین ، چوارەم : فەتوای

سیستانی ، فەتوایەکە دژ بەدیموکراسیەتێکی ئەقڵانیە و دەیەوێت لە ڕێگەی دیموکراسیەوە خۆی ڕەوابەندی بکات.
زۆرینە وکەمینە گرەوی سیستانیە لە پێناو ڕێگەگرتن لە پێکهێنانی دەستورێکی تازەی فیدرال و مۆدێرن، ئەو تائێستا بەردەوامە لەسەر ئەو گروە پیسەی و پێی لەسەر دادەگرێت، لای ئەو زۆرینە پێوانەی دیموکراسی دادەدەڕێژن و گەر بەئەنقەست بێت یاوەکو لەنەزانینەوە بێت، سەرجەم سەرەتاکانی دیموکراسی لەبیر دەکات کە مەرجی یەکەمی بەشداری هەمووانە لە کلتورێکی دیموکراسیدا، بەمانای سەرەتا دەبێت دەستورێکی دیموکراسی هەبێت کە مافی هەمووان و ئەرکەکانی دەوڵەت و دەزگەکانی دیاری بکات و پرنسیپی گشتی سوستێمی سیاسی و مافەکان بچەسپێنێت، پاشان هەڵبژاردن ئەنجامبدرێ ، دەنا گەر هەڵبژاردنیش ڕووبدات ئەوا لە پەنجا بە پەنجاکەی ئێمە باشتر نابێت کە شەڕی ناوخۆی لێ کەوتەوە، بەم پێیەش گەر قسەی سیستانی جێبەجێبکرێت ، ئەوا کورد و سوونە دەچنە ژێر ڕکێفی زۆرینەی شیعی ، ئەمەش هەمان گرەوی جەبهەی ئینئتاز بوو بۆ گرتنە دەستی دەسەلات ، هەمان گەمەیە کە سیستانی و گشتکۆیی شیعە هەوڵدەدەن پیادەی بکەن لە ئێراقی داهاتوودا.
دیوێکی دیکەی کێشەکە ئەوەیە ، کەئەو کلتوورەی فەتوا دەردەکات هیچ جیاوازیەکی نیە لەو کلتووره سیاسیەی لەبەرامبەر ئەو فەتوایانە دەلەرزێت و خێرا ڕادەکات بۆ باوەشی سیستانی و داوای نەرمکردنەوەی ئەو فەتوایە دەکات، ئەمەش وەلامدانەوەی هەموو بەنێو مەجلیسی حوکم بوو !!. دیارە کاتێك مۆراڵ و ئەخلاقێکی سیاسیانە وون بێت و جیهانبینی سیاسیانە و شێمایەکی فیکری و چوارچێوەك بوونی نەبێت ئەوا هەموو مەلایەك و کالفامێکی ناسیاسی خێلەکی دەتوانێت سەرجەم ئەو دەزگایانە بخاتە لەرزینەوە.
مەترسی ئەم مامەڵەیە لەوەدایە گەر لەئێستاوە فەتواکان بەهەند وەرگیرێ ، ئەوا مەلاکان لە پاڵ دەزگا مەدەنیەکاندا دەبنە مەرجعیەتێکی یاسایی دیکە ، بەمەش دوودیاردە لەم کۆمەڵگە هەڵوەشێندراوەی (بەنێو ئێراقدا) بوونی نابێت یەکەم دیاردە، ئەقڵانیەتێك لە مامەڵەی سیاسیانە و دووهەمیش کەدەرئەنجامی سرووشتی یەکەمە ونبوونی دەزگای مەدەنیە.

لەم ڕووەوە دەکرێت زەبر بەکاربهێنرێت، بێگومان مەبەستم زەبری سیاسیانەیە و گوشار خستنە سەر ئەو هێزانەیە کەدژ بە پرنسیبەکانی مافە سرووشتیەکانی کۆمەڵگەن، بێگومان گەر وەڵامکی ئاشکرا وبێپەردەی توند بدرایەتەوە، ئەوا نەسیستانی و نەمەرجعیەتێکی دیکە ئاوەها بەئاسانی فەتوایان دەردنەدەکرد، دەبێت ئەو مەلایانە لەوە تێبگەن کە هێزێك هەیە دژیان دەوەستێتەوە، بەداخەوە دەبووایە حزبی کوردی ئەو دەستپێشکەریەی بکردایە، بەپێی ئەو ئەزمونە تاڵ وترشەی چەندساڵەی کەهەیانە، لەلایەکی دیکەوە نابێت ئەوە لەبیربکەین کە ئایەتوڵڵای ئەعزەمی سیستانی بۆکەسانی بێ قاعیدەی سیاسی و جەماوەری وەك پاچەچی و ڕوبەیعی و پان عەربیزمەکان کەلەژێر ناوی لیبرالیەت و مەلەکیەتی دەستوریدا خۆیان پێناسە دەکەن، وەرەقەیەکی گوشاری چاکە بۆ سەر هەموو هێزێکی سیاسی پێشکەوتوخواز ، لەهەمان کاتیشدا بۆ سەر کورد ، وەرەقەیەکە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ قەرەبووی ئەو ناڕێکخراوەیی و نەبوونی قاعیدە سیاسیەنەیان بۆ دەکاتەوە، لەبەر ئەوە سەیر نیە کە چەندە ئەوان لە ڕوویەکەوە بە سیستانی قەڵس بن لە ڕوویەکی دیکەوە بۆ ئەوان سیستانی پاڵپشتێکی ئەم قۆناغەیانە، هەر بۆ یە سەیر نیە لەگەڵ ئەوەی لەدەرکەوتن و خۆنیشانداندا وانیشانی ئێمەی دەدەن کە ئەو فەتوایانە باش نین ، بەڵام لەهەمان کاتیشدا هەر خۆیان بە ڕاکردن بۆ بەردەمی قاپیماڵەکەی بەهایەکی سیاسی و پڕوپاگەندەیی بەخۆیان و سیستانی دەبەخشن و هەمیشە ئیحای ئەوەیان داوە بەکورد و مەسیحیەکانو نەتەوەکانی دیکە، کەسیستانی قورسایەکی گەورەی هەیە لە نێوەندەسیاسی و مەرجەعیەتەکاندا ، بەمەرجێ ئەوەی سەیری تەشکیلەی حەوزە بکات دەبینێت سەدرو حەکیم و خوئی و مەرجەعیەتەکانی دیکەش قورساییان هەیە و ئەو قورساییە دابەش بووە بەسەر ناکۆکیە شاراوەکانیاندا، وە سیستانی ئەو قورساییەی نیە بەو شێوەیەی ئەوان و کەناڵی ئەلجەزیرە و عەرەبیەی ئیسلامیست زلی دەکەن. هێزە کوردیەکان لەهەموو هێزەسیاسیەکانی ئێراق ڕێکخراوتر و بەئەزمونتر و شانسی زۆرتریان لەبەردەمدایە، وەڵامدانەوەی نوێنەرە کوردەکان کاریگەریەکی گرنگی دەبوو بۆ وەستاندنی ئەو شەپۆلە مەزهبی و ئاینیەی دەیەوێت ببێتە دەزگایەکی کۆمەلایەتی وسیاسیی لە ئێراقدا ، کەبێگومان یەکەم کەس بەو ئاگرە دەسوتێت کورد وئەو حزبە کوردیانەی خۆمانن. بەسیفەتی ئەوەی لەیادەوەری مەرجعیەت و حەوزە

ئێمەی کورد، مەجوس و عەجەم و ئەهلی زیمەین ، نابێت ئەوەش لەبیر بکەین کە پان عەرەبیزم هەوڵدەدات گوتاری خۆی لە چەند دەروازەیەکەوە لە گەڵ مەرجەعیەتدا بکاتە یەك، کەواتە شەڕکردن بۆ عەلمانیەت و خەباتکردنی حزبەکوردیەکان بۆ جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەت و دەزگاکان وياساکانی ئەحوالی شەخشی و هتد... هەنگاوێکی گرنگە نێزیکمان دەخاتەوە لە یەکلاکردنەوەیەکی ئاشتیانەی کێشە هەڵواسراوەکانی وەك کەرکوك و سنووری کوردستان و گەڕانەوەی ئاوارەکان و زۆر کێشەی دیکە، ئەز پێمووایە نێزیکبوونەوە لە ئەقلانیەت و گوتاری عەلمانی و دوورکەوتنەوە لەو هەواداریەخێڵەکیەی نێوەندی حزبەکوردیەکان ، سەرەتای یەکەمی دروستە بۆ بوون بەنمونەیەکی پۆزەتیف لە ئێراقدا.

نابێت ئەوەش لەبیر کەین کەهەموو عەرەبی ئێراقی، مەرجەعیەت و حەوزەیان پێ باش نیە، بەتایبەت خەڵکانی ڕۆشەنبیر و نوسەر و شانۆکار و مامۆستایان و تەکنیکاران و زۆرینەی فەرمانبەرانی دەزگا بێلایەنە حکومیەکان ، هەمووان حەماسیان هەیە بۆ هەموو تێزێکی عەلمانی، سەیرم لێدێت حزبی کوردی مونافەسە دەکەن لەسەر دەستکەوتنی سۆزی سیاسیانەی ئەو هێزە شیعیانە و ئەوە لەبیردەکەن کەئەو هێزە شیعیانە لەدایکبووی هەڵچوونێکی سیاسی و کەفێکی سەر شەپۆلن، لە دوایداو لە مومارەسەی سیاسی داهاتوودا گرەویان لە سەر ناکرێت ، چ لەبەر ئەوەی زۆربەی جەماوەرەکەیان بە سۆزداری ئەم قۆناغە هەناسە هەڵکێشانە پشتگیری دەکرێن و چ لەبەر ئەوەی لەنێو خۆیاندا دابەشبوون بە سەر چەندەها تایەفەی ئاینی و مەرجعیەت و زۆرانبازی سەختیان لە نێوانیان هەیە ، لە داهاتوودا گەمەی خوێناوی نێوانیشیان چاوەڕوانکراوە . ئەمە جگەلەوەی هەموویان پشت بە ئێران دەبەستن لە ڕووی یارمەتی مادی و مەعنەویەوە، دەسەلاتی ئێرانیش خۆی لە قەیرانی ناوخۆ و دەرەوەدا گینگڵ دەدا، ئیدی نازانم بۆچی فەتوایەکی سیستانی ئەوەندە بەهەند وەربگیرێ !!.

شەڕکردنی سیاسی و فەرهەنگی لەگەڵ مەرجەعیەت و فەتواچیەکاندا گەر بەئەنجامیش نەگات لەڕووی پرۆتۆکۆلی سیاسیەوە ، ئەوا ترادیسیۆنی جەنگێکی درێژخایەنی فەرهەنگی و سیاسی لەلایەن هێزە کوردیەکان بۆ هەموو هێزە پێشکەوتووخوازەکانی ناوچەکە دادەمەزرێنێت کەپێویستیەکی سیاسی و کلتووریە بۆ بنیاتنانی کۆمەڵگەیەك لەسەر بنەمای ئەقلانیەت و زامنکردنی مافەسروشتیەکان بۆ

هەمووان. ئەو هێزە عەرەبیەی لەئێراقدا دژی فەتواچیەکانن ، گەر ئێستا شەرمن بن لە بەر ونبوونی ڕێکخراوەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی بۆیان، ئەوا لەداهاتوودا ئەوانە دەبن بەو هێزە و کەسبکردنی ئەوان باشترە لەو مەلایانەی کەوەك خانوی وەرەقەی قومار وان ، لەگەڵ تێکچوونی سوستێمی مەلاکانی ئێران ، ئەوانیش دادەڕمێن . ئەمەی باسمکرد شتێکە لە ئەقڵانیەتەوە نێزیکە، بەداخەوە هیچ هەڵوێستیەکی وەهامان تائێستا لە حزبەکوردیەکانی خۆمانەوە نەبینیووە وبەچاوخشاندنەوەیەکی خێراش بە ڕابووردیان موجیزەمان پیویستە بۆ ئەوەی شتی ئاوەهایان لێ چاوەڕوان بکەین، ئەوان تاوەکو ئێستا بە پێچەوانەی عەلمانی و ئەقڵانیە کاریان کردووە، ئەنجامی ئەمجۆرە کارکردنە پڕ هەڵە و خێڵەکیانەی ئێستا دەیبینین، کە ئەو هێزە حەوزەویانە نەك تەنها دانْ نانێن بە مافی کوردا بەڵکو بەئالیەتێکی پان عەرەبیز م و ئیسلامیزمەوە کار دەکەن.

ئێستا نێوەندێکە بۆ زۆرانبازی نێوان خواستەکان و لەهەمان کاتیشدا نێوەندێکیشە بۆ بەشداربوونی هەمووان لە مامەڵەی سیاسیدا کەلەئەنجامدا نۆرمی هاوبەش پێکدەهێنین ، ئەمە چەندە لە گوتاری دیموکراسیانەیەکی ئەقڵانی نێزیکمان دەکاتەوە ، ئەوەندەش زامنی ئەوەمان بۆ دەکات کەکێشە هەڵواسراوەکانیش لەنێوان یەکدیدا بەمەبەشتی پێکەوە ژیانی هاوبەشانەی ئارەزوومەندانە چارەسەرکەین، ئەوەی کەئێستا لە ژێر پەرەدەوە هەڵگیرساوە شەڕی مەلاکان و هێزە ئیسلامیەکانن لە ڕێگەگرتن لە دروستبوونی هەموو شێوە ژیانێکی مەدەنی . لەوانەیە لەهەموو ئەو ڕووداوانەی سەرنجیان ڕاکێشابم ئەو داواکاریەی چەند مانگێك لەمەوبەری حەوزە بوو لە بەسرە کە ئەو بەرنامە پەخشکراوەعەرەبیەکانی کەناڵە کوردیەکان گۆرانی تێدایە دژی ئەخلاقی گشتیە!!، ئەم داواکردنە لەپاڵ چەند داواکردنێکی سیاسەنەی دیکە جەختی لەسەر کرابوو، لەم خاڵەوە هەستدەکەین ئەو مەلایانە دەیانەوێت نموزەجی ئێرانی بکەنە مۆدێلێکی پیادەوە هەوڵدەدەن نەك بە بەشداری ڕاستەوخۆی سیاسیانە بەڵکو لەودیوو دەزگا سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانەوە خۆیان بکەنە مەرجەع و ئیلهام بەخش، بەکوردی وکرمانجی سوستێمی ئیمامەت بکەنە سەرچاوەی ژیانی ڕۆحی وسیاسی و کۆمەڵایەتی و یاسایی ، ئەمەش ئەو هۆکارە بوو وای لەباقر حەکیمی ڕەحمەتی کرد کە بەڕاستەوخۆ نەیدەوویست بەشداری بکات لەکاری سیاسەتدا ، ئەو دەیوویست لە سەر

مۆدێلی خومەینی لەپشت هەموو دەزگا سیاسی و ئیداریەکانەوە دانیشێت هێلی گشتی سیاسەت و دەستوور دابرێژێت و ناوبژیکاری گشتی بێت لەسەر مۆدێلی ئیمامی گەورەی جمهوری ئیسلامی ئێران.

تراژیدیا لەوەدایە کە مەرجعیەتەکان و حەوزە و ئیسلامیستەکان خاوەنی شێماو جیهانبینیەکی ڕوون و ئاشکرا و مەنهەجین ، بەڵام هێزە بەنێو سکولاریست و عەلمانی و دیموکراسیخوازەکان خاوەنی هیچ بەرنامەیەکی دیاریکراو نین و هەڕەمەکیەتێکی بێمانا لە تەرحە سیاسی و پەیمانبەستنەکانیاندا دیارە..

بەگەڕانەوە بۆ یورگن هابرماز، دەتوانین باس لەخاڵێکی گرنگی دیکە بکەین کەنێزکمان دەخاتەوە لە هەوڵدان بۆ گەیشتن لە تێگەیشتنێکی ئەقلانی بۆ کێشەکان، ئەویش ئەو مەرجەیە کە هابرماز باسی لێوە کردووە لەڕووی بەشداری یەکسانانەی هەمووان لە پێکهێنانی نۆرمێکی گشتی بۆ مامەڵە کردنی سیاسیانە، هابرماز پێیوایە بەشداریکردنێکی یەکسانی هەمووان بە کەمایەتی وزۆرایەتی لە دارشتنی دەستوورێك، یان بەڵگەنامەیەکی مێژووی ، بڕیارێکی چارەنوسی، مەرجێکی سەرەکی پێکهێنانی شێوازێکی ئەقلانیە بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ یەکتری ، سەرەتایەکی دروستە بۆ پێکهێنانی ئەو نۆرمە گشتیانەی کەسیاسەت و گەمەی سیاسەت بەگشتی لەداهاتوودا کێشە هەنوکەیی و مێژوویەکانی خۆی پێ تاووتوێ دەکات. بۆ من زۆر زەحمەتە هەندێك لەو حزبە سیاسیە کوردیانەببینم لە دەرەوی بازنەی بڕیارداندان، لەدەرەوەی گفتوگۆیی هەنوکەیدان، لەدەرەوی هەموو هاوبەشیەتێکی کوردیدان، ئەمەش زۆر حزبی وەك حزبی کۆمەنیستی کرێکاری و تەنانەت حزبە ئیسلامیەکوردیەکانیش دەگرێتەوە، من خۆم لەگەڵ هەردوولادا ناکۆکم و لەگەڵ زۆر بیروڕاکانیاندا یەکناگرمەوە، ئەگەر دژی نەبم، بەڵام کردنە دەرەوەیان لە بەشداری سیاسی بەو زەبرە و بەهێزی چەك و کەنارخستنیان نەك هەر دژە بەپرنسیبەکانی دیموکراسیەت ، بەڵکو مەترسی بەفوەدەمێنتاڵبوون و توندڕەویان، بەشێکی دەکەوێتە سەرشانی هەمووان، دیارە کەنارگرتنیان دەبێتە هۆی ئەوەی لەبەر هۆی ئایدۆلۆژیان و ڕاگرتنی تەرازووی هێزەکانیان پەنا ببەنە بەر تەحالوفات لەگەڵ ئەو هێزانەی کەدژە دیموکراسین و فوندەمێنتاڵن، بەشداری نەکردنی ئەوان لەکاری سیاسیدا دەبێتە هۆی ئەوان لەو

تەحالوفاتانەدا خۆیان ببینەوە، لەوانەیە لای زۆربەی خوێنەر سەیر بێت کەبڵێم ئەگەری تەحالوفکردن حزبی کۆمەنیست بە نهێنی لەگەڵ ئەو هێزانەی کەناوی خۆیان دەنێن (بەرگری) کەهەندێکیان کۆنەبەعسیەکانین و هەندێکیانیش ئەو عەرەبە توندڕەوە کوێرانەن هاتوون لەئێراقدا گۆڕەپانی شەڕی خۆیان درێژبکەنەوە، هەندێکشیان گروپەی ئەلقاعیدەن ، ئەگەرێکی شیاوە!! ئەمانە لەبەر ئەوەی دژی ئەمریکان و ئەنتی ئەمریکایین ، ئەگەری تەحالوفی داهاتوویان لەگەڵ حزبی کۆمەنیستی کرێکاری (گەر لەژێرەوە بێت و بەنهێنیش بێت) ئەگەرێکی چاوەڕوانکراوە، لەوانەیە سەیر بێت لای زۆربەی خوێنەری کورد کە زۆربەی بەنێو چەپی ئۆیرۆپایی و مارکسیەکانیش گرەویی گەورەی ئایدۆلۆژی و سیاسی خۆیان لەسەر ئەو گروپانە بنیات ناوە کەخۆیان ناو ناوە بەرگری ، ئیدی گەر نوسەرێکی وەك تاریق عەلی لە دوا کتێبیدا (بۆش لە بابیلۆن ) ئەو گرەوە بکات ، بەوەی هیوداره ئەو بەرگریە خۆی زیاتر ئۆرگانیزە بکات، ئیدی دەبێت ئیسلامیەك چی بڵێت!!.

لەوانەیە ئێستا خوێنەرێك بڵێت : کەواتە بابەعسیەکانیش بەنێوی بەشداربوونی یەکسانانە بهێنێنە نێو گفتوگۆکانمان و هەمووان لەم شاییە سیاسیەدا بەشداربن!!،

ئەز دەڵێم بەگەڕانەوە بۆ ئەزمونی جەزائێر و جەبهەی ئینقاز ، دەتوانین ئەو دەرئەنجامە هەڵکێشین ، بەوەی هەر گروپێك لە بەرنامە و پەیڕەو بۆچوون و جیهانبینیدا دژ بە پرنسیپی دیموکراسی و سکولاریزم بوو ئەوا بۆی نیە بەشدار بێت لە هیچ گفتوگۆ و کردەیەکی سیاسیانەی بڕیاردەردا، مەترسیدارە کاتێك من بەنێوی یەکسانی و ئازادی ڕێگەبدەم بە مەلایەکی سیاسی ، دوور لە هەموو پەیوەندیداریەك بۆ کۆمەڵگە و مافی سرووشتی مرۆڤەکان لەمومارەسەی ژیاندا، بێت و مەنهەجی خوێندن سەرتاپا بگۆڕێت بە مۆدێلێکی ئیسلامی ، گەر ئەمانە زۆرینەی دەنگیش بهێنن ، مادامەکی لەبەرنامەدا دژە دیموکراسین، ئەوا نابێت بەشداربن تاوەکو بەهەندێك لەو بیروڕایانەن دەچنەوە و داندەنێن بەو نۆرمە ئەقلانیانەی کە نۆرمی مافە سروشتیەکانی مرۆڤ و مۆڕالی گشتیە، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو بەکردەش ئەمە بەشەفافیەتەوە بسەلمێنن، بەداخەوە ئەم قسانەم شتێکی لە جەختکردن لەسەر زەبر تێدایە، بێگومان جەختی سیاسیانە، بەڵام زۆر جار بۆ ئەوەی بتوانین خۆمان لە

هەڕەشە بپارێزین نەك هەر دەبێت بەرگری بکەین ، بەڵکو دەبێت هێریش بەرینە سەر سەرچاوەی هەڕەشەکان.

دەتوانم بڵێم کە ئەقلانیەت (ڕاتسیۆنالیزم) تاکە کلیلی هاوبەشە ئەو دەرگاداخراوانەی کێشەکانمان لێ ناکاتە گرێ و لێمان ئاڵۆز نابێت، بەشداریکردنی هەمووان و قەناعەتکردنی هەمووان هەنگاوی دروستە، کەنارگرتنی ئەوانی دیکە (الاخر) بەبێ ئەوەی گفتوگۆیان لەگەڵدابکەیت و ئاڵتەرناتیفیان بخەیتە بەردەم و کۆمپرۆمیسی پێویست لەنێوان یەکتردا نەخرێتە بەر گفتوگۆ ، مەحاڵە هیچ هەوڵدانێك وەبەر بێت لەسەر بچوکترین کێشە کەبۆ نمونە کێشەی ئاوارەکانی شەڕی ناوخۆی هەولێر و سلێمانیە!!، بائێمە وەك کورد خۆمان لە نێوماڵی خۆماندا هەوڵبدەین کار بۆ ئەو نموزەجە ئەقلانیە بکەین بۆ پێکهێنانی ئەو نۆرمانەی کەلەداهاتوودا وەك ترادیسیۆنی مامەڵەی سیاسیانە زۆر کێشە لەسەر شانی نەوەکانی داهاتوو کەمدەکاتەوە.

گەر ئەو هەوڵدانەی ڕیفراندۆم و ئەو گوتارەی ڕێزدار مەسعود بەرزانی و یەکخستنی هەندێك لەبیروڕاکانیان لە ڕووی فیدرالیەت کە هێشتا لە سنووری شەرم دەرنەچووە، پێکەوەگرێیەدەینەوە ، ئەوا دەتوانین لە پرۆژەی ڕیفراندۆم و ئەکسیۆنەکانی دیکەدا ، ئەو ترس و گومانە ئاشکرابکەین کە ئێمە لە لەبەرامبەر هێزە حەوزەویی وپان عەرەبیزمدا چاوەڕوانی دەکەین ، لەهەمان کاتیشدا تاوەکو زوو نێو خۆی ماڵی کوردی پرۆژەیەکی کارکردنی سکولاریزەی لەبەردەمدا نەبێت و بەشداری هەمووان زامن نەکات لەو پرۆژەیەدا و لەسەر چەند تەوەرەیەك کارنەکات بە پرنسیپێکی گشتی هاوبەشەوە ، ئەوا مەترسی بوونی هەمووان بە چەند کوردێکی شۆفێنی توڕە لەئارادایە و مەترسیەکی چاوەڕوانکراوە!! ، مەترسی بزرکردنی هەموو ئەو ساڵە سوێرو تاڵ و ترشانە و دەستپێکردن لەو خاڵەوەی دەستمان پێکردووە، ئەگەری ترسناکن و لەبەردەمی ماڵەکانماندا هەڕەشە لە خۆمان و نەوەکانی داهاتوومان دەکات.

پێش ئەوەی باس ڕیفراندۆمێك بکەین کەهێشتا بەتەواوەتی لە جوخزی پرۆژەی حیزبێکی سیاسی ڕیزەپەڕی نەکردووە، دەتوانینی لەو چوارچێوەیەدا باس لەزۆر تەوەرەی گرنگی دیکە بکەین ، کەدەکرێت پرۆژەی ڕیفراندۆم یەکبخاتەوە لە گەڵ کارکردن بۆ سکولاریەت و پلورالیزم ، وەك سیستمێکی سیاسی فیدرالیەتێکی کوردی

چاوەڕوانکراو. بەلام پێش ئەوەی باس لەو مەسەلانە بکەم حەزدەکەم باس لە سەرسوڕمانی خۆم بکەم لەبەرامبەر بەهێند وەرگرتنی جیدیانەی ئەو پڕۆژەیە لەلایەن حزبی کوردی خۆیەوە کە گومانی ئەوە هەیە ئەو پڕۆژەیەی بۆ بەرخوردەی جەماوەری بێت نەك پڕۆژەیەکی جیدی بۆ فیدرالیەت!!، بۆ نمونە ، لە ڕێکەوتی ٠٦,٠١,٠٤ بەڕێز دکتۆر فوئاد مەعسوم لەگفتووگۆیەکیدا لەگەڵ کەناڵی جەزیرە زۆر لاوەکیانە باسی لە پڕۆژەی ڕیفراندۆم کردو بەڵکو ئیحای ئاوەهای دا بە جەزیرە کە گوایە کاری ئاوەها دوورە لە حزبەکەی ئەوەوە ، هەر وەك ئەوەی کارێکی نەشیاو بێت!! ، گووتی ئەوە کاری چەند کەسێکی دیکەیە دوور لە هێزە سیاسیەکان، بەکوردی و بەکورتی زۆر ئەو ڕیفراندۆمەی بچوك کردەوە و بەرگی پڕۆژەیەکی سیاسی و جەماوەری جیدی لێداماڵی، بەمەرجێك هەر حزبەکەی بەڕێزی و کوردسات و کەناڵە ئیعلامیەکانی و کۆمیتەکانی ڕیفراندۆم لە ئەوروپا و ماڵپەڕی تایبەتیان بۆ ئەم مەبەستە لە لایەن خۆیانەوە خستۆتە گەڕ!! گەر ئەمە دوور کەوتنەوە نەبێت لە لۆجیك و ئەقلانیەتی سادەی سیاسی دەبێت چ پێناسەیەکی دیکەی پێبەخشری!.ئەم کارە دژ بەیەکانە ئەو سیاسەتە کۆنینەیەمان دەهێنێتەوە بیر ، کە هەرچیەك ئێوە بیکەن ، ئێمە لەدوا ئەنجامدا بریار دەرین، ئێوە کاری خۆتان بکەن و سیاسەتیش بۆ ئێمە بەجێبهێڵن ، بەداخەوە ئەمە ئەزمونی عەرەبیشە لەهەموو کۆبوونەوەو کۆنگرە سیاسیەکانیان ، کەلەدواجاردا هەموو بیروراگۆرینەوەو بڕیاردانەکان دەبنەوە بەهەڵم و لەنێو ڕاراوەکانی دەسەلاتی سەرکردەکاندا پەرشدەبنەوە. بەداخەوە من چاوەڕێی ئەوەم لەم دکتۆرە بەڕێزە دەکرد کە بڵێت: ڕیفراندۆم مافێکی سرووشتی خۆمانە و گەیشتن بە ئێکەیشتنێکی سیاسیانە لە نێو خۆماندا لەشێوەی ڕیفراندۆم بێت یاوەکو هەر پڕۆژەیەکەوە بێت مادامەکی لە سنووری لۆجیکی ئەقلانی و دیموکراسیەت دەرناچێت، جێگەی پشتگیریکردنی هەمووانە ، چاوەڕێم دەکرد بڵێت کە ڕیفراندۆم لەهەر شوێنێکی ئێراقدا بێت جێگەی هاندانە مادامەکی لە چوارچێوەی لۆجیکی ئەقلانیدایە و لەدژی مافی کەسیش کارناکات. بەلام پێدەچێ عادەتی موجامەلەی هێزە نادیموکراسی و حەوزەوییەکان هێشتا پشتەوێنەی ئەو جۆرە تەسریحاتە کالۆکرچانەبن . کەهیوادارم لەداهاتوودا تۆزێك سیاسیانەترو لە کلتوورێکی فەرهەنگی سیاسیانەوە لەو مەسەلانە بڕوانرێ .

بۆ وەلامدانەوەی ئەوە ئەرگومێنتە لاوازەی کە دەڵێت: سیاسیانە نیە ئێستا باس لە پرۆژەیەکی مۆدێرنی فیدرالی خۆوویستی کوردی بکرێت و دەبێت دوابخرێ بۆ ئایندەیەکی دیکە. کەئەمەش چاوەڕوان دەکرێ لە هێزە سیاسیەکانی ئێمە، لەبەر ئەوەی ئەوەی ئێستا دەبینین تەنها ترسێکی گەورەیە لە توانەوەی دەسەلاتی حزبەکانیان گەر بچنە نێو بۆتەی ئێراقێکی دەوڵەتیدا ، دەنا ئەگەر پێشنیاری ئەوە بکرێت ، کە هەولێر و سلێمانی و دهۆك بەفیدرالی بمێنێتەوەو کەرکوکیش وەکو کەشمیری پاکستان بۆ چەندەها ساڵ بەهەڵواسراوەیی بمێنێتەوە ، تاوەکو دەستورێکی ئێراقی کاری تێدادەکات . ئەوا من پێموایە ئەو نیمچە چارەسەرە، ئەگەری پێشنیارکردنی هەیەی لەلایەن هێزەکانی دیکەی نێو مەجلیسی حوکم و چاوەڕوانکراویشە کە حزبە کوردیەکان پێی ڕازی بن !!، ئەمە لەسەرێکەوە دەسەلاتی ناوچەییان دەپارێزێ و لۆکالیەت بەپارێزراوی دەمێنێتەوە و لەلایەکی دیکەشەوە خۆیان دەپارێزێ لە هەموو شەڕێکی سیاسی و فیکری لە پێناو مەسەلە مێژوویەکانیاندا، کە شەڕی ئاوەها ئەگەری فەوتاندنی دەسەلاتیان لەنێو مەجلیسی حوکم و لەبەرامبەر ئەمریکاییەکاندا دەخاتە مەترسیەوە ، هەروەها لەبەر ئەوەی ئەمان خاوەنی پرۆژەیەکی بەرەنگاربوونەوەی سیاسیانەی جیدی نین سەبارەت بە مەسەلەی کوردی ، چ لەبەر ئەوەی ترسی ئەویان هەیە گەر بچنە نێو شەڕی ئاوەهاوە هێزە کوردستانیەکانی پارچەکانی دیکە و سەرجەم کوردی دەرەوە و ناوەوە پشتگیریان دەکەن و ئەمەش مانای ئەوەیە کەئەرکی زۆر چارەنوسازیان دەکەوێتە ئەستۆ و بەرەی جەنگی سیاسی و کلتووری لە سنووری شەڕی پارچەیەکی کوردستان تێپەڕ دەکات ، ئەمەش بەپێچەوانەی پیلانی ئەمانە لەمانەوەیان لەنێو چوارچێوەی سیاسەتێکی لۆکالەکی. دیارە ئەمە خەونی ئەوان نیە و مانەوەی ئەوان بەکوردی و کرمانجی هەر لەو سنوورە نەبێت هیچ ئاسۆگەیەکی دیکەی نیە و جگە لەوە خۆشیان توانای خۆیان باش دەناسن کەشەڕی ئاوەها بەو ڕابوردووە شێواوە و بەو تەشکیلە سیاسیانیەیان ناکرێت. ئەمەئەگەرێکی ترسناکە کەنابێت ئێمەی کورد ئەوەندە بەحەماسەوە لەو تەسریحات و تۆزە گوشارەی ئەم دواییە بڕوانین، ئەوان تەنها کێشەی ئەویان هەیە پەراوێز نەکرێن و ئەو پەراوێز کردنیان لەم دواییەدا بەدی کرد ،کە وەك لە گوتارەکەی ڕێزدار مەسعود بارزانیدا بەئاشکرا تەعبیری لەخۆی کردووە.

ئەڵتەرناتیفی فیدرالیەتی کوردستان بە هەولێر و سلێمانی و دهۆکەوە و هێشتنەوەی کەرکوك بەهەڵواسراوەیی ، مانای هەڵگیرسانی فیتنەیەکی بەردەوامە لە کەرکوکدا و کەشمیرێکی دیکە دروست دەبێت لەناوچەکەدا کەساڵانێکی زۆری شەڕو پێکدان و موئامەرە و پەراوێزکردنی کورد و ئەوانی دیکە لە خۆدەگرێ. دیارە (سیستانیەت)یش وەك دیاردەیەکی سیاسی مەترسیدار لەکەشمیری داهاتوودا ڕۆڵێکی خراپ دەبینێت، ئیدی ئەو شارە نەك هەر کێشەکەی بەهەڵواسراوەیی دەمێنێتەوە بەڵکو کێشەی دیکەی بۆ زیاد دەبێت، کەواتە چارەسەر چیە؟!.

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە پێویستە ئاوڕێك بدەینەوە لەو سەرچاوەی ترسەی کە کەمایەتیەکانی دیکەی نێو کەرکوك هەیانە بەرامبەر بەکورد وەك هێزێکی بەهێزی بەگژاچووەی حکومەتە ئێراقیەکان و قورسیایان لە ناوچەکەدا، بەلام چی وایان لێدەکات لە ئێمە بترسن؟! دەتوانم بڵێم ئەوەی کە وا لەوانی دیکە دەکا لە وپرۆژەیە ئێمە بترسن ئەو بیرکردنەوە خێڵەکیانە و مومارەسانەیە لە دوای ڕاپەڕینەوە تاوەکو ئێستا دژی یەکتری نواندومانە، ئەوان بینیان چۆن ئێمە بەهەزارەهامان لەیەکتری کوشتووە و ماڵ و حاڵی یەکترمان تالانکردووە و یەکترمان بێکەرامەت کردووە، ئەو ترسە لە دڵی ئەو کەمایەتیانەی نێو کەرکوك و کوردستان بۆتە ئەوەی بڕوامان پێنەکەن ولێمان بترسن!!، ئەوان بینیان کە لەکاتی کەوتنی بەغدا و هاتنە نێو موسڵ و کەرکوکەوە ئەو هێزانە چ کەم و چ زۆر تالانیان کرد وماڵیان داگیرکردو لە نێو خۆشیاندا لەسەر پارە و غەنیمە چ هەرایەك دروست بوو کە ماوەیەکی زۆر بووە هۆی ساردیەکی سیاسیانە لە نێوان ئەو هێزە سیاسیە کوردیانە.

لەبەر ئەم هۆیانە گۆڕینی ئەو وێنە ناشرینە ئەرکی یەکەمی هەموو هێزە سیاسی و ڕۆشنبیرانە لەم قۆناغەدا،ئەمەش بێگومان لە نێو خۆمانەوە دەستپێدەکات،( سەرنجی خوێنەر بۆ گوتارێکی ڕێبین هەردی ڕادەکێشم کەلە ژمارەکانی ڕابوردووی هاوڵاتیدا لەمەڕ مەسەلەی کەرکوك گفتووگۆی لەسەر کردبوو) ، گۆڕینی ئەو وێنە دزێوە بەوە دێت کە ئێمە لە پاڵ پڕۆژەی فیدرالی، باشترە سەرەتا باس لە پێکهێنانی دەستەلاتێکی کۆمونیکاتیڤی هاوبەش بکەین کەلەکەرکوکدا ئەگەری تاقیکردنەوەی هەیە ، لە پاڵ ئەوەدا دەکرێت ڕیفراندۆم بۆ بەرهەمێنانی [ بەڵگەنامەیەکی مێژوویی] تەرخان بکرێت، بەڵگەنامەیەك کەخەڵکی کوردستان لەسەر دوو مەسەلەی گرنگ بڕیار بدەن

یەکەمیان: مافی مێژوویی خۆیان بەسنوور وزمان و کلتوورەوە و دووهەمیان: مافی هەڵبژاردنی سوستێمێکی سیاسی کەبناغەی مامەڵەی کورد بێت لە گەڵ دەستووری داهاتووی ئێراق.

ئەز پێمووایە دەبێت سیکولاریزم، بەمانا باوەکەی عەلمانیەت کە لەجیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەتدا خۆی دەبینێتەوە و پلورلیزم کەئەویش هاوبەشی عادیلانەی سیاسیانە و کلتوورانەی هەموو حیزب و ڕێکخراو و نەتەوە و ئاینەکانی دیکە دەگرێتەوە لە کوردستاندا، بەردی بناغەی ئەو سوستێمە سیاسیە فیدرالیە کوردیە بێت . ئەم دووخاڵە گرنگە کە دەکرێت ووردەکاری دیکەی لێبیبێتەوە بناغەی ڕیفراندۆمێك دەبێت کەهاوبەشی هەمووان و یەکلاکردنەوەی هەموو کێشەکان زامن بکات. ئەمە زەمانتێکی مێژوویی دەدات بەکورد و ترسی نەتەوەکانی دیکەی سنووری کوردستانی مێژوویی دەڕەوێنێتەوە، کاتێك ببینن کەسوتێمی سیاسی لە کوردستانی فیدرالدا دان بە مافەکانیاندا دەنێت و پلورالیزم دەکات بەسوستێمی گەمەی دیموکراسی، ئەمەچەندە هێزە کۆنزەڤاتیف و سەدری و فەتواجیەکان تورە دەکات ، دەئەوەندە هێزە پێشکەوتوخوازەکان لیکنیزیك دەخاتەوە، بەتایبەت کاتێك ئێمە باس لە بەشداری هاوبەشی هەمووان بکەین ، بەدانپێدانانی بەیەکتری دەستپێبکات ، بە بەرهەمهێنانی بەڵگەنامەیەمی مێژویی لەلایەن هەموانەوە کە سنووری مێژوویی کوردستان دانپیێدابنرێ و ئێمەش دان بەو عەرەبانەدا بنێن کەلەکۆنەوە لەکەرکوك وکوردستاندا دەژین و تورکمانەکانیش بەهەمان شێوە ، ئەمە کلدانی وئاشووریەکانیش دەگرێتەوە، بەڵگەنامەیەکی مێژوویی ئاوەها گەر لە چوارچێوەی ڕیفراندۆمدا بێت، ڕێگرە لەبەردەم ئەوەی کەشمیرێکی دیکە لە ناوچەکەدا قوت بێتەوە.

دەبێت عەرەبی سونە و شیعەش لەوە تێبگەن کەمەبەستی ئێمە دەستگرتن نیە بەسەر نەوتدا و مەحرومکردنی ئەوان نیە کەسالاهایە پێکەوە لەژێر سوتمێکی دیکتاتۆریانەدا ناڵاندومانە و هاوبەشیمان زۆرترە وەك لە جیاوازی ، نەخێر ئێمە تەنها داوای دانپێدانی ئەو فاکتە گرنگە دەکەین ، کەپیێدەڵێن مافی مێژوویی ، ئەوەی ئەو ترسە دەڕەوێنێتەوە تەرحکردنی سوستێمی علمانی وپلورالیزمە لە داهاتوویی دەستەڵاتی سیاسیدا.

ئەم تێزانە دەمانگەیەنێتە تێگەیشتنێکی هاوبەش بۆ مەسەلەکان و لەوەشەوە بۆ پێکهێنان مامەڵەیەکی کۆمنیکاتیڤ. بۆ ئەوەی زیاتر لەم چەمکەی هابرماز تێبگەین دەتوانینی بڵێین دەسەڵاتی کۆمینکاتیڤ، یاخود مامەڵەیەکی کۆمنیکاتیڤی ، ئەو پەیوەندیە کە پابەندە بە کردەی [ ئەقلانیزەکردنی ژیان] لە هەموو بوارەکاندا، کاتێك ژیان ئەقلانیزەدەکرێت، سنووری نێوان ئاین ونەتەوەکان و کێشەکانیان تەنها لەچوارچێوەی ئیلیتەی (نوخبەی) سیاسی و ڕۆشنبیری و فەرمانبەری گەورەدا هەڵناسورێت ، بەڵکو دەستەلاتی ئەوان لاوازتر دەبێت و نێزیکبوونەوەکە لەو سوتێمە کۆمۆنیکاتیڤە پتەوتر دەبێت. چیدی کێشەکان لەسەر بنچینەی نەتەوەچێتی و مۆراڵی ئاینی و عادەتی ئارتۆدۆکسیانە چارەسەر ناکرێت ، بەڵکو لەسەر بنچینەی ڕوانینێکی گشتکۆیی هاوبەشەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت.

ئەز پێموایە گەر ڕێچکەی پرۆژەی ڕیفراندۆم و هەر پرۆژەیەکی دیکە لە گەڵ بەرهەمهێنانی [ بەڵگەنامەیەکی مێژوویی] ئاوەهادا یەکبگرێتەوە. لەپاڵ ئەوەشدا سوستێمی سیاسی و جۆری سوستێمی سیاسی لە کوردستانی فیدرالدا ئامانجی ئەو پرۆژەیە بێت، کەخۆی لە سکولاریەت و پلورالیزمدا دەبینێتەوە، بەو مەرجەی کە سکولاریەت و پلورالیەت لەهەموو هێزە ئێراقیەکانی دیکە تێبگەیەنرێت ، کە بەهیچ شێوەیەك جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەت دژ بەڕۆڵی ئاین نیە لە کۆمەڵگەدا ، گەر پابەند بێت بە بنەما سەرەکیەکانی دەستورێك بڕوای بەمافە سرووشتیەکان و پلورالیزم هەبێت، گەر شەڕێکی ئاوەها شان بەشانی شەڕکردن لەسەر فیدرالیەتی کوردی لەنێو خودی دەستەلاتی تازە لەدایکبوویی ئێراقیدا نەکرێت ، ئەوا وامان لێدێت هەموو کێشەکانی دیکە بەهەڵواسراویی بمێنێتەوە. حەوزە و سیستانی و سەدریەکان گەر بزانن ئێستا هیچیان بۆناکرێ لە کردنی خۆیان بە بەباوکی ڕۆحی یاساو دەستوری ئێراقی ، ئەوا هەوڵدەدەن هەموو کێشەکانی دیکەی وەك کێشەی پلورالیزم، سکولاریزم، کەدەبێت لە دەستووردا جێگیربکرێت ، هەڵدەواسن ، هەڵواسینیش ، مانای دروستبوونی کەلێنێکی گونجاو بۆ یاری فەتواو و گەورەکردنی ترس لە عەلمانیەت و پلورالیزم و، بێگومان فیدرالیەتی کوردیش!!

بەم شێوەیە موستەحیلە فیدرالیەتی کوردی بەئەنجام بگات ، بەبێ ئەم دوو مەرجە سەرەکیە ، یەکەمیان دانپێدانانی مێژوویی هەمووان لەشێوەی [ بەڵگەنامەیەکی

مێژوویی ] و دووهەمیان جێگیرکردنی عەلمانیەت و پلورالیزم لەنێو هەرێمی فیدرالدا، بێگومان بە هەوڵدانِ بەکردنی هەموو پڕۆژەکانی وەك ڕیفراندۆم بە نێوەندێکی گفتوگۆی مێژوویی ، کە ئەلتەرناتیف بخاتە بەردەم حزبە چەپێندراوەکانی نێوەندی سیاسی کوردی . گەر ئەم دوومەرجە پێکرا کاری بۆ نەکرێت ، گەر ئێستاش فیدرالیەتیش بسەپێنێن ، ئەوا لەسایەی حکومەتێکی ناوەندی دیسپۆت و پڕ فەتواچی و دەستوری کاتی و دژە عەلمانیەتدا ، ئەو فیدرالیەتە لەهەرەشەدا دەبێت.

دەربارەی مەرجی دووهەمی بەشداری هەمووان لەهەڵبژاردنی جۆری سوستێمی فیدرالی و نەخشەی داهاتووی شێوەی گەمەی سیاسی لە کوردستانی فیدرالدا، پێویستە ئەوەبڵێین کە لەم گەمە ترسناکەدا هەمووان بەشدارین و ئەوەشی گرەوی ئەوە دەکات بەتەنها کەمانچەژەنی ئەم کۆنسێرتە خوێناویە بێت ، گرەوێکی دۆڕاوانە دەکات لە سەر خۆی و سبەینێش خۆی و ئێمەش دەبینە ژێر دەست وقاچی ئەوانەی ڕقیان لە هەموو جوانیەکە. سیستانی نە مۆسیقای دەوێت و نەئەدەب و نەئافرەت و نە ڕۆناکی و نەهوشیاری و نەگفتوگۆ، نەبەوەش خۆشحاڵە کەئێمە خاوەنی هاوکۆییەکی گشتی بین، ئەم قسانەم بۆنی قەومیەتی لێدێت ، بەلام دەبێت ئەوە بزانین کەچەندە دژایەتی ئەوان لەخزمەتی کێشەی کوردیدایە ، ئەوەندەش لەخزمەتی عیلمانیەتدایە، شەڕکردن بۆ سکولاریزم ، شەڕکردنە نەك بۆ بەدەستهێنانی فیدرالیزم ، بەڵکو زامنی پاراستنی ئەو فیدرالیەتە چاوەڕوانکراوایە، ئەقلانیەت دژە مافی چارەی خۆنووسین نیە ، چونکە بە مافێکی سرووشتی تێدەگات، دژە گفتووگۆ نیە ، چونکە گفتوگۆ و تێگەیشتن لەیەکتری بنچینەی ئەقلانیەتە و لەدۆزی سیکۆلاریەتیش جیانابێتەوە.

ئێمە ناتوانین هیچ ڕیفراندۆمێك بەئەنجام بگەیەنین ، کەتاوەکو ئێستا پیاوانی فایلەکان لەنێوماندا بەئاسودەگی و بێلێپرسینەوەی توند و عادیلانە گاڵتە بەڕابوردووی ئێمە دەکەن، تۆ ناتوانیت بە کەسێك بڵێت شەو بێخەم بخەوە و دیموکراسیەت گەشەدەکات و ڕیفراندۆم ئەنجام دەدەین و دەبین بە خاوەنی دەنگی خۆمان، بەمەرجێك هەزارەها تاوانباری جەنگ و دز و پیاوکوژ بەنێو کۆمەڵگەدا بەئاسوودەگی یاری خۆیان دەکەن ، من پێمووایە بۆ ئەوەی باس لە ڕیفراندۆم بکەین ، دەبێت باسیش لەکێشەی ڕێگرەکانی ڕیفراندۆم بکەین !!، کەخاوەن فایل و تاوانبارانی و بازرگانەکانی جەنگی چەند ساڵەی ئێمەن لە دژی دیکتاتۆریەت. پێمووایە شان

بەشانی باسکردن لە مافی چارەی خۆ نووسین و دەنگدان لەسەری ، دەبێت پرۆژەیەکی ئاوەها ئەرکی دامەزراندنی شەفافیەت و سەراحەتێکی بێپەردەبێت لە بەرامبەر مێژوو، جێگیرکردنی ترادیتسیۆنی موکاشەفە و شەفافیەت ئەرکی پرۆژەی ریفراندۆمە کە پێویستە بەئاشکرا مافی دەنگدان لەو خاوەن فایل و تاونبارو بازرگانانە بسەنێتەوە و کەگاڵتەیان بە چارەنووسی ئێمەکردووە، دەبێت چەندەها تەوەرە هەبێت کە ڕابووردی نێو ماڵی کوردی بهێنێتەسەر ئاستی گفتووگۆ. گەرسنورێکی کوردستانی مێژوویشت هەبێت، بەڵام پڕی بێت لەو پیاو و ژنانەی ئازیز و خۆشەویستانی ئێمەیان سەرەونگومکردووەو جاسوسیان کردووە و گاڵتەیان بەچارەنوسمان کردووە، ئەوا ئەو کوردستانە چاوەڕوانکراوە بەندیخانەیەکی پڕ جەردەی کۆن و نوێ دەبێت ، مادامەکی هەموو شتێك لەڕابوردوودا بە عەفوعامێك و بڕیارێکی سەرکردەیەکی میزاجی دەسڕدرێتەوە، ئەو (کارکردنە لەڕابوردوو) بە تەعبیری ئادۆرنۆ، ئەرکی چەندەها پرۆژەی وەك ریفراندۆم و پرۆژە سیاسی و رۆشنبیریەکانی داهاتوو دەبێت، بەبێ کارکردن لەو ڕابوردووەدا، مەحاڵە بتوانین مانا بدەین بەساناترین چەمکی ژیانی داهاتوومان. ئەوەی کە پرۆژەی ریفراندۆم و هەموو ترسی سەرکردە کوردیەکان هاوبەند دەکات پێکەوە، یەکبوونە لەسەر پرۆژەیەکی هەمە لایەنە، پێکهێنانی ئەو دەسەڵاتە هاوبەشە پڕحیوارەیە ، کەبەشداری هەمووان لە پرۆژەیەکی دیموکراسیەکی ڕاتسیونال، زامنی ئەوەدەکات نەك هەر حساب بۆ فەتوای مەلایەکی خەڵەفاو نەکەین ، بەڵکو هەموو ئەو هێزە دیموکراسخواز و پێشکەوتوخوازەنەی ئێراقیش لەگەڵ خۆماندا بەشدارکەین لە گفتوگۆیەکی نەقلانی ، کەیەکلاکردنەوەی کێشەی فیدرالیەت تێدا بە دەر لەهەموو هەستیاریەکی نەتەوەیی و مەزهەبی چارەسەر بکات. هەتاوەکو ئاوەها لەنانەقلانیەتی سیاسیدا خونبخۆین و ناگفتۆوگۆش ئاوەها بەسەر کەشی سیاسیماندا زاڵ بێت ، نەك هەر فەتوایەکی سیستانی دەمان لەرزێنێت ، بەڵکو دەبێت چاوەوانی ئەوەش بکەین حەوزەیەکی کوردیش پەیدابێت !!. مادامەکی فەتوای مەلایەك ئەوەندە بە هێند وەربگیرێت و، چەندەها حزبی سیاسی کەخاوەنی هێز و مێژوویی خۆیانن بە پەلە بەرەو پیری بچن و ڕەجای لێبکەن کەفەتواکەی نەرمبکاتەوە.

بۆ ئەوەی کێشەی جەبهەی ئینقاز دووبارە نەکەینەوە و دیموکراسیەت نەبێتە دار دەستیەك بۆ سەرکەوتنی هێزە ئیسلامی و حەوزەی و قەومەچیە دواکەوتووەکانی ئێراق

و دۆزی کوردی نەکەوێتە ژێر دەست و قاچیانەوە، تەنها یەك چارەسەرمان هەیە کەتەنها یەك ڕێگەی لەبەر دەمدایە، ئەویش دیموکراسیەتێکی ئەقلانی کوردی و شەرکردنە لەپێناوی پەرەپێدانی هەموو پرۆژەیەك لە گفتوگۆ و شەفافیەت نێزیکمان بخاتەوە، بۆ ئەمەش پێویستمان بە ڕۆحێکی کوردانەی بەهێز هەیە بەرامبەر پێداچوونەوەی مێژووی پڕ جەنگمان ، بەهەمان هێزیشەوە پێویستمان بە بڕیاری ئازایانە هەیە لەدژ هەموو هێزێك کە دژی مافە سرووشتیەکانمان کار دەکەن، پێویستمان بە پرۆژەیەك هەیە کەدەکرێ نەك هەر ڕیفراندۆم بێت بۆ فیدرالی ،بەڵکو پرۆژەیەك بێت بۆ سوستێمێکی سکولاریزم لەسەر بنچینەی دیموکراتیەتێکی ڕاتسیونال (ئەقلانی ) دامەزرابێ ، نەك دیموکراسیەتێکی زۆرینەی فەتواچی و قەومەچی و سیتانیەکان....

## پێشانگای کتێبی فرانکفۆرت و
## ڕاوبۆچوونێکی کاڵ وکرچی ئەندام پەرلەمانێکی کورد ..

پێشانگای کتێبی فرانکفۆرت میهرەجانێکی یەکترناسینی ئاشقانی کتێبە بەکتێب و ئاهەنگێکی شادبوونەوەی ئەدەب و هونەرە لە نێو ڕووبەرێکی فراوانتردا، لەو قەناعەتەوە سەرچاوەی هەڵگرتووە کە دەزگاکانی چاپ و بڵاوکارەکانی کتێب (ناشر) و نوسەرکان و خوێنەری هەموو میللەتان و کلتوورەکان یەکتری بناسن و هەلێکی ڕەخساوە بۆ تێگەیشتن لەئەوی دیکە، لەکلتوری بەرامبەر و لەهەمانکاتیشدا خۆ نیشاندانێکی ڕەوایە بۆ هەموو کلتوورێك کەکتێبی خۆی نیشانداو لەهەمانکاتیشدا شانازی بەجوانیەکانی ئەدەب و شیعر و کتێبی چاپکراوی بکات، هەموو ساڵێك لە ئەڵمانیا و لەمانگی ئۆکتۆبەردا ئەم پێشانگایە بۆماوەی چەند ڕۆژێك دەکرێتەوە و بەهەزاران دەزگای چاپ و نوسەر وئاشقانی کتێب و ڕۆژنامە و گۆڤارەکانیش بەشداری تێدا دەکەن.
دیارە من لێرەدا نامەوێت باس لەوەش بکەم کەئەوانەی بەشداری دەکەن لە نوسەرەوە بیگرە تاوەکو بڵاوکار و گوێگر و ئاشقانی کتێب لەئاستێکی خوێندنەوەدان و جیدین لە گوێگرتن و بەشداری ، بەتایبەت کەهەموو ساڵێك وێستگەی شەمەندەفەرو فڕۆکەخانەو شوێنەگشتیەکان لەفرانکفۆرت دەخرێنە ژێر کۆنترۆلێکی تایبەتەوە و هەوڵدەدرێت بە پێی توانا ڕێگەئاسانی بکرێت بۆ ئەو ژمارە بێشومارەی ئاشقانی ئەدەب و کتێب کەلەهەموو شارەکانی ئەڵمانیاوە بۆ ئەوێ سەفەر دەکەن و پارەیەکی زۆر بۆ شەمەندەفەر و کتێب کڕین و مانەوەش تەرخان دەکەن، ئەمە جگەلەوەی لەهەموو ئەوروپاوە موسافیران بەخۆیان و جانتاکانیانەوە لەفڕۆکەخانە و وێستگەی شەمەندەفەرو ڕێگای ئۆتۆمبێلی خێرا دەردەکەون و خۆیان دەکەن بەو پێشانگایەدا.
دیارە ئەمساڵ بەشداربوونی تایبەتی دەزگاکانی چاپی عەرەبی بەو ژمارە تایبەتە مۆرکێکی زیاتر سەرنجراکێشی پێبەخشی ، بەتایبەت لەدوای یازدەی سێپتەمبەرەوە ڕۆشنبیرانی ئەوروپی دەیانەوێت زیاتر زانیاری دەربارەی ئیسلام و عەرەب و نەتەوەکانی ئەوناوچانە، بەکوردیشەوە، بزانن. هەندێك لەوانە لەباگراوەندی زانیاریان لەمەڕ زۆرانبازیەکانی ئێستای دنیا و تیرۆرو ئیسلامیز م و سیاسەتی

نیوکۆنزەرڤاتیزمی ئەمریکایی و هەڵۆکانی پنتاگۆن و کۆشکی سپییەوە ، هەوڵدەدەن ڕووی دووهەمی ئەو زۆرانبازیە بناسن کەبەتیرۆر و پێش مۆدێرنە و نادیموکراس و ..هتد ، پێناسە دەکرێت.

بەشداربوونی کورد و هەوڵدانی ئەو گەنجە دڵسۆزانە بەڕێکخستنی بەشێك بۆ کتێبی کوردی جێگەی خۆشحاڵی و دەستخۆشانە و هاندانیانە، وەك یەکەم جار بەشداربوون لەبۆنەیەکی ئاوەهادا ، جێگەی سەرنج و دەستخۆشی و هاندانە. ئیدی کاتی ئەوەش هاتووە کەدەسەڵاتی کوردی بەجیدی بیر لەکتێب و ڕۆژنامەبکاتەوە، کاتی ئەوە هاتووە لەو هەقیقەتە سادەیە تێبگەین کە کتێب و کلتوور و شیعری جوان ، جوانترین نوێنەری جەوهەری کۆمەڵگاکان و ئەو هێزەشی جەخت لە سەربەستی ڕاو بۆچوون دەکات ، گرەوێکی سیاسی دەباتەوە کە بەردەوامی پێدەبەخشێت بۆ تازەکردنەوەی خۆی وەك هێزێکی سیاسی .

بەڵام بەداخەوە هەمیشە ئەوانە نوێنەری ڕۆشنبیران بوون کەلێوار (نانوسین) و غیابی جیاهنبینی ڕۆشنبیری بۆ دەوروبەر ڕاوەستاون، ئەوانە کاتێك دەنێردرێنە ئەو بۆنانەی کەنامۆیە بەئەوان سەریان لێدەشێوێت ، لەبەر ئەوەی لەوێ ، بەتایبەت پێشانگای کتێبی فرانکفۆرت و کۆڕەکانی جێگەی کاری جیدین و ڕاوبۆچوونی جیدیە، نەك کۆڕێکی موجامەلەی حزب و مەحسوبگەرانەی ئەم وئەوە لەسەر حسابی ڕۆشنبیری.

لەبەرواری ٩ی ئۆکتۆبەردا ،بەڕێز خەسرەو جاف خۆی [ وەك نوێنەری ڕۆشنبیرانی کورد لە پەرلەمانی کوردیدا ] پێشکەش کرد، لە یەکێك لە کۆڕەکانی پێشانگای کتێبی فرانکفۆرت بەشی ئێراقیەکان کۆپلەیەك شیعری خوێندەوە. کەئەگەر ئەوە تاکە بەشداری بووایە قەیدی نەبوو ، لە ئەزمونی خۆمەوە وەك خوێنەرێکی ئەدەب ، دەتوانم بڵێم ئەو چەند دێرە شیعریە زۆر ترسناك بوون!! ، بەهەرحاڵ ئەوەش کێشە نەبوو لای من ، گرنگ ئەوەیە کورد ئەندامێکی پەرلەمانی هەیە شیعر دەنوسێ و دەیخوێنێتەوە!!، تەنها بوونی ئەو بیرۆکە سانایە و جوڵاندنی لە نێو نێوەندێکی ئەڵمانی و ئێنتەرناسیونالی بەخشینی وێنەیەکی جوداوازە بەدەموچاوی هێزێکی سیاسی کەهەوڵدەدات لەڕێگەی کلتورەوە خۆی بناسێنێت، گەر نەکەوینە وەهمی ناسیونالستانەوە ، کارێکی خراپ نیە، بەڵام بەداخەوە وەك گووتم هیچ دژی ئەوەش نیم کە پیاوێك بەتۆبزی بێت و خۆی بکات بەنوێنەری هەموو ڕۆشنبیرانی کورد !!،

ئەوەشم پێ قووتدەچوو، منێك كەبەخۆم و جانتایەكی شانەوە بەڕێكەوت بەلای ئەو كۆڕەدا تێپەڕبووم، كە(عەزیز خەیون و ئەمەل جبوری و خەلیل شەوقی و ڕۆماننوسی ناسراوی ئێراقی فوئاد ئەلتكرلی ) بەشداریان تێدا كرد و بێگومان بەڕێز خەسرەو جاف و عەلی شەلاهی شاعیریش بەشداربوون، منیش وەك هەموو ئاشقێكی كتێب لەم پێشانگا بۆ ئەوی دیكە ، لەو كۆڕە بۆ ئەوی دیكە گوێمدەگرت ، وەك هەموو گوێگرێك هەستم دەكرد دەبێت ئەوانە قسە بكەن كەداوەت كراون و ئێمەش تەنها پرسیار بكەین و گەر پێویستیش بكات ڕاوبۆچون دەگۆڕینەوە، كارەساتەكەئەوكاتە دەستی پێكرد كەبڕیاردرا مێزگردێك لەمەڕ مەسەلەی ئێراق ببەسترێت و ئێمەی گوێگریش پرسیارەكانمان ئاڕاستەی بەشداربووان بكەین، بێگومان (نوێنەری ڕۆشنبیرانی كورد لە پەرلەمانی كوردستانیش ) یەكێك بوو لەبەشداربووانە، پرسیاری سەرەكی ئەوە بوو: ئایا هەلوێستی ڕۆشنبیران چیە سەبارەت بەداگیركردن و سیاسەتی ئەمریكا لە ئێراق و ناوچەكەدا؟ ! ، سەرەتا خەلیل شەوقی ویستی وەلامبداتەوە، بەلام كەبینی خەسرەو جاف بەحەماسێكی سەیرەوە دەستی هەلبڕی و دەیوویست لە پێش هەمووانەوە وەلامبداتەوە، مایكرۆفۆنەكەیان دایەدەستی و بەڕێزی بەحەماس و سووربونەوەیەكی سەیر گووتی: ئێمەی كورد سوپاسی ئەمریكا دەكەین كەڕزگاری كردین لەسەدام ، ئەگەر ئەمریكا نەبووایە ئەوا ئێمە بۆ سەد سالی دیكە لەژێر پۆستالی سەدامدا دەبووین..

بێگومان ئەم قسەیە هەمووانی سەرسامكرد، سەرەتا ئەلمانەكان و بێگومان ئەو چەند ئێراقیەشی كە لەكۆڕەكەدا دانیشتبوون ، بەتایبەت ئەو دوو ژنە ئۆرینتالیستەی بەناوبانگەی ئەلمانیش لەوێ دانیشتبوون كەچەندەها كتێبیان لەعەرەبیەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی ئەلمانی، ئەوە جگە لەوەی ئەوانەی گوێیان دەگرت هەموویان خوێنەری جیدی و گوێگری جیدی بوون. ڕاستی من لەشوێنی خۆم سووربوومەوە، ئارەقەم كرد بەو ڕاسادە وكالوكرچەی كە (نوێنەری ڕۆشنبیرانی كورد) دەریبڕی ، كەئەمە قسەیەكی سادەی سەرجادەیە ، بەلام هەرگیز ناگاتە ئاستی لێكدانەوەیەكی مەنهەجی ڕۆشنبیرانە،چ جای لە دیداری فرانكفۆرتدا بگوترێت!!، ئەگەر ئەو برادەرە وا مەزندەبكات سیاسیانە قسەی كردووە، ئەوا لەو بڕوایەدا نیم سیاسی كورد ئەوە سادەبێت لەژێر سایەی ئەو بڕوایە بژی ، گەر هاتوو میدیای حزبیش پڕوپاگەندە بۆ ئەو مەسەلەیە بكات، ئەوا ئەوە میدیایەكی تایبەتە و مەرج نیە هەموو گوتراوەكانی

بەجیدی وەرگیرێت، ئیدی هەمووان سەرسام بووین بەو ڕایە سادەو کاڵ وکرچ کەخاوەنی هیچ بەهایەکی لێکدانەوەیەکی ڕیالستانە نەبوو، چ جای فیکریانە، خود خێری ئەو هونەرمەندە عەرەبە ئێراقیانە بنوسێت، کەتۆزێك هەوڵیاندا ئەو وێنا سادەیەی کەبەڕێزی لەمەڕ ئاستی شیکردنەوەو هۆشیاری سیاسی ڕۆشنبیری کورا پێشکەشی کرد، ڕاستبکەنەوە، گووتیان: ئێمەش خۆشحاڵین بەوەی سەدام ڕووخاو گەل بەدەستی شەیتانیش بێت!، بەڵام وەك خەلیل شەوقی گوتەنی:مەخابن دەبێت دیکتاتۆرەکان بەدەست گەلانی وڵاتەکە خۆی بڕوخێنرێن، نەك بەهاتنی بێگانەیەك کەتاماوەیەك لەمەوبەر یەکەم پشتیوانی دیکتاتۆر بوو، خەلیل شەوقی گووتی (ئێمەی ئێراقی خەڵکێکی باشین و حەزمان لەشادی وخۆشی و خۆشەویستیە ، هەر لەبەر ئەوە بە بزە و پێکەنینەوە پێتان دەڵێم کەدنیای ئێستا بەداخەوەدنیایەکی شەڕانی و بێ مۆراڵە!!..) .

خوێنەر سەرپشك دەکەم بۆ ئەوەی ئەو دووڕایە تاوتوێ بکات، ڕایەك بێ بیرکردنەوە لەشوێن و زەمان قسەی سەرجادە دووبارە دەکاتەوە ، ڕایەکیش کەلەجیهانبینی هونەرمەندێکەوە دەزانێت کەئەوێ شوێنی ڕۆشنبیران و کتێبە ، دەبێت وشەکان هەڵبسەنگێنرێت ، پاشان بگوترێتن بەتایبەت لەو جۆرە بۆنە ئینتەرناسیونالستیانەدا،کەمرۆ نازانی ئەوەی گوێت لێدەگرێت کێیە!. ئەندامی حزبێکی گرنگی ئەوروپیە، ڕۆژنامەنوسە یاخود بیرمەندێك یان فەیلەسوفێکە؟!. لەوێ لەو بۆنانە ئەوەندە گرنگ نیە ناسیونالست بیت بەقەد هێندەی ، ئەدوارد سەعید گووتەنی ڕۆڵی ( نوێنەرایەتی ڕۆشنبیری ) کلتوری خۆت بکەیت، بە ئینداڤیدوالیەت و تاکڕەوەندی خۆتەوە، ئەمە ئەو ڕاستیە سادانەیە کە ئەندامی پەڕلەمانێك دەرکی پێناکات، ئیدی دەبێت ڕۆشنبیرانی گوێگری ئەو کۆڕە چۆن پەڕلەمانیان هاتبێتە پێش چاو.

لەوساتەدا دێڕێکی گونتەرگراسم بیرهاتەوە کەدەڵێت [ ساتێکە دەبێت خۆتی تێهەڵقورتێنی..] ، هەر بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو (سوپاسگوزاریەی) ئەندامی پەڕلەمانی کوردی کەبەشان و باڵی ئەمریکایەکاندا هەڵیداو وێنەیەکی زۆر سادەی لەمەڕ ڕۆشنبیرانی کورد و تەنانەت سیاسی کورد پێشکەش کرد، وەڵامم دایەوە و ڕووی دەمیشم زیاتر لە و گوێگرە جیدیە ئەڵمانە بوو،هەروەها ئەو ڕۆشنبیرە عەربانە بوون

کەبەشداربوون ، گووتم : یەکەم ئەوە ڕای ئـەو بەڕێـزە خۆیـەتی و لەوبڕوایەشـدانیم لایەنی ڕەسمیش کەئەو بەنێویەوە قسەدەکات ئەوەندە سادەبێـت ، دووهـەم ڕۆشـنبیری کورد و مرۆی کورد ئەوەندە سادە و بێ بیرەوەری نیە کەئەوە لەبیربکات کاتێـك سـەدام بەکیمیاوی کوردی جینۆساید دەکرد و ئـەنفالی دەکـرد ، ڕامسفێـلد وهـەڵۆکان یەکـەم پشتگیری سەدام بوون،ئێمە ئەوەندە سادەنین کەلەماوەی بیست و چوار کاتژمێردا هەموو ئەو ڕووداوانە لەبیرکـەین، ئێـمە ئەوەندەسـادەنین بـڕوا بـەو ئـەوروپاش بکـەین ، جگەلەوە تێناگەم سوپاسی چی بکەین و بۆچ شتێك؟ ، ئێمە ئەوەندەبێ یادەوەری نـین و جیاوازی ڕای ڕۆشنبیران ودەسەلات لەکوردستاندا ،لەمەڕ زۆر مەسەلە خاوەنی گفتوگـۆ و زۆرانبازیەکی تایبەتە و خاوەنی خاسیەتی خۆیەتی ..

بەهەر حاڵ من لێرەدا ئەمانە دەنوسم بۆ ئەو زاتە ، لەبـەر ئـەوەی وابـزانم وەرگێـڕە عەرەبیەکە لەوێ قسەکانی منی بەباشی لەئەڵمانیەوە بۆ خەسرەو جاف وەرنەگێـڕایە سەر عەرەبی، بۆ ئەوەش ئەم چەند دێرە دەنوسم بۆ ئەوەی بەڕێزی جیاوازی بکـات لـە دانیشتنی کۆڕێکی موجامەلە و برادەرایەتی لەسەر حسابی ڕۆشنبیری و کۆڕێکی جیـدی لەشوێنێکی وەك فرانکفۆرت و لەچوارچێوەی کەش وهەوایەکی (ڕۆشـنبیری ئـەڵمانی) دا ..

ئەوانەی بەشدار بوون ، نیگەران بوون لەوەی کەئـەدەب و ڕۆشـنبیری میللەتێـك بـەو سەلبیەت و کاڵ وکرچیە بخرێتە ڕوو ..دوا ووشەم بـۆ بەڕێـز خەسـرەو جـاف ئەوەیـە تکایە لەمەو دوا لەو بۆنانەدا بـەناوی خۆتـەوە قسـە بکـە، نـەك پەرلەمانێـك کـە دوازدەساڵ زیاترە هەڵنەبژێردراوەتەوە.. پاشان هەولێریان دەڵێن هەر بەردەکی بخەیە سەر باشترە..

## گەندەڵی ئیداری لە..

## نێوان ئەزمونی ئێمە و فەلەستینیەکاندا

-١-

ئەز یەکێکم لەوانەی بەدرێژایی ژیانم گرنگیم داوە بە مەسەلەی فەلەستین، هۆکارەکەی پابەند نەبووە بەوەی کەمن لەزەمەنی هەرزەیدا مارکسیەکی تەقلیدی ڕۆژهەلاتی بووم ، نەخێر بەهیچ شێوەیەك وانەبووم ، تەنانەت دوای ئەوەی زۆربەی هاوڕێکانیشم بەر لێشاوی (شنەبای ئازادی ودیموکراسی ) نەوەدەکان کەوتن و ئیدی بەبێ هیچ ئاوڕادانەوەیەك لە کلتووری شۆڕش و پرنسیبەکانی ، ئەو حەزخوازیەیان نەما بۆ ڕەدوکەوتنی مەسەلەی فەلەستینی، من هەر وەك جاران مەسەلەی فەلەستینم لا گرنگ بوو. دیارەلای خوێنەری ئەم چەند دێرانە ئاشکرایە کەزەمەنی خۆی فەلەستین سومبولێك بوو بۆ زۆربەی ئەو ئەو ئەدەب وشانۆیەی لەژێر ناوی ئەدەبی بەرگری خۆی نیشاندەدا و چالاکی شانۆیی و ئەدەبی و هونەری تابلۆسازی لەژێر ئەو ناوەدا پێشکەش دەکرا، کۆمەڵێك کۆدی جوانی شۆڕشگێڕی لەڕێگەی سۆمبۆلی کێشەی فەلەستیندا دەنێردرایە دەرەوەی پێکهاتەی بینراو و زانراوی هونەری ، ئیدی زەمەنی هەشتاکان شانۆ لەسەر فەلەستین و ئەدەب بەنێوی فەلەستینەوە ، لەجیاتی ئەو ویژدانە کوردیە بریندارەی دەئاخڤی ، کەچەوساندنەوەو زۆرداری ڕێگەی دەربڕینی سەربەستی لێگرتبوون..

دوای ڕاپەڕین مەسەلەی فەلەستین ئەو قورسایەی لەنێوەندی گفتوگۆی سیاسی و ڕۆشنبیریدا بەرەو کزی پوکانەوە دەچوو، من پێموایە دووهۆی سەرەکی هەبوون، یەکەمیان: ئەوەبوو لەدوای ڕاپەڕینەوە کەش و هەوای سیاسی کوردی بەرو ڕووتکردنەوەی مانا لەسیاسەت هەنگاوی دەنا، چاکتر وایە بڵێم بەرەو جیاکردنەوەی سیاسەت لە کلتووری خۆی ( کلتوری سیاسی )، خۆی شێوەباز دەکرد ، دوور کەوتنەوە لەهەموو ئۆنیڤێرسالیەتێکی سیاسیانە ئامانجی ئەو ئەقڵە میلیشیایە بوو . دیارە من

لێرەدا سەرنجی خوێنەر بۆ ئەوە ڕادەکێشم کەئەز مەبەستم حزبێك یان کۆمەڵەیەکی سیاسی نیە بەدیاریکراوی ، بەڵکو من قسان لەسەر سەرجەم کەش و هەوای سیاسی کوردی دەکەم بەهەمووانەوە.

ئەم دابڕانەی سیاسەت لە کلتوور کێشەجیهانیەکانەوە ، دوور خستنەوەی سیاسەت بوو لە گفتوگۆخوازی سیاسیانە ، کەزەمەنی دوای ڕاپەڕین پێویستیەك بوو بۆ ئەوەی میلیشیا بتوانێ تەونی دەسەلاتی جاڵجاڵۆکەیی خۆی بچنێت بەسەر هەموو ئەو کون و کەلەبەرانەی سیاسەت و کلتووری سیاسی بیرکەرەوە، لێوەی بێنە ژوورەوە و ڕووبەڕێك دروست بێت بۆ پرسیارکردن لەسەر شەرعیەتی سیاسی ئەم هێز یاخود ئەوی دیکە!، شتێك دپێك بێت کە پێیدەڵێن توانای بەراوردکاری .

مەسەلەی فەلەستین چیدی خەمی بیرکردنەوەی ئێمە نەما و ئەقڵی میلیشیا و کەشی سیاسی بەشێوەیەکی بێئاگا دوور دەکەوتەوە لەو مەسەلەیەو گرنگی کەمکردنەوەی گەیشتۆتە ڕادەیەك کەئێستا زۆر دەگمەنە ڕۆشنبیرێکی سیاسی (بێگومان لەکەوانەدا) ببینین باس لە مەسەلەی فەلەستین بکات.

هۆکاری دووهەمی فەرامۆشکردنی مەسەلەی فەلەستینی، ئەو ئەمریکانیزە گۆج و ئیفلیجە یە بەشێوەیەکی زۆر هەزەلیانە لەم لاو لەولا لەژێر تایتڵی ڕەشەبای دیموکراسی تەعبیری لەخۆی دەکرد . ئەز بیرم دێت جارێکیان سەرکردەیەکی کورد لەبەردەم کۆشکی سپی قسەی بۆ کامێرای تەلەفیزۆنی حزبەکەی خۆی دەکرد، خودایە بۆیانی چ هەراو ژاوەژاو و خۆشیەك لەنێو سیاسی و بەنێو ڕۆشنبیرەکانی ئەو حزبەدا دەنگیدایەوە!، چەند تەفسیرو دەلالیەت و بونیادگەریانەم بیستەوە، (دیارە ئەو زەمەنە باوی بونیەویەت بوو نەك وجودیەت!!). ئەوسا کەناڵی ئاسمانی ومۆبایل و کۆمۆنیکاسیۆن ئەوەندە پێشکەوتوونەبوو، ئێمەی گەنجی هیلاکی نێو شەڕەکان ، نەماندەزانی کەئەو شوێنەی سەرکردەکەمان قسەی لێوە دەکرد ، شوێنێکی ئاساییە ومرۆڤ دەتوانێت بەدەرپێی کورت وشۆرتیشەوە لەبەردەمیدا پیاسەبکات و تابەیانیش گۆرانی بڵێت .. لێرەوە ئەمریکانیزمی شێواو، مەسەلەی فەلەستینی لەنێوەندی بیرکردنەوەی سیاسیانەی کوردی تورهەڵدەدایە دەرەوە.

ئەم دووهۆکارەی سەرەوە باسمکردن ئەو تەفسیرانە بوون کەمن پێموابوو هۆکاری دوورکەوتنەوەی سیاسی کوردیە لە موتابەعەو ڕەدوکەوتنی سیاسیانەی هەواڵی سیاسی

فەلەستینەکان ودەسەلاتی فەلەستینیەکان، چ نەبێت هۆکاری ساردبونەوەی ڕاگەیاندن و گفتوگۆیە لەسەری ، هۆکاری سێهەمیش ئەو بازرگانیە هەرزانەی سەدام حوسێن بوو بە مەسەلەی فەلەسەتین کەزیاتر لە گەرمی ڕووداوەکانی فەلەستین ساردی دەکردینەوە، ئەمەجگەلەوەی ئیسلامیەکان و پڕوپاگەندەی ئۆنیڤێرسالیەتی گوتاری ئیسلامی و ڕێکەوتنی هەمووان بەجیاوازی نەتەوەو زمانەوە لەسەر ڕزگارکردنی( قودس /ئۆرشەلیم)

لەکافرو خاچپەرستان و هەلهەلەی قەومەجیە عەرەبەکانیش، ئەو ئارەزووەی لای زۆربەمان مراند کەمەسەلەی فەلەستینی بەمەسەلەیەکی زیندوی پڕ دەرس وعیبرەت تەماشاکەین ، وەك ڕیالێك کەنێزیکە لەواقعی ئێمەوە.

-٢-

زۆر جار مرۆڤ لەهەندێك شوێن وكەس دوور دەكەوێتەوە، كەخۆشی نازانێت بۆچی ئەو شوێن وكەسانە بیزاری دەكەن، بۆچی لێیان دوور دەكەوێتەوە؟، بۆچی ئارەزوومەندی بۆ ئەو كەس وشوێن وبابەتانە نەماوە؟ هەمان پرسیار بوو جارجارە لەخۆمم دەكرد ، ئەو چەند هۆكارەی سەرەوە كەباسم كردن، بێگومان هۆكاری سەرەكین، بەلام لەهەمان كاتیشدا هەستم دەكرد سیاسەتی كوردیش نایەوێت زۆر ئەو مەسەلەیە شارەزابێت ، ئەوەش زیاتر منی دەخستە سەر ئەو بڕوایەی كەدەسەلاتی كوردی دەموچاوی خۆی لە ئاوێنەی لەدەسەلاتی فەلەسەتینیدا دەبینێتەوە!!، میلیشیای فەلەستینی وبزوتنەوەی فەتح ئەو (ئاوێنە) یە بەشێوەیەكی بێئاگا و نەستیانە ئەقلی سیاسی میلیشیا وەك میكانیزمێكی بەرگری لەخۆی ، هەولی ڕوو وەرگێڕان وفەرامۆشكردنی دەكات ، دەترسێت سەرنجی ئەوانی دیكە (الاخر) بۆ ئەو ئاوێنەیە ڕاكێشێت.

لەهەموو ڕووداوەكانی فەلەستیندا خۆم لەبەر دەم ئەزمونی كوردیدا دەبینیەوە، ڕۆژ بەڕۆژیش ئەو بڕوایەم زیاتر ڕەگی خۆی دادەكوتا ، كەكۆمەلێك سەركردەی بەتواناو چەندەها حزبی خاوەن مێژوو لە سەر ڕووبەری زۆرانبازی پەردەیان بەسەردا دەدراو ڕۆلی سیاسیانەیان كورت دەكرایەوە بۆ چەندەها كاری لاوەكی ، لەبەرامبەریشدا دەزگایەك خۆی ڕادەكێشا كەلە پشتیەوە سەرۆكێكی ئەبەدی وەستاوە ، ئیلهام بەخش و دانەری هەموو جولەكانە لە سفرەوە تاوەكو هەزار ، سەرۆكێك تەنانەت كلیلی

دەرگاکانی ئۆفیسەکانی حزبیشی کردۆتەملوانکەو لەگەڵ خۆیدا دەیباتە نێو گۆڕ ، بێگومان ئەگەر مردنی لەبەر چاو بێت..
ئێدوارد سەعید دەڵێت جارێك پڕوپاگەندەی ئەوە کرا کەفڕۆکەکەی عەرەفات کەوتۆتە خوارەوە ، هەموو سەرکردەکانی فەتح ئەو ئەگەری ساغبوونەوەی ئەو هەواڵەیان بە کۆتایی فەتح لەقەڵەمدا، لەبەر هۆیەکی زۆر سادە و زانراو ، ئەویش ئەوەیە کەهەموو پارەی ڕێکخراوەکە لە ژێر دەستی عەرەفاتە ، ئەو ژمارەی کۆنتۆو ناوی بانك و کۆدی هەمووکۆنتۆ و حسابی بانکی لەبەر دەستدایە و لەو یش زیاتر کەسی دیکە نیە ..
ئەمە لایەنێکەو زۆر نمونەی ئاوەها لەرۆژهەلاتدا هەیە. بەلام جیاوازی عەرەفات لەوەدایە ئەو سەرکردەی دەوڵەتێك نیە ، وەك ئەوانی دیکە بەڵکو پیاوێکە لەهەموو کاتێکدا دەتوانرێت وەك مریشکی ئاوەڕووتکراو لەلایەن شارۆنەوە دەستگیربکرێت و توری هەڵداتە بەندیخانەوە تاوەکو رۆحی دەردەچێت!!. لەگەڵ ئەوەشدا عەرفات ڕازی نیە ئەو نهێنیەیە لەگەڵ کەسدا بەشبکات.
دژەکاری مەسەلەکە لەوەدایە کەسەرکردەیەك هەیە ، خاوەنی سامانێکی ڕەمزیە و هێشتا خۆی وحزبەکەی و چەکدارەکانی لەقۆناغی شۆڕش پێکدادانندایە، کەچی ئەوێك لای گرنگ نیە دوای کوشتن ومردنی، حزب و پارەی حزب چی لێ بەسەردێت، ئەو سەرکردەیەی کەلەعەرەفاتدا خۆی دەبینێتەوە ، لەگەڵ ئەوەی تەمەن گەیاندویەتیە بارێکی تەندروستی ئەوەندە خراپ کەلەرزینی بەردەوامی لێو و نیمچە شەلەلی و خرفی هەبێت ، کەچی ئاوەها بەکورسی و حسابی پارەی فەتحەوە نوساوە، هەر وەك ئەوەی هەزار ساڵی دیکە دەژی . ئەمەزۆر جێگەی سەرنجە کەخوێنەری ئازیز ئاورێکی کورت بداتەوە لە گۆڕەپانی سیاسی کوردی دوای ڕاپەڕین و ئەو سەرکردانە ببنێت کەهەمووان وەك عەرەفات دنیایەك کۆنتۆی (حسابی بانق) ی نهێنیان لەژێردەستدایەو کلیلەکەیان بەملوانەکەیەکی پۆلایین بە ملەیانەوە هەڵواسیوە.
لەسەرێکی دیکەوە هەر کاتێك دەنگی ناڕەزایی پەیدا بێت لە نێو کادیرو پێشمەرگەدێرینە فەلەستینیەکاندا لەمەڕ ئەو تاکرەویەی عەرەفات ، ئەو خێرا کۆیان دەکاتەوە و بەلێوە لەرزیوەکەیەوە خوێنی شەهیدانیان پێدەفرۆشێتەوە و قامکی هەڕەشەی بەرزدەکاتەوەو ڕستە بەناوبانگەکەی دووبارە دەکاتەوە [ یاجبل مایهزك ریح] .. ئاوەهاش لە پشت عەرفاتەوە دەزگای ئاسایش و بەندیخانەی تایبەت و

موخابەرات و میلیشیاکانی خۆی دەجوڵێنێت بۆ دەمکوتکردنی هەموو نەیارێك. دیارە نابێت ئەوەشمان لەیادچێت کەسەرکردەی کوردی بەداخەوە لەکاتی تورەبوونیدا هەمان دەزگای ئاسایش و پاراستن و زانیاری حزب دەخاتە گەڕ ، بێگومان هەڕەشەکردنیش بەنان بڕینی ئەم نەیاری سیاسی و ئەم کادیر و ڕۆژنامەنووسان ، دەخرێتە گەڕو ئیدی لەنێوان چەکوشی دەزگای ئەمنی حزب و سندانی نانبڕیندا دەنگەکان بێدەنگ دەکرێن ، ئەمە چ لای عەرفات و چ لای خۆمان کرۆکی یەکەمی ئەو شتەیە کەپێدەڵێن گەندەڵی ئیداری ..

-٣-

سەرۆك عەرفات یەکەم کەس و دوا کەسە لە پشت هەموو بڕیارەکانی پەرلەمان ومەجلیسی تەشریعی فەلەستینی و دەزگاکانی حکومەتەوە وەستاوە . تەنانەت لە پشت بڕیاری وەزیرەکانی حکومەت ، کە سنووری دەوڵەت و وەزارەتەکانیان لە دووشاری بچوك و هەژار نەبێت ، هیچی دیکە تێپەڕ ناکات .

کەحکومەتی ئەبو مازن پێکهات ، ڕێکەوتنێکی دیکە لەنێوان ئیسرائیل و فەلەستینیەکاندا ئیمزاکرا و پڕۆژەیەکی دیکە هاتە سەر مێز کەنێوی( نەخشەی ڕێگا ) بوو ، مەبەستیان ئەو ڕێگەو بانەیە کەبەرەو ئاشتیەکی جێگیریان دەبات. بەهەرحاڵ چەند ڕێکەوتنامەکان لەگەڵ بەکردەییبوونیدا یەکیانگرتۆتەوە ، ئەوە مەسەلەیەکی دیکەیە،بەڵام ئەبو مازن لای ئیسرائیلی و ئەمریکایەکانیش ڕۆڵێکی سێنترالی دەبینی ، بەشێوەیەك کە سەرۆك ترسی ئەوەی لەلانیشتبوو ، لەداهاتوودا ئەو ببێتە قسەکەری یەکەم لەمەسەلەکاندا، عەرەفات و ئەبو مازن کەوتنە ڕاکێش ڕاکێش و زۆرانبازی ، دواجار ئەبومازن دەستی لەکارکێشایەوەو ئەحمەد قریع بووە سەرەك وەزیران.. وا ماوەی چەند هەفتەیەکیش دەبێت کەئەبو عەلاش داوای قبوڵکردنی کەنارگیری خۆی لەعەرەفات دەکات و لەغەزەش بنکەی پۆلیس دەسوتێنرێت وبەشێك لە کادیرانی فەتح و ئەندامانی مەجلیسی تەشریعی ئەو کێشانە دەتەقێننەوە و دەیخەنە بەردەم جیهان ، کەئەبو مازن نەیدەویست باسی بکات ،ئەو کێشەیە لەژێر کێشەی فەسادی ئیداری خۆی پێناسەدەکات .

دیاره دامەزراندنی خزمێکی نیزیکی سەرۆك عەرەفات (موسا عەرەفات) لە پۆستێکی ئەمنی باڵادا ئەو پزیسکەبوو کەوتە نێو پووشی وشکەوە. مانگرتن وخۆپیشاندان و تەقینەوەی مەسەلەکان بەشێوەك بوو کەهەندێك لەو کەسانەی پۆستی باڵایان لە ئیدارە و حکومەتدا داگیرکردووە، هەستیان دەکرد گەر هەڵمەتی پاکژکردنەوەی ئیدارەی فەلەستینی سەربگرێت ، ئەوا زۆریان بەردەکەون ، تاکە چارەسەر ئەوە بوو ئەو خۆپیشاندانە و هەستانەوەیان بە دەسیسەی ئیسرائیل و مۆساد لەقەڵەم بدەن.

-٤-

لەم کورتیلە چیرۆکەی سەرەوەشدا ئێمە و فەلەستینییەکان یەکدەگرینەوە ، هەر وەك چۆن لەزۆر خاڵی یەکتردا یەکدەگرینەوە.بۆنمونە نابێت خوێنەر دوو فاکتەری گرنگی بەراودکاری نێوان ئێمە و فەلەستینییەکان لەیاد بکات ، یەکەمیان ئەوەیە کە ئیدارەی فەلەستینی و بزوتنەوەی فەتح و حزبەکانی دیکەی چوار دەوری، بزوتنەوەیەکی چەکداری پارتیزان و بەرگری بوون، دووهەمیشیان هێزێك بوون بەشداری شەڕی ناوخۆی (لوبنان) یان کردبوو، لەزۆر کاتیشدا لەدژی یەکتری کوشتاریان کردووە، ئەمەجگەلەوەی کاتێك ئەمریکا مەسەلەی غەزەو ئەریحای هێنایە کایەوەوە و شەمعۆن پێریز لەگەڵ عەرەفات کەوتە گفتوگۆ و ڕێکەوتنامەی ئۆسلۆ لەمەدرید ئیمزا کرا ، هەموو بزوتنەوەکە لەسەر زەوی نیشتمان نەبوون !، بەمانای لە مەنفاکانی ئەوروپاو دەوڵەتە عەرەبییەکان بوون. لەهەمووی گرنگتر ئەوە بوو پێویستیەکی نەخشەی سیاسەتی نوێی جیهانی ئەمریکایی ئەو میلیشیاو فیدائیەیە فەلەستینیانەی کرد بەئیدارەیەك و عەرفات و پیاوەمەنفیکراوەکانیشی گەڕانەوە بۆ فەلەستین، بەڵام هەر یەکەی پاسپۆرتێکی دەوڵەتێکی دیکەی لەباخەڵدابوو، خۆ گەر ئەو گۆڕانکاریە دەولیە نەبووایە ، دەبوایە زۆربەیان لەئەوروپا و دەوڵەتە عەرەبییەکان کارێکیان بۆ بژێوی خۆیان بدۆزیاتەوە.

ئەمەش حاڵی ئێمە بوو کاتێك هەموان لەئێران کەوتبووین و زۆربەی لێپرسراوەکان یان لەئەوروپا بوون، یاخود ئەوەی نەدار بووایە لەئێران بە کوردەناموسی ژیانی بەسەر دەبرد ، گەر ئەو گۆڕانکاریە دەولیە نەبوایە و چەند ساڵێك دواکەوتایە ، تەئکید بووین هەموو بزوتنەوەکە بەهەموو حزبەکانیەوە دەپوکانەوە، چونکە ئەوانیش وەك

فەلەستینیەکان ، سەرەڕای ئەو نابەرابەری هێزە عەسکەریەی دژیان کاری دەکرد ، لەنێو خۆیاندا مێژوویەکی ڕەشیان لە شەڕی ناوخۆ وبراکوژیان لەدوو خۆ بەجێهێشتبوو. ئێمەو ئەوان دووبزوتنەوەیەن هێشتا حکومەتین و حکومەتیش نین، ئاوەها بەئەمریکاییەکانەوە پابەندبووین ، گەر یەکێك مێژوویی شۆڕشی ئێمە و ئەوان نەزانێ ، وا مەزندە دەکات هەمووان لە قوونی CIA وە هاتووینە دەرێ ..

-٥-

سەرۆك لە پشت هەموو بڕیارەکانەوەیە، ئەوەی بیەوێت پرۆژەیەك پێشکەشی وەزارەتێك بکات ، ئەوەندەی ڕەزامەندی وەزارەت گرنگە ، سەد ئەوەندە ڕەزامەندی مەکتەبی سەرۆك و قەیتولی سەرۆك و فەراشی سەرۆك وخزمی سەرۆك گرنگترن لەحکومەت. حکومەت و بڕیارەکانی پڵنگن لە کاغەز ولە پەڕۆ دروستبوون، شێری ڕاستەقینە و خاوەن نەعرەتە و نەڕەن، سەرۆك و مەکتەبی سەرۆك و هەموو دەزگا ئەمنیەکانیش هەموویان لەژێر دەست و پابەندی بڕیاری سەرۆکن .
دیارە لێرەوە مەحسوبیەت و بەرتیلدان بە پیاوانی سەرۆك وحاشیەکەی ، مەرجێکی پێویستە بۆ سەرکەوتنی هەر پرۆژەیەکی ئابووری و تەنانەت سیاسیش ، گەندەڵی ئیداری لەنێو هێزێکدا کەهێشتا هەڕەشەی لەناچوونی خۆی ومیللەتەکەی لەسەرە ، مەترسیدارتر و ترسناکترە لە دوژمن خۆی ، بێگومان گەر گەندەڵی ئیداری خۆی لەخۆیدا دوژمنێکی سەرەکی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی نەبێت.
ئەمڕۆ لە کوردستانی خۆماندا ، مەحسوبیەت و گەندەڵی ئیداری خەریکە دەبێتە فینۆمینێکی دیاری بەرچاو ، دەبێت بەیاسا وڕێسایەك کەمرۆڤ لەبەردەمیدا تووشی سەرسامی دەبێت ، تەنانەت شیعر وچیرۆکیش بەمەحسوبیەت و ناسیاوی بڵاودەبێتەوە، میهرەجانەکانیش هەر بەو شێوەیە بەڕێوەدەچن، بەشێوەیەك کەهیچ فیلتەرێك نەماوە بۆ ئەوەی بزانین فلان یان فیسار کەلەو پلەی لێپسراوێتیە دامەزراوە ، بەتوا نای خۆیەتی یاوەکو مەحسوبیەتە. سەیریش لەوەدایە کەشاعیرێکی وەك شێرکۆ بێکەس لە چاوپێکەوتنێکیدا لەگەڵ گۆڤاری گوڵان ژمارە ٣٩٤ ی ٢٢ ی تەموزی ٢٠٠٤ دەڵێت : بۆیە بەڕاستی ئەو ئازادیەی لەکوردستاندا هەیە لەسوێد نیە!!، دەزگای (سەردەم) ی کەخۆی سەرپەرشتی دەکات ،کردویەتی بەنمونە!!. دیارە کاتێك گەندەڵی ئیداری لەشێوەی

مەحسوبیەت بگاتە دەزگایەکی ڕۆشنبیری ، ئیدی دەبێت ئەو فەرمانگەکانی دیکە چۆن بن!!. من دەتوانم بڵێم هیچ دەزگایەکی ڕۆشنبیری نیە لەدنیادا ڕۆمانی ڕۆماننوسێك بشوێنێت و بەسەقەتی بیخاتە بەردەم خوێنەران و بێ هیچ ڕێزدانانێك بۆ ساناترین پرنسیبی بڵاوکردنەوە،مومارەسەیەکە لە دەزگاکەی خۆیدا کراو پەیمانیدا چارەسەری بکات ، کەچی پێدەچێت ئەو ئازادیە بۆ مەحسوبگەران بوو ، نەك بۆ نوسەران ، بێگومان ئەم قسەیە بەئاسانی دەسەلمێنرێت، نمونەیەکی دیکە هەر لەو دەزگا ئازادەی خۆیەوە، وەرگێڕانێکی جوانی دلاوەر قەرەداغی شاعیر وهاوڕێم پێبوو ( مەسیح لەخاچ دەدرێتەوە) لای دەزگاکەی خۆی ( سەردەم) چاپ نەبوو ، نەك لەبەر ئەوەی دەقەکە جوان وەرنەگێڕدرابووە سەر کوردی ، یاخود فیلتەرێکی ڕاستەقینە هەبوو کەلەو بڕوایەدام دلاوەرو هەموو نوسەرێکی جیدی پێی خۆش دەبێت ، بەلام ئاخ لەدەست مەحسوبیەت!!، لەبەر ئەوەی چەند کەسێکی نێو دەزگاکە دلاوەریان بەدڵ نەبوو ، چونکە ئەو هەرگیز لەتاقمی مەحسوبگەران نەبووە وناشبێت، ڕۆمانەکەی بێ هیچ هۆیەك ڕەتکرایەوە، لەتاو مەحسوبگەران دلاوەر قەرەداغی شاعیر پەنای بردە بەر دەزگایەکی دیکە ، بەسوپاسەوە ئەو دەزگایە دەقی باشی بۆ خوێنەری کورد لاگرنگتر بوو ، وەك لە ناسینی شەخسی نوسەرەکە و ڕۆمانەکە ئێستا لەبەردەستی خوێنەری کوردیە.

گەر ئەو قسانە کەلەشاعیرێکی بەناوبانگەوە بکرێت و ئەو شاعیرە ئەو ئازادیە بەراوزد بکات بە سوێد و بەڵکو بەزیادیشەوە، ئەوا لەو تەسریحەوە دەزانین کەکەش و هەوای پێداهەڵدان و شاردنەوەی ڕاستیەکان گەیشتۆتە چ ئاستێکی ترسناك! ، کەزۆر جار فەوزا لە کەش و هەوای گەندەڵی ئیداریدا بەئازادی پێناسە دەکرێت ، بێگومان لەژێر چەتری ونبوونی یاسایەك . (بۆنمونە یاسای مافی نوسەر ومافی دەزگای بڵاوکردنەوە) کەبەسەر هەمووواندا بێ جیاوازی جێبەجێبکرێت، فەوزا دەبێتە بەئازادی ، بێگومان فەوزا ئەو ڕووبەرە فراوانە بۆ گەندەڵەکان دەڕەخسێنێ بەئازادی لیژنەدابنێن و ئەم وئەو فەرامۆشبکەن و زەوی بۆ ئەم وەربگرن و پلە بدەن بەو وئەوی دیکەی بەتواناش کەنارگیر بکەن..

ئەم شاردنەوەی ڕاستیەکان لەنێو فەلەستینیەکانیشدا دیاردەیەکی باوە، وەك ئەو تەسریحاتانەی لێپسراوە فەلەستینیەکان ، کەدەیانگووت لای ئێمە هەموو شتێك ئازادە ، بەمەرجێك دنیا لەتاو فەسادا ڕژابوونە سەر جادە!!.

دیارە ئێستا کاتی ئەوە هاتووە پێ پەردە قسەبکەین و تۆزێك لەموجامەلە دوورکەوینەوە بۆ ئەوەی بتوانین شتێك لەو گەندەڵیە تێبگەین کەخەریکە وەك کەڕووی هار بەدیواری ماڵی کوردیدا هەڵدەگەڕێت، هەمان گەندەڵی ئیداری وچەپەخۆریە کەئێستا دۆزی کوردی دەخاتە مەترسیەوە و ڕێگەنادات پرسیارو گومان لەنێوەندی سیاسی کوردیدا چەکەرەبکات ، خەڵکانێك دەکاتە پاڵەوانی سیاسەت وئیدارە ، کەلەیەکەم قەیراندا پشت دەکەنە هەموو کۆمەڵگەی کوردی ، گەندەڵی ئیداری بەشێوەیەك لەکوردستان چەکەرەی کردووە، کەماجستێرو دکتۆرا بووە وەرقەیەك ، ئەوەی یەکێك بناسێت وبەرژەوەندیەکی پێ جێبەجێ بکرێت دەتوانێت دوای وەرگرتنی چەند کۆرسێکی ئاسان و چەند تاقیکردنەوەیەکی ڕووکەشی ببێت بەخاوەنی بڕوانامە، دیارە نابێت ئەوەمان لەیادچێت کەئەمە بەبەرچاوی خەڵکانێکی دڵسۆز و خاوەن توانا دەکرێت، کەئێستا لەقۆناغی تەماشاکردنی ئەو گاڵتەجاڕیەدان ، بەلام لەداهاتوودا ئەو هەموو گاڵتەکاریەیان پێ قبوڵ ناکرێت ، ئەو هەموو تێکۆشەرە دێرینە دڵسۆزانەی نێو هەموو حزبەکان لەداهاتوودا ناتوانن ئەوە قبوڵبکەن ، کەفایلداران سەرەڕای ئاشکرابوونیان لەشوێنای خۆیان ماونەتەوەو هەندێکیان بەچەند وەلامێك لە سەر لاپەڕەی ڕۆژنامەکان خۆیان دەربازکرد، ئەمیان لە پێناو ئەوەی پیاوانی ئەمن خێزان و ماڵ ومنداڵەکەی ئازاد کەن و یەکێکی دیکە پەیوەندی بەسەفارەت وسەفیری ئێراقیەوە تەنها ئەوەندە بووە کەدایکی سەفیری حکومەتی (ئەنفال و کیمیاوی) مردووە ، وەك موسوڵمانێکی ئۆرگیناڵ سەردانی سەفیری کردووە و دڵنەوایی داوەتەوە، نازانم کێ دڵنەوایی خێزانی ئەنفال وکیمیابارانی هەڵەبجە وخێزانی بارزانیەکان دەداتەوە؟، کێ لەئێمە کەس وکاری لەئەمن وئیستخباراتدا زیندانی نەکران و کێ هەیە بەدەستیان ئازاری نەچەشتبێت؟ ، بەلام ئەوەی ئەو پۆزشانەیان بخوێنێتەوە وامەزندە دەکات کەتەنها کەس و کاری ئەم زاتە زیندانی کراون وخەڵکی دیکەش لە ئوتێلی پێنج ئەستێرەییدا ماوەی زیندانیان بەسەر بردووە.. هەر ئەوانەن ئێستا ڕێگرن لەبەردەم یەکگرتنەوەی دووئیدارەکە بەهەموو کێشەکانیەوە، هەر ئەوانەن لەبەر

چاوچنۆکی و دزی و فزیان چەندەها ترس و دڵەڕاوکێ فرێدەدەنە نێو کەشی سیاسی کوردیەوە، ترس لەوەی گەر ئێمە ئەوەندە کورسی وەزارەتمان لەحکومەتی یەکگرتوو کەمتر بەرکەوێت ، ئیدی ئەوە ڕۆژی حەشری حزبە و دۆڕاندنی حزب مسۆگەرە! ، هەر گەندەڵی ئیداری ولێپسراوە گەندەڵبووەکانن خۆیان بەسەرۆکەوە هەڵواسیوە و دەیانەوێت سەرۆك بکەنە فیگورێکی دیکتاتۆری بێ جیهانبینی وپاشان بیکەنە فیگورێکی کاریکاتۆری !! ، بەبێ ئەوەی ئەوە بزانن کەسەرکردە مەزنەکانی دونیا ئەوانەن فاکتەرێکی بەهێزی پاڵپێوەنەری کۆمەڵگەن لەقۆناغێکی نزمەوە بۆ قۆناغێکی دیکەی باڵا، سەرۆك ئەو فیگورە سەدامیە نیە کەگەندەڵبووەکان دەیانەوێت دایبتاشن، بەوشێوەی کەخۆیان دەیانەوێت، نەك بەو شێوەیەی لەنێو کێشمەکێشمی ڕووداو گۆڕانکاریەکاندا پەیدادەبێت. هەر ئەوانەن دژی هەموو دەرکەوتنی هێزێکی دیموکراسین، دژی هەموو شتێکن لە ژێر ناوی (ڕەخنە) دا خۆی شێوەباز بکات و بەردەوام خەریکی ڕاپۆرت نوسینین. هەر ئەوانەن ئەو قەدەریەتە سەخیفە لەنێو نێوەندی سیاسیدا بلاّودەکەنەوە کەئەمریکاو هێزی دەولی بڕیاردەرن ، هەر وەك چۆن کاتی خۆی دەیانگووت ئێران و تورکیا و هێزدزلەکان بڕیاردەرن، بۆ هیچ نا بۆ ئەوەی خەڵك و نێوەندی سیاسی لە بێئومێدی و قەدەریەتێکدا نقوومبکەن، بۆئەوەی ئیدی چوونە نێو باوەش و لەگ لەگەو ماستاوساردکردنەوەو مەحسوبیەت و فەساد درێژەی هەبێت. دەبێت ئەوانە ئەوە بڵێن ، بۆ ئەوەی خەڵکی کوردستان مێژووی خۆیان لەبیر بکەن،ئەوانە بیریان چوو کاتێك شۆڕشی کوردی خەباتی کردووە تەنانەت خوداش لە پشتی نەبووە، ئیدی ئێستا بۆچی نەتوانین ئیدارۆچکەیەك ڕێکبخەین وهەڵوێستەیەکی یەکگرتوویمان هەبێت سەبارەت بەکەرکوك و فراوانکردنی ئازادیەکان لەکۆمەڵگەی کوردیدا؟!، ئیدی بۆچی ئەوەندە ڕیشی خۆمان بدەین بەدەست ئەمریکاییەکان ، بەمەرجێك لەوەتەی سیاسەت هەیە کێشمەکێشم هەیە!!.

وەلاّمی ئەو پرسیارە سادەیە ئەوەیە، گەر سیاسەتێکی جیدی بوونی هەبێت ، ئەو برادەرە ناتوانێت ببێت بە ئەندامی پەرلەمان، خۆ گەر مەحسوبیەت نەبێت ئەوا هەندێکیان دوکانێکی لاکۆڵانیشیان بدەیتێ ، ناتوانن بەڕێوەی بەرن !!. ئیدی چۆنە گەر هەموو شتێك جیدی بێت و لەسەر وورد و درشت موحاسەبە بکرێن؟!، مەبەستم ئەوەیە ، چۆنە گەر هێزە دیموکراسیەکان لەبرەوپێداندانداا بن و ئەوان بخرێنە ژێر

چەتری دادگایی کردن و موحاسەبەکردن، کەئێستا خۆشحاڵانە لەکوردستاندا هێزە دیموکراسیەکان وگروپەی گوشارەکان لێرە ولەوێ دژی ئەو فەسادە لەکارن و زۆربەی رۆژنامە و ماڵپەرە ئازادەکان گەواهی ئەو ڕاستیەن، دیارە ئەمانە لەئاستی پێویستدا نین و بەردەوام لەلایەن گەندەڵبووەکانەوە هەوڵی ڕێچکەگۆڕینیان لەگەڵدا دەدرێت، ئەمانە لەهەموو شوێنێکدا هەن هەمیشە کاریان ترس بلاوکردنەوەیە ، هەموو کارێکیش جیدی بێت ولەبەرژەوەندی ئەوان نەبێت ئەوا ئەقڵی موئامەرایەتیان ئەوەندە بەعسیانە کار دەکات، بەکردنی سەرۆك بەو داهۆڵەی ئەوانی دیکەی خاوەن پرۆژەی پێ دەترسێنێن و وەك دوژمنێك لەلای سەرۆك دایدەتاشن و کێشەی خۆیان و ئەوان ، کێشەی فایلەکانیان و خەڵك دەکەن بەکێشەی نێوان خەڵکانی خاوەن ڕەخنەو مەکتەبی سەرۆك و سەرکردە وسکرتێری گشتی و ...هتد ، و خۆیان بەو شێوەیە قوتار دەکەن ، بەشێوەیەك پیاو هەستدەکات کەسەرۆك لای ئەوان کار دەکات ، نەك ئەوان لای سەرۆك کاربکەن..

-٦-

عەرەفات لەم ماوەیەدا ئینکاری لەوە کرد کەهیچ کێشەیەك هەبێت لە نێو دەسەلاتدا!!، کاتێك ئەو وەلامی رۆژنامە نوسەکانی دەدایەوە لەپشتیەوە (ئەبو ردینە)ی ڕاوێژکاری بەگوێچکەیدا دەچرپاند تەنانەت عەرەفاتی نەگبەت و ڕدێنە ئەوەیان لەبیر چووبوو کەکامێرەیان لەسەرە ، ئەوەی لێوجولاندنی ڕدێنەی سەرنج بدایە ، دەیزانی دوای یەك چرکە عەرەفاتیش ئەوە دەڵێت، دیارە گەندەڵبوونی ئیداری وایکردووە کەسەرکردە بکاتە بوکەشوشەیەکی گاڵتەجارو هەڵسوڕا و بەدەزووی نەبینراوی ڕاوێژکار و گۆرەوی شۆر و مەیتەرەوان و قەیتول و لێبو ك و چێشتلێنەری سەرۆك و سەرکردەش دەکاتە بڕیاردەری جێبەجێکەر و کاریکاتۆر ..

لەو دووبارە کردنەوەی ووشەکانی ئەبوڕدێنە، عەرەفات بێ بیرکردنەوە ووشەیەکی ئەوی دووبارەکردەوە ئەویش ووشەی (تنقلات) بوو ، دیارە ڕدێنە مەبەستی لەبەکارهێنانی ئەو ووشەیە شێواندنی چەمکی ڕیفۆرم و جەنگ دژی فەساد بوو ، بەوەی ئەو ئیجرائاتانەی ئێستا دەکرێن ملدان نیە بۆ داواکاری ئەوانە ، بەڵکو تەنها گواستنەوەیەکە ( تنقلات) ە لە پۆزیسیۆنێکەوە بۆ ئەوی دیکە!!، بەلام کەڕۆژنامەنوسە زیرەکەکان ئەو ووشەیان گوێلێبوو ، نەیانهێشت وابەئاسانی تێپەڕ بێت بەسەر

عەرەفاتدا و داوای ڕوونکردنەوەی ئەو ووشەیان لێکرد ، ئیدی لە تواناداا نەبوو ئەبو ڕدێنە و تاقمی سەرۆك فریای کەون، عەرەفاتی هەژار بەرۆژنامەنووسێکی گووت کە پێدەچوو بیناسێت : سەیرە تۆ لێم دەپرسیت تنقلات چیە، برام خۆتو پیاوێکی عەسکەری بوویت !! .. لەوکاتەدا قاقا پێکەنیم لەبەر ئەوەی شتێکی نوکتەیەکی ئاوەهام لای خۆمان بیرکەوتەوە، کەسەرکردەیەك کاتی خۆی لێیان پرسیبوو ڕات چیە بە شەڕی جەمسەرەکان و شەڕی سارد؟ ، دیارە ئەوێك کەکوردایەتی لای ئەو هەر پارەکێشانەوەبوو لەئیتلاعات و میت و موخابەرات و خوادەزانێ کێهای دیکە، لە شەڕی جەمسەرەکان تێنەگەیشتبوو ، بەلام هەر کەشەڕی ساردی بەرگوێکەوت گووتبووی : بڕوا بکە کات هەبووە ئێمە شەڕمان کردووە، کەتا نیوەمان لە بەفردابووە..

گەندەڵی سیاسی وئیداری لەکوردستاندا وەك ئاوێکی لەسەرخۆ وەهایە کەبۆ ژێر بالاخانەی ماڵی کوردی بەردراوەتەوە، پێش ئەوەی نارازەیی و گوتاری ڕەخنەیی جیدی ببێتە تورەبوون، دەبێت بەزۆر بەهاو هەڵسوکەوتدا بچینەوە، کەرێگرە لەبەردەم پێکهاتنی کلتوورێك بۆ دیموکراسی ، کلتوورێك بۆ دیموکراسی بنچینەی پەرەپێدانی دیموکراسیەتە بەهەموو مانافراوانەکەیەوە، باناورێکی کورت لە ئەزمونی فەلەستینیەکان بدەینەوە، بۆئەوەی لەئاوێنەی ئەوانەوە ئەو هەموو فایلدارو کۆنەبەعسی وماستاوسارکەرەوە و مەحسوبیەتە ببینین گەر لەڕەگەوە دەریانکێشین ئەوا نەك هەر کۆمەڵگە بۆگەندەکەن، بەڵکو سەرکردە لە فیدائی و سەرکردەیەتی بەرێزی میللەتەکەیەوە دەکاتە ئەو داهۆڵە گاڵتەجارەی گەر گەندەڵبووان بەگوچێکەیدا نەچرپێنن ، ئەوا خۆی هیچی دیکەی پێ نیە بیڵێت!، لەجیاتی ئەوەی ( یاجبل مایهزك ریح) حەماس بەخش بێت، خەڵکی وەك نوکتەیەکی خۆش قاقای پێ پێدەکەنن...

## زللەیەك بدە لە سەرکردە ،بۆ ئەوەی وەئاگا بێتەوە....

لەمانگی ڕابووردودا مامۆستایەکی بێکار( ینێیس ئامۆسێر) لە بەیەگەیشتنێکی نێوان ئەندامانی حیزبی سۆسیال دیموکرات و گێهارد شرودەری سەرۆك وەزیرانی ئەڵەمانیا ، زللەیەکی دا لە شرودەر !!، شرودەریش وەك هەموو هاوڵاتیەکی ئەڵمان بەحونجەتی تەشەرەپێکردن و ئازاردانی جەستەیی دەعوای لەسەر مامۆستاکە قەید کرد ، مامۆستا بێکارەکەش لەلایەن خۆیەوە بۆ بەرگری لەخۆی پەنای بردۆتە بەر پارێزەر، ئیدی یان دەبێت شرودەر دەست لە داواکاریەکەی بکێشێتەوە یاوەکو دەبێت وەك هەموو هاوڵاتیەك و شکایەتکارێك بەرامبەر دادگا بێتەوە.

ئەم زللەیە لەلایەن زللەلێدەری شرودەر، زللەیەکی تەشەرە پێکردن نەبوو، بەقەد ئەوەندەی وەك [ هاوارێکی ناڕەزایی بێکاران] لەقەڵەم درا ، نەك وەك هیچ کردەیەکی نامەسئولانە ئامانجی بریندارکردنی کەسی شرۆدەر بێت ، بەڵکو مەبەستی شرۆدەری سەرۆك وەزیرانی ئەڵمانیا بوو وەك فەرمانبەرێکی گەورەی حکومەت و ئەندامێکی باڵای حزبی سۆسیال دیموکرات ..

یەکێك لەو پرسیارانەی لەخۆم کرد ئەوە بوو ، چ دەبوو گەر هاوڵاتیەکی کورد لەدوای دەرچوونی یاسای نەتەوە یەکگرتووەکان زللەیەکی بدایە لە سەرۆکێك ؟!!، نەخێر بۆ ئەوەی خوێنەر زیاتر بە ئانارشیست و فەوزەوی لەقەڵەمم نەدات، داوای ئەوە ناکەم بەڵکو چ نەبێت لە لێپسراوە حزبیەکەی خۆی تورە بێت؟ !!، چ نەبێت بتوانێت لە حەوشەی مقەڕی حزب هاوار بکات و تورەبێت، بێئەوەی بەشەق بیکەنە دەرەوە!!، تۆبڵێی شتی وەها ڕوویدات؟!، کە سەرۆك کاتێك هەست بە ئیهانە بکات لەلایەن هاوڵاتیەکەوە ئەویش وەك گێرهارد شرودەر ڕێگەی یاسا و دادگا بگرێتە بەر؟!! ، بێئەوەی بە حیمایەکانی بڵێت: ئا بزانن بۆ ئەوەندە بێحورمەتە!!... خۆ ئەوەتا حاکمێکی دادگای سلێمانی لەجیاتی ئەوەی ڕاوێژ بەیاساناسان بکات ، دەیەوێت بپرسێت: ئایا دەشێت وەزیرێکی ئافرەتی حکومەتێکی لۆکاڵی بێتە نێو هۆڵی دادگا لەبەر ئەوەی دەعوای فەسادی ئیداری لەسەر قەید کراوە!!.. ئەمانەو چەندەها پرسیاری دیکە لەو ساتەدا لەخۆمم دەکرد و وێنەزەدی ئەو هەڵوێستانەم دەکرد کە

لەکردەیەکی ئاوەها دەکەویتەوە، خەیاڵم بۆ ئەوە دەچوو گەر شتێکی ئاوەها ڕووبدات ئەوا دەتوانین هەناسەیەك هەڵبكێشین و بڵێین ماڵی کوردی هێشتا خێری تێدا ماوە.

مۆڵەتێکی کورت لەخوێنەری ئازیزم وەردەگرم بۆ ئەوەی ئەمجارە لەجیاتی باسکردنی کێشەی دیموکراسی لە نێوان نموزەجی ئەوروپی وئەمریکایی و پەیوەندی بەدۆزی ئەنتی ئەمریکانیزم ، خەیاڵ و مەزندەییەکانی خۆم سەربەست بکەم بۆ ئەو زللانەی کە پێویستە هاولاتی کورد لە چوارچێوەی پرۆسەی بەدیموکراسیزەکردنی ماڵی کوردیدا لە زۆر دۆست و لێپسراو و ڕۆشنبیری بدات ، نەك خوانەخواستە بۆ ئیهانەکردنیان، بەڵکو بۆ ئەوەی لەو بێهۆشیەیان وەئاگایان بهێنێتەوە. زللەکان دەبێت بدرێت لە زۆر کەس و لەزۆر شوێنی و بۆ نەی جیاوازدا دەبێت بەئەنجام بگەیەنرێت، لەبەر ئەوە مەجبوورم بەم شێوەیەی خوارەوە کلاسیزەیان بکەم :

یەکەم زللە بدە لەفایلچییەك: تاقیبکەرەوە هاولاتی خۆشەویست و زللەیەك بدە لە فایلچییەك کەساڵاهای ساڵە ئێمەی هەڵخەڵەتاندووە، بزانە ئەو زللەیە هەزار قات لە زللەکەی (پنێیس ئامۆسێر) کاریگەرتر نابێت.. ئیدی مەترسە بائەو فایلچییە ئەندامی مەکتەبی سیاسی یان عەسکەری حزب یاوەکو هەچ تەنەکەخۆڵێکی سیاسەت و بیروباوەڕ بێت کەئەوی لەخۆ گرتووە، گەر ئەویش جورئەتی هەیە بابێت و دادکات لێبگرێت ، ئینجا بزانە لەو ڕۆژەش پەشیمان نابێتەوە کەبڕوای بەفیدرالیەت و دیموکراسیەت هێنا..

زللەیەك بدە لەئەندامی پەڕلەمانێك: کەبەقاتی فەرهود و( سەرانە سەندنەوە) دەچێتە نێو هۆڵی پەڕلەمانەوە و نوێنەری زیاتر لە چەندەها هەزاری خەڵکی وەك ئێمەیە ، لێی بپرسە جیاوازی لەنێوان کۆبوونەوەکانی پەرلەمان و حیزب چیە؟! ، گەر وەڵامەکەی زانی ئەوا خۆت بچۆ لەداداگا داوی لێبووردن بکە و بڕیاری مەحکەمەش پیاوانە بگرە ئەستۆی خۆت ، بەڵام تەئکید بە ئەو هەمیشە هۆڵی کۆبونەوەی پەرلەمان و حزبی لێ تێکەڵ بووە ، بەڵگەش شەڕی ناوخۆ و ...هتد

زللەیەك بدە لە شاعیرێك و کۆلکە ڕۆشنبیرێك: زللەیەکی لێبدە، ناقەیدی نیە، وەکو چۆن لەسەر مەسەلەی ناردنی فرۆشتنی زرێپۆش بە تورکیا چەند ساڵێك لەمەوبەر ئەندامێکی حزبی سەوزی ئەڵمانی پۆشکافیشەری بەر تەماتەو ڕەنگی سووردا ، تۆش ئەی هاووڵاتی بۆ ئەوەی بزانیت دیموکراسیەت و ڕۆشنبیری جیدی و شاعیران لەچ شوێنایەکی ئەم دنیایە وەستاون و زوڕنا بۆ کامە وەزیر و گزیر و قاچاخچی و فایلچی و مەیتەرەوانی پاشاو قەیتولی دیوانی وەزیرەکان لێدەدەن ، لە کۆڕێکی شیعری یان لە مێزگردێکدا تەماتەیەك بگرە لەو کۆلکە ڕۆشنبیرانەی هەموو گەندەڵیەك شەرعیدەکەن و وەکو حیکمەت بەخەڵکی دەفرۆشنەوە !! ، گەر بانگی ئاسایشی بۆ نەکردی ، ( بێگومان دەیکەن ، چونکە پەیوەندی نێوان ئاسایش و ئەوان زۆر لەوە پتەو ترە کەتۆ تەسەوری بکەی، یاخود بەپێنی خۆمان بێت لەوانەیە دەزگای (..) یاخود (...) لەنیوەشەودا بتفرێنن و تێتگەیەنن تەماتە چۆن لەسەر کێڵگەی دەمووچاو سوور دەبێت!!، گەر ئەوەیان نەکرد و دادگایان لێگرتی ئەوا ئەوانیش هەزار خۆزگە دەخوازن بۆ زەمەنی دیکتاتۆر، کەدەرسی کوردیان بەموخەبارات و ئەمن دەگووتەوەو بەدزیەوە بەرازیلی و توتێتا فەلاحیان وەردەگرت و ناوی ئەو ئەدیب وڕۆشنبیرانەیان دەدا بەموخەبارات کە سەربازی هەڵاتوون یان لەدەرەوەن و هەمان دەستەواژەی جارانینان لەڕاپۆرتەکانی ئێستا دووبارە دەکردەوە[ ئەمانە دژی شۆڕش و سەرکردەن]...

هاوڵاتی و شاعیری ڕاستەقینە و نوسەری جیدی زللەیەك بدە لەپەناگوێی ئەوانە و مەترسێ ، چونکە چەندەها گوڵی موحەبەتی شیعر بەو زللە و تەماتە تێگرتنە لە ڕۆحتدا دەگەشێنیەوە ..

زللەیەك بدە لە دکتۆرێك: کەوەك قاچاخچی شەکروچای زەمەنی شەڕی ناوخۆ ، مامەڵەی ئەوەت لە گەڵدا دەکات بەچەند هەزار دینار نەشتەرگەریەکت لە خەستەخانەی حکومیدا( نەك ئەهلی ) بۆ دەکات و یەك فلسیش نایەتە خوارەوە،

لەوانەشە فنچکەجگەرەیەکیش لە وورگت یاوەکو لەمیزەڵدانتدا جێبهێڵێ . زللەیەکی لێبدە و مەترسە ...خۆ گەر هاتە دادگاوە ئەوا وەکو عیراقیەکان دەڵێن: نور علی نور ..

زللەیەك بدە لەو سیاسیەکوردەی زۆر بێشەرمانە چەمکی ئاشتبوونەوەی نیشتمانی پابەست دەکاتەوە بە چەمکی ئاشتبوونەوە لەگەڵ حزبی بەعس !!، کەهاتە خوارەوە یەکسەر بەردەمی پێبگرە و زللەیەکی لێبدە!!، گەر دادگاشی لێگرتی ئەوا تەئکیدم بەکۆمەڵێك ڤیدیۆ کاسێتی دۆکۆمێنتاری قەتلوعام و گوللەبارانکردن کەلەلایەن بەعسیەکانەوە تۆمار کراوە، لەگەڵ خۆتدا دەبەیە هۆڵی دادگا، هەر بۆ هیچ نا، تەنها بۆ ئەوەی بتوانیت باس لەو زللە ڕەمزیە بکەی کەدژی پابەند کردنی چەمکی ئاشتبوونەوەیە لەنێوان ئاشتی وتاوانکاریدا...

ئەندامانی حزبە کوردیە دڵسۆزەکان و تێکۆشەرە دێرینەکان زللەیەك بدەن لە کۆنەبەعسیەکی بێ چاو و ڕوو :کەلەلایەن مەسئوولێکی حزبەکەتەوە لەتەنیشت نەگبەتێکی وەکو تۆ قوتیان کردۆتەوە، ئەوێك کەکاتی خۆی لەلایەن ئەبو فلان وفیسارەوە لەفەرمانگە یاوەکو هەر دەزگایەك بووبێت وەك سەگی پاسەوان جاسوسی و شتی تریشی بۆکردوون، ئێستا وەك تۆیەك کەچەندەها ساڵە بۆ کورد و کوردایەتی لەڕێگەی هەر حزبێکی سیاسی کوردیەوە بێت خوێنت بووە بەئاو ، ئەوێکی کۆنە بەعسی بەئاسانی دێتە ناو کۆبوونەوەکان، وەك تۆو بگرە زیاتریش دەنگی دەڕوات و دەنگ بۆ ئەم وئەو دەدات...

پێشمەرگەو کادێرێکی دڵسۆزی حزبێك پێیگووتم : بڕوابکە گەر ئەو کۆنە بەعسیانە دەنگت بۆ نەدەن ، ئەوا هەزارەها دڵسۆز و کادێری چالاکی ئەم حزبە دەبێت پاڵ بەعەرەبانەوەبنێن .. فەیدی نیە هاوڕێم ئەمجارە ئاقیبکەئەوە، بەتایبەت لەو کاتەی ئەو کۆنە بەعسیانە لەکۆبوونەوەکاندا باسی بەهەشتی بارزانی یاوەکو شەهیدانی شۆڕشی گوڵان یاوەکو شەهیدانی ڕێگەی کوردایەتی دەکەن ، چونکە ئەوان کاتی خۆی فێرە پێداهەڵدانی قائیدی زەرورەو شەهیدانی قادسیەو ئومولەعاریك بوون ، ئەوان لەئێوە زیاتر باس لە شەهیدانی ڕێگای ڕزگاری دەکەن، هەر لەو کاتەدا بۆیان

هەستن و یەکی زللەیەکیان لێبدەن ، چونکە ئەوانە دوا کەسن لەم دنیایە کەباس لەشەهیدان بکەن، خۆ گەر هەموو یەکێك ئاوەهای کرد ئەوا هەموو حزبەکوردیەکان پاکـدەبنەوە، گەر هەموو کۆنە بەعسیەکانیش بچن دادگاتان لێبگرن ئەوا ئیدی حزب و خۆشتان لەو ملۆزمانە قوتـار دەکەن. بیرتـان نەچێت ئەی ئەندامان و کادێرانی هەموو حزبە کوردیەکان ئەو زللەنەتـان بەنەبەردیکی گەورە لەقەڵەم دەدرێ ، ئاوەهاش لەهەموو کەسێکی بیرۆکرات و فەساد دەکات لەداهاتوودا پێش ئەوەی قـاچ خوار دابنێت حساب بۆ زللەکانتان بکات.

زللەیەك بدە لەو لێپسراوەی لەپرلە موخەرییەوە بووە بە پاسەوانی ( البوابە الشرقیە للوطن العربی) و کاتێکیش یەکێك لەکەناڵە عەرەبیەکان لێیان دەپرسن ئـایا خەونی کوردیتان هەیە، بە سەربەخۆیی؟! دەڵێت نەبابە.. ئەی ئەوە نیە ئێمە ڕاکەڕاکەمانە بۆ بەردەمی عەمروموسا و جامیعەکەی!!. زللەیەکی لێبدە نەك خوانەخواستە بۆئەوەی کەرامەتی بریندار کەیت، بەڵکو بۆ ئەوەی نەبێت بەژێر دەست و قـاچی ئەو عێراقیـانەی بەعەگال و چەڕاویەوە نوێنەرایەتیتـان دەکەن و گەر تەنها باسی کورد بکەی بەسەهوش بێت، ئەوا خێرا پێت دەڵێن : یابە شنو عیب ماکو کردی وعربی کلنا عراقیین!!. زللەیەکی لێبدە و پێی بڵێ بچۆ بەو سەرۆکە بڵێ مادامەکی ڕەمزە نەتـەوەیی و مەزهەبیەکان لای ئێوە مانـای نیە و هەموو عیراقیینین ، بێزحمەت ئەو عەگال و چەڕاویە دانێ ، بۆ ئەوەی ئێمەش وەزیری دەرەوەمان بە جلی کوردیەوە نەنێرین .. زللەیەکی لێبدە بۆ ئەوەی ئەو سەرکردەیەی ساڵەهایە بەشاخەوەیە نەبێت بە فەڕاشی ئەو سەرۆکەی کەتـاوەکو دوێنێ بازرگانی دەکرد و ئەمڕۆش بەیەك چەقەنەی کوردان بەخۆی عەگال و عەشیرەتیەوە هاتە سەر حوکم ...

زللەیەك بدە لەڕۆژنـامەنووس و ئیعلامیەکی درۆزن و بێتوانا: یەکەم زللە من لێی دەدەم چونکە دەبێت پێش ئەوەی ڕیپۆرتـاژ بنووسێت فێرە کوردی بێت!!، نەك فاریزە بەگونیەو و نوقتە و سەری دێریش بەر جادەبکەوێت و دێر بپەڕێنێت و دەستکاری تێکستەکان بکات، گەر دادگای لێگرتم ئەوا دەتوانم بەئاسانی باس لە پەیوەندی نێوان

دروستبوونی مێژوویەك بۆ کلتوور بکەم کە هەرگیز بێ زمانێکی پتەو و داڕێژاو نەبێت ناتوانێت ببێت بە دەمووچاوی کلتووری میللەتێك ..

ئەوە چیرۆکێکە دەتوانم بەباشی بیگێڕمەوە، بەڵام تۆ زڵلەی لەسەر ئەوە لێبدە، بۆچی ڕۆژنامەکەی پڕە لە نووسینی مەحسوبیەت و برادەرانی گەڕەك و حیزب و چایخانەی تاوڵەچیە موحتەریفەکان و ئەو هەموو مەعریفە کاڵو کرچە و وفۆکۆ ساویلکەیەو ودێریدا و نیتچە سەقەت و بێتامانە؟! ، بۆچی ئەو هەموو گووتارە جوان و لێکۆڵینەوە بەسوودانە بڵاوناکەیتەوە کە لەچەکمەجەی مێزەکەتدا فەرامۆشت کردوون؟، گەر یەکێکیش لێت بپرسێت دەڵێیت: کوا شتی وام بەدەست نەگەیشتووە یاخود گەر نوسەرەکە لەمەنفا بژی ئەوا دەڵێیت کوا ئیمایلەکەم بۆ نەکراوەتەوە!!، یاخود دوا نوکتە ئەوەیە، کەئەمەشیان لەمن ڕوویدا دوای ئەوەی دەزگایەك سێ فەسڵی ڕۆمانەکەمی سەقەتکرد لەدوای لێکۆڵینەوەو لیژنە ولیژنەکاری گووتیان : ڤیرۆس داویەتی لە داتای ڕۆمانەکەت، بەوەش نەوەستابوون پێمیان ڕابواردوو نووسیبوویان : خۆشت دەزانی کەڤیرۆس بیدات لە فایل چی لێدەکات... گەرخوێنەر یاوەکو هەر ڕۆژنامەیەك وویستی ئەوا ئەو نامەیەی بۆ فاکس دەکەم کەلەو دەزگا عەلەمانیەوە کاتی خۆی پێم گەیشتبوو، گەر زیاتریش بیەوێت ئەوا دەقی گفتوگۆی تەلەفۆنی حۆم و سەرۆکی ئەو دەزگایەشی بە تۆمارکراوی لەسەر کاسێت بۆ دەنێرم کە پەیمانی دامێ لەو مەسەلەیە دەکۆڵێتەوە و منی ڕۆمانووسی ساویلکە چاوەڕێم کرد کەچی دەرکەوت کاك ڤیرۆس ڕۆمانەکەمی شێواندووە!!..

تاوەکو ئێستا من دەمەوێت ئەو ڤیرۆسە بناسمەوە کەناوی نیە لە جیهاندا ، ڤیرۆسێك هەقە دەزگای چاپ و لیژنەکە بۆ دکتۆر نۆرتنی بنێرن و ناوی لێبنێن ئەو ڤیرۆسەی زیرەکەی ڕۆمان دەخوێنێتەوەو زیرەکانەش دەیشێوێنێ ...

هاوڵاتی کورد زڵلەیەك بدە لەو دەزگا ئیعلامیانەی، ئەدەب تێکست و ڕاستیەکان دەشێوێنن، بەرهەمی داهێنەران فەرامۆش دەکەن و فەسادی ئیداری دەخەنە نێو مەسەلەی کلتووریەوەو شیعرو ئەدەبیش بەدەعووەت و مەحسوبیەت بڵاودەکەنەوە، گەر زۆریش پێدابگری قەناعەتت پێدەکەن کەئەدەب و چیرۆك تەنها بۆ پاشکۆکان باشە و

کێ چیرۆك دەخوێنێتەوە و لێگەڕێ بائەم هەموو تێکستە سەقەتە تێپەڕێت ، ئەوە باشترە لەو هەموو تێکستە جیدیە زەرەد بەنەتەوەو سەرۆك دەگەیەنێت ..

زللەیان لێبدەن وگەر هاتیشنە دادگا ئەوساکە بەبەڵگەوە باس لەو هەموو ژەهرەیان بکەن کەلەڕێگەی ئەوانەوە کۆمەڵێك نەخوێندەوار بوون بە ئەسپسواری سیاسەت و موفەکیری میللەتی کوردی هەژار ..

دوا زللە بدە لەو سەرکردانەی لەهەست کردن بە کەمی و پلە دووهەمیان گەر بۆ دووڕۆژیش بووایە دەبوایە خۆیان ببوونایە بە سەرۆکی ئێراق ، یاخود یەکێکیان لەئاشوری وکلدانیەکیان هەڵبژاردایە ، بۆ هیچ نا تەنها بۆ ئەوەی لەدنیای تێبگەنن ، کە لەوڵاتی فیدرالدا سەرۆك بوونێکی ڕەمزی نیشتمانیە و مەرجیش نیە پەیوەندی هەبێت بەزۆرایەتی وکەمایەتیەوە ، سەرۆك لە وڵاتێکی فیدرالی وەك ئەڵەمانیا تەنها لەپرسیارە گەورەکانی کۆمەڵگە و مۆراڵ و ئاین و کێشە فیکری و مەزهەبیەکانی نێو کۆمەڵگە و تەنانەت موزیك و پەروەردە قسە دەکات . مەرج نیە تەنها عەرەب لەم وڵاتە ببێت بەسەرۆك ، بائێستا ئاشوریەك یاوەکو کلدانیەك ببێت بەسەرۆك ، بۆ ئەوەی نموزەجێکی تازە پێشکەش کەین لەمانای پێکەوە ژیان و فرەنەتەوەیی ئێراق ..

زللەیەکیان لێبدەن کاتێك دوای ئەوەی هەمانەکەیان لەدەست دەرچوو ، ئینجا بیر لە گوشار خستنە سەر ئەمریکا دەکەن و دوای ئەم هەموو خۆ گیف کردنەوە، زۆر بەئاسانی پاشگەز بوونەوە !!، دەتانەوێت دڵ بەوە خۆش بکەن و خۆتان و خەڵکی هەڵخەڵەتێنن و پشی پشی خەڵکی کوردستان بکەن ، بەوەی قەیدی نیە، ئەی ئەوە نیە وشەی فیدرالی هاتووە لە پڕۆتۆکۆلەکەی نەتەوەیەکگرتووەکان..

زللەیەکیان لێبدەن و پێیان بڵێن ئافەرین سیستانیەکی خرفی ئێرانی زۆر لە ئێوە باشتر لەمانای سیاسەت تێدەگات و باشیش سیاسەت پابەند دەکات بەجیهانبیەك کەخۆی بڕوای پێیەتی هەر بۆیە مەلایەکی ئاوەها پیر پێویستی بەوە نیە بێتە نێو حکومەتێکی کاتی و لەبەردەم ئەمریکیەکاندا دابنەوێت ، لەبەر ئەوەی ئەو ڕۆژنامە و کتێب دەخوێنێتەوە، دەزانێت ئەمریکا چی دەوێت و چۆنیش گوشاریان لێدەکات. کەچی

ئێوه ئەم هەموو ڕۆشنبیرو سیاسیه دڵسۆز و ڕۆژنامه ئەهلیه ئازادانه، ڕۆژنیه ڕاوێژتان پێشکەش نەکەن ، کەچی هەر ئاگات لەخۆشتان نیه و گوێ لەکەسیش ناگرن.

زللەیەکیان لێبدەن وبیانێرن بۆ قوتابخانەی ئاخوندێکی وەك سیستانی بۆ ئەوەی فێری ئەوه بن کەسیاسەت و جیهانبینی دووشتن لێك جودا نابنەوه، ئەوەشی سیاسەت بێ جیهانبینی دەکات ، لەلایەن بێهێزترین هێزی سیاسی ئەم دونیایه بەهێند وەرناگیرێت ..

زللەیەك لەسەرکرده بده وپێی بڵێ : بڕۆ گەر عەرەبیش نازانی ، بچۆ دوو لاپەڕەی ڕۆژنامەیەك ئازاد بخوێنەوه ، یاخو چ نەبێت ڕۆژی کاتژمێرێك تەرخان بکه بۆ سەیرکردنی ماڵپەڕه کوردیەکان ، بۆ ئەوەی بزانیت لەم دنیایەدا چ باسه....

ئیدی من لەبڕوایەدام زللەکەی ینێیس ئامۆسێر زۆر زللەی ڕەمزی دیکەمان لابەجێدەهێڵێت ، کەهیوادارم خوێنەری ئازیز و هاولاتی کورد خۆی بیر لەهەندێکی دیکەی بکاتەوه ، زللەیەك بۆ ئەوەی بەشێك بێت له تراديسيۆنی دیموکراسیەتێك کەخەریکه له لایەن فەسادی ئیداری و کۆنه بەعسی و نەخوێنەوارنی سیاسەت و بەناو ئەدەبیی کال وکرچەوه بەرەو شێواندنێکی ئێجگار ترسناك وەریدەگێرن، زللەیەك کەپێویسته هەمووان لەم ئەمڕۆبەدوا بیری لێبکەینەوه و لەکاتی خۆیدا بەئەنجامی بگەیەنین ...

## لەنێوان مردن و ونبووندا

## بەیادی مەرگی (عوسمان شەیدا) ی شاعیر

١

زۆرم پێویست بوو هێز بدەمە خۆم بۆ ئەوەی لەبەرامبەر لاپەڕەیەکی سپی ڕابمێنم و ئەم چەندە دێڕە بنوسم، کەنەك تەنها بەئازارەبۆم ، بەڵکو بەتۆپزی چەندەها یادوەری بەدووی خۆیدا ڕادەکێشێت، بەبێئەوەی بزانم بۆچی من لەماڵئاوایی هەتایی هاوڕێمان (عوسمان شەیدا) ترساوم!، ترسێك کەلەزۆر کون و لەبەرەوە پەلاماری دەدام بەبێئەوەی بزانم چیە و لەکوێوە سەریهەڵداوە، بۆچی بەدوومەوەیە ، وەك بەشێك لەتارمایی نوسینێك کەهێشتا کامڵ نەبووە، بێوازم دەکات !، هەموو نوسینە ناکامڵەکانیش وەك تارمایەکان وەهان هیلاك و ترسناك و دوژمنکارو بێوازکارن.

٢

لەیادی شەیدای شاعیردا هەوڵدەدەم لەو تارماییە تێبگەم کەبەدوژمنکارو تێکدەر ناوزەدمکردن، بەجۆرێك کەهیچ بوارێك بۆ گومان نەهێڵمەوە کەنوسینە ناتەواوەکان ، مەرگ ڕاگەیاندنێکی نوسەرن ، مەرگێك زیاتر لە گومکردنی نوسەرەکە و ونبونی لەنێو باخچەمامەخولەیەکانیدا خۆی نیشاندەدات، مەرگێك مەرگێکی داهێنەرانە نیە بە چەمکی ڕۆلان بارت ، بەڵکو مەرگێکی ڕاستەقینەیی جەستەی کۆمەڵایەتی و بوونی کۆمەڵایەتی نوسەرە لەنێو ڕۆژانە ژیاندا، نەك ژیان خۆی.

٣

جاك دێریدا لەیادی (مۆریس بلانشو) دا دەڵێت: ون بیت بەبێئەوەی بمریت ، یاخود بمریت بەبێئەوەی ون بیت،ئەم ئەڵتەرناتیفانە ئەوەندە ئاسان نین ... ئێمە دەتوانین بڵێین کە ئەو مردووە بەبێئەوەی ون بێت، بەلام لەهەمان کاتیشدا دەتوانین بڵێن کەئەو ون بووە بەبێئەوەی بمرێت.

جاك دێریدا : لەیادی بلانشۆ، چرکەساتی مەرگم ... ل٢١ ، بڵاوکراوەکانی مێرقێ /بەرلین ٢٠٠٣

٤

من پێموایە عوسمان شەیدا ونبوونی خۆی لەپێش مەرگیەوە بوو ، ئەوەشی شەیدا و بەرهەمەکانی بناسێت بەئاسانی کاراکتەری شاعیرێکی بەتوانا و مرۆڤێکی هۆشمەندی تیژڕوانینی تێدا دەبینیەوە، کەونبوونی ئەو بە ونبوونێکی هەڵبژاردە و ونبوونێکی ئیرادەگەریانە بوو . ئەو بێدەنگیە سەختەی سیمای ئەوی گرتبۆوە ،ئەو شەرمەی بەردوام لەبەرامبەر ڕۆژانە ژیاندا بوو بوو بەبەشێك لەکاراکتەری ، ئەو خۆ پەنگخواردنەوەیە لەدنیای دەرەوەی دڵڕەق بەهەراوزەنای شتەکان کە لەچاوەکانیدا دەبینرا، ئەو گوێگرتنە لەسەرخۆیەی کەلەئاست قسەکارەکانی بەرامبەری هەستیپێدەکرا، ئەو خاوە هەنگاونانەی لەکاتی ڕۆیشتنیدا، ئەو تێرامانەی کە پێدەچوو لە بەتاڵایەکی گەورە بڕوانێت، بەتاڵایەکی تیژو بێئامان وڕەش و بێپێناسە تەنانەت لەلای خۆیشی!!، ئەو ئاوڕدانەوە لامسەلایەی بۆ هەموو هەرایەکی دەوورویەر وەك ئەوەی بیەوێت بڵێت ئەمانە هەمووی لەدەرەوەی من و لەدەرەوەی خودی مندا دەسوڕێنەوە، من تازە ونبووم ئازیزانم! ، ئەوانە هەمووی وێنەی ئەو شاعیرەیان پێکدەهێنا کەبڕیاری دابوو خۆی ونبکات.

٥

ئەمەش ترسی ئێمەیە لەوەی لەگەڵ مەرگی هاوڕێکانماندا ، مەرگی خۆمان ئاوێنەیی بێتەوە، چرکەساتی مەرگی جەستەیی ئەو چرکەساتی پێداچوونەوەی ژیانی ئێستاکێی خۆمانە،یاخود لەوانەیە بیرکردنەوەبێت لە داهاتوو بەبێئەوەی سەیری ئێستاکێمان بکەین، ئیدی کاتێك شاعیرێکی ئاوەها گرنگی نێوەندی ڕۆشنبیریەکی پڕ قەیران بۆ هەتایی کۆچ دەکات، جارێکی دیکە هەموو پرسیارە نەکراو و هەموو هەستە پەنگخواردووەکان و هەموو لێرەبوونەکانی خودی خۆمان و هەموو کێشەکانی جەوهەر و شێوەکۆمەڵایەتیەکانمان و هەموو بیرکردنەوەیەك لە داهێنان و ژیان لەگەڵیدا بەدووی خۆیدا بەکێشدەکات.

٦

له ژیانی ڕۆشنبیریی کوردیدا ، ئێمه لەبەرامبەر دووفیگوردایین ، یەکێکیان ئەوانەن لەدوای مەرگیان هەسان هەراو زەنای ساتەکانی ژیانی جەستەییان دووباره دەبێتەوە، کەئیدی کاردانەوەکانی دوای مەرگیان جگە لەچەند کۆڕێکی ماتەمینی و دووبارەکردنەوەی ئەو بەرهەمانەن کەلەوەوبەر نوسراون ، هەر وەك چۆن هەمان نوسەر لەژیانی جەستەیی خۆیشیدا بەپێی بوونی له ترۆپکی ناوبانگدا دووبارەی کردونەتەوە، مادامەکی ناوبانگ هەمیشه چواربارە لەچاپدانەوەی بەرهەمه کۆنینەکانیشی پێ فوتدەچێت مادامەکی بەردەوامیەك هەیه لەدەرکەوتن و بەو شێوەیه نوسەر نایەوێت ون بێت و دژی ونبوونێك دەوستێوه کەمەزندەی ئەوه دەکات بەو دووبارەیه و بوونی لەنێو ڕوناکی ڕۆژنامه و میدیاکاندا پارێزراوه لەونبوون، بەڵام ئەو فیگوره نازانێت کەونبوون پابەند نیه بەدەرکەوتن بەقەد هێندەی پابەنده به داهێنان و کێشەبەندیەکانی.

فیگوری دووهەمان هەیه کەلەسەرخۆ و هێمنه و بەرهەمەکانی لەبەر ئەوەی لەزەمەنێکی کەف وکوڵدا لەگەڵ هۆشمەندی باوی ئەو سەردەمەدا ناگونجێت ، زۆر نابات له پەراوێزێکی هێمندا دەمێنێتەوه ، بەڵام لەبەر ئەوەی خوێنەری نوخبەوی و ئیلیتەی ڕۆشنبیری بۆ خۆی ڕادەکێشێت بوونێکی هەیه بەقەد بارستایی خۆی ، بارستایەك کەفوکوڵی میگەلی کۆمەڵایەتی پێینەبەخشیوه، پڕوپاگەندەی میدیا پێینەبەخشیوه، بەقەد هێندەی جیهانبینی خۆی ئەو ئەڵقه هێمنەی بۆ پێکهێناوه، ئەو فیگوره ئەوەنده حەزی بەدەرکەوتن نیه بەقەد هێندەی لەنێوان هەڵبژاردنی ونبوندا خۆی دەبینێتەوه، ونبوونێکی داهێنەرانه لەنێو تێکست و هونەری باڵادا ..

٧

(عوسمان شەیدا) فیگوری دووهەم بوو، ئەو شاعیره بوو له کاتێکدا هەمووان لەنێوەڕاستی حەفتاکان و هەشتاکاندا خەریکی خۆجەڕاندن بووین بۆ بەرهەمهێنانی حەماس که پێخۆری ئەوزەمەنەبوو، ئەو بەپێچەوانەوه لەشیعرەکانیدا باسی لەمەرگ و پایز و عەدەمیەتی ژیان و خەمه هەره ووردەکانی مرۆیی دەکرد. لەکاتێکدا کوردایەتی داوای لەشاعیران دەکرد کورده ناموسی بکەن و بۆ شاخ و ئاگر و پۆڵا بنوسن ، بۆ ئەوەی

لەجەماوەر دوا نەکەون لەبەردی ئەم سەرکردەوە بەردەبازێنیان بێت بۆ ئەوی دیکە، ئەوا هەر لەوساتەدا کاتێك شەیدا وەك هەموو مرۆڤێکی کورد لەگەڵ بەگژاچوونەوەکاندا بووە، بەلام گەر لەهەموو شتێکدا کوردە ناموسی کردبێت ئەوا شیعری نەکردۆتە قوربانی هیچ سەردەمێك کە نوسین بەئەرك بزانێت بەرامبەری !، نەخێر. ئەو لەو سەردەمەدا خەریکی شانۆ و وەرگێڕان باسکردنی جوانی بوو، هەر وەك بیەوێت بلێت من دەمەوێت لەنێو جوانی هونەری بالادا مانایەکی دیکە بدەم ژیانی کوردی .ئەو هەمیشە ئەو فیگورە هێمنە بووە کە مەرگیشی بەهەمان هێمنی ژیانی ڕەوتیکرد و تێپەڕبوو..

٨

مەرگی ئەو لەزەمەنێکی ناجۆردا بوو، ناجۆر بەوەی کاتێك ئەو دەمرێت ، تەواوی خەڵك لەژێر کاریگەری دەسەلاتی لۆکالی کوردی و میدیاکەی دەرژێنە سەرجادە بۆ ئەوەی لەخۆشیدا سەمابکەن بۆ سەرکردەیەکی کوردی، کەبووە بە سەرۆکی حکومەتێکی پێکهاتە لەچەند مەلا و کۆنزەرڤاتیڤێك و کۆمەڵێك لیبرالی لنگەوقوچ!، سەیرە،مردنی شەیدا خۆی لەخۆیدا ئەو دەلاقە گەورەیە نیشان دەدات لەنێوان ڕۆشنبیری ودەسەلاتدا، چاکتر وایە بلێم لەنێوان ئەدەب و دەسەلات و خوێنەرێك کەهێشتا دروست نەبووە، هێشتا لەسەر جادەکان بەفیکەی سەرکردەکان سەما دەکات..هەرئەوەندەش نا بەڵکو زەمەنی ناجۆر لەوەدایە کاتێك کەبەختەوەریە ڕووکەشیەکان دەگەنە ئاستێك بە هەزارەها لەژێر دروشمی بریقەدارەکاندا سەمابکەن لەوکاتەدا شەیدا دەمرێت ، مردنێك کەمیدیا و ڕۆژنامە و گۆڤارەکان سەرقاڵن بەسەرکردەوە، ئەو لەنێو ئەو قەربالغیەدا دەمرێت . بەهێمنی وبێدەنگی، هەر وەك ئەوەی مردنیشی جۆرێك بێت لەو هێمنەڕەوتەی بەنێو ژیاندا ، مردنیشی بەجێهێشتنی هەموو قەرەباڵغیەك بوو کە تاسەر ئێسقان ڕقی لێی بوو، لەو ژاوەژاوەی کەبەردەوام بەهۆی هەژاری و ژیانی لەحەوشەیەکەی گەورە گەڕەکی قەزازەکان ، لەخانویەکی گڵین، کەماڵی کۆنی پیرەمێرد بوو و پڕی بوو لەکرێچی و دراوسێ هەژار و هیچ شتێك تێدا نهێنی نەبوو ، هیچ کەسێکیش ناتوانێت لەو هەرایەدا ساتێکی تەنهایی بەخۆی ببەخشێت، ئەو هەرایە بەردەوام بەدوویەوە بوو، ئەوەندە دژوار و هەرابوو کەمن و ئەنوەر لەسەردانێکماندا،

لەژوورەبچکۆلەکەیدا ئەمان دەتوانی بەتەواوەتی گوێرادێلین بۆ یەکتری، چونکە تاو ناتاوێك بەقیژەیەك یاخود هەراوزەنایەك سەرنجی ئێمەی بۆ حەوشەکە ڕادەکێشا، گوێگرتن لەویەکتری لەو حەوشە گەورەیەدا جۆریك بوو لەیاریکردنی ئەکرۆباتیك لەسەر پەتێکی باریکی تیژ هەڕەشەی کەوتنەخوارەوەی لەسەر بێت بۆ نێو قەربالغیەکی ترسناك .. ئەو ئێوارەیە شەیدا بەپێکەنینەوە گووتی: نوکتەی من ئەوەیە، خەلك دەلێت من دەچمەوە لەمالەوە سەرخەوێك دەشکێنم ، بەلام من بۆ ئەوەی پشوو بدەم دەبێت بچمە دەرەوە...

## ٩

لەنێوان ڕاکردن لەقەربالغی و گەڕان بەدووی هێمنیدا، لەنێوان هەراو زەنای مێگەلی و تاکاخوازی و ئیندیڤیدوالیەت و بێدەنگی و پەستیەکی شاعیرانەدا ، لەنێوان هەموو ئەمانەدا، شەیدا ژیانی بەسەر دەبرد، بەسەر بردنی ژیانێك کە ئێستاکێ لەژیانی زۆربەی داهێنەرەکانی کورد لەنێو ولات و لەمەنفاکاندا درێژ بوونەوەیەکی کوشندەی هەیە...

## ١٠

ونبوون لەنێو تێکستی داهێنەرانەدا لەنێوەندێکی پڕ هەراو قەرەبالغی کوردیدا، سەرکێشیەکە مرۆ نازانێت لە چ کەنارێکدا دەگیرسێتەوە، ئەو ونبوونە گەر لەگەل خوێنەرێکدا نەگونجێت کە فێری خوێندنەوەی قول نەبووە، ئەوا نائومێدیەکی ترسناك بەدووی خۆیدا ڕادەکێشێت، پرسیارەکە ئەوەیە کێ من دەخوێنێتەوە لەکاتێك هەمووان سەرقالی کێشەی نەتەوەن بەبێ بوونی کولتوورا ، لەکاتێکدا کولتوور لە پرسی نەتەوە جیاکراوەتەوە و گەر بوونیشی هەبێت ئەوا بوونێکی پاشکۆیەتیە نەك سێنترالی، کێ لەوەتێدەگات کەگەیشتن بە پلە بالاکانی جوانی لەنێو زماندا خۆی بێئەوەی بانگەشەی بۆ بکەیت دەموچاوێك بۆ نەتەوە پێکدەهێنێت!، کێ لەوە تێدەگات؟!، ئەوانەشی کەتێدەگەن ئیلیتەیەکی (نوخبە) زۆر دەگمەنن و قەرەبالغن بە بەدگومانیەکانی ڕۆحی، لەنێوەندێکدا ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو زۆری و بۆری پەلدەکێشێت.. من ئەوەندەی ئەو ماوە کورتەی پێکەوە لەگەل شەیدا قسەم کردبوو، (بێگومان ڕستەکانی

ئەو کورت وچڕ و زۆرجاریش پچڕ پچڕ بوون، هەر وەك ئەوەی لەئاخڤین بێواز بووبێت)، ئەوە بێوازیەم هەستپێدەکرد کەلەنێو ئەو هەموو بەنێو نوسەرە مەسلەکیانەدا ژیانی بەسەر دەبرد ، لەنێو ئەوانەی کە وامەزندە دەکەن هەموو قسەیەك توانای ئەوەی هەیە ببێت بەنوسین. شەیدا لەبێدەنگی خۆیدا زۆری ئاماژەی ترسناکی پێدەبەخشیم کەتاوەکو نوسینی ئەم دێڕانە بابەتی بیرکردنەوەمن لە نێوەندێك کەبەتۆبزی بەنێوەندی ڕۆشنبیری کوردی نێوزەدی دەکەین..

١١

چۆن دەژیت ؟، چۆنێتی ژیان چیە و پەیوەندی چیە بەونبوونەوە، ئەمانە ئەو ئاماژە سەیرانەن کە لەمەرگی ئازیزم عوسمان شەیداوە هەوڵی تێگەیشتنی دەدەم، بەجۆرێك کەهەموو شتێك لە بۆشایەکدا بسوڕێتەوە، کەچیدی هیچ بیروڕایەك تێدا جێگیر نەبێت بەقەد هێندەی بابەتێك بێت بۆ قوڵکردنەوەی بیرکردنەوە. ڕێگە بەخۆم دەدەم کەباس لەئێوارەیەکی هاوینی ٢٠٠١ بکەم کاتێك من و ئەنوەری ڕەشی عەوڵای شاعرو هاوڕێ پێکەوە بەرەو ئەسحابە سپی خلۆربووینەوە، من و ئەنوەر ماوەی زیاتر لە دەساڵی ڕەبەق دەبوو یەکترمان نەبینیوو، وێنەی ئەنوەر، وێنەی ئەو شاعیرە بوو بەئەزمونەکانی خۆیدا تێپەڕ دەبوو. ئەوێك کە تاوەکو ئێستا شێوە نوسینێکی تایبەتی خۆی هەیە، هەمیشە ئەو ماوەیەی کە لەسلێمانی یەکمانگرتەوە ، خەریکی تەفسیر و لێکدانەوەی شتەکان بوو، جوانترین شت و خراپترین عادەتی ئەنوەر لەوەدایە کەهەمیشە خەریکی بەشیعریەتکردنی دنیایە!، ئەوەتا دوا دیوانی هەوڵدانێکە بۆدانانی فەرهەنگێکی ئەلف وبێی ، تێدا جیهانی شتەکان شیعرخواز دەکات ، ئەو ئێوارەیە من و ئەو پێکەوە بۆ سەردانی شەیدا شۆڕبووینەوە... من و ئەنوەر ماوەیەکی زۆر لەیەکتری ونبوو بووین، ئەوێك لەسکندەنافیاوفیلاند گیرسابۆوە و منیش لە ئەڵمانیا، هەموو پەیوەندیەکان کۆمەڵێ دەنگ و تەلفۆنات کردن بوون. زۆر جار هەستم دەکرد کەئەمانە کۆمەڵێك دەنگن لە نێو خۆمەوە و لە ڕابووردووەوە دێنە بەرگوێم. هەموو هاوڕێکانم ئەوەندەی بوونێکی ئەبستراکتی فیزوالی نێو ئیمێل و دەنگی نێو تەلفۆنەکانن. ئەوەندە ڕاستەقینەیی نین، بەڵام ڕێکەوتێی پڕ بەختەوەری بوو کە هەموو هاوڕێ کۆنینەکانی زەمەنی نوسین و جەنگ و ڕاکەڕاکە و خۆشاردنەوە ، جارێکی دیکە یەکتر ببینینەوە.

هیوا قادر و ئەنوەر و بەهرۆزی وەرگێڕی ڕۆمانی (جیهانی سۆفیا)، ئەو هاوڕێ دێرینانە کە هەمیشە ئاگامان لەیەکتری بووە و لێکدانەبڕاوین، جارێکی دیکە لەهەمان شارو لەهەمان شوێن یەکمان گرتەوە،دیارە ئێمە گۆڕابووین، بەچاوێکی دیکە سەیری دنیامان دەکرد، ژیانمان لەنێو ئەوروپادا بەهەموو زۆانبازیەکانیەوە، ئێمەی پەلکێشی جۆرێکی دیکە لە هەستکردن بەشتەکان کردبوو، تێڕوانینێکی دیکە بۆ کولتوور و ئەدەب و زیاتریش هەستکردن بەگرنگی ئەدەب هەمووانی پێکەوە گرێدەدابوو، ئێمە ئەو مەسلەکیەتەمان دەبینی کەدزەی کردبووە کەسایەتی هاوڕێ دێرینەکانمان، بەلام شەڕی ناوخۆ و گەمارۆ و بیروکراتیەتی میلیشیا بەس بوو بۆ ئەوەی لەزۆر فینۆمین و گۆڕانکاری ئاوەها تێبگەین، لەڕێگا بۆ ماڵی شەیدا و بۆلای شەیدا ، لەو ئێوارەی هاویندا من و ئەنوەر باسمان لەم مەسەلانەدەکرد..

ئەمانە هەوڵدانێك بوو بۆ تێگەیشتن لەبێدەنگی و گۆشەگیری شەیدا لەنێوان مەنفای شوێن و مەنفای زەمەندا، دیارە ئەمە بۆ ئەنوەر جێگەی بیرکردنەوەیەکی قوڵبوو، بۆ هەردووکیشمان هەوڵدانێك بوو بۆ تێگەیشتن لە جیهانی نێوەوەی شاعیرێك کە بە خواستی هۆشمەندانەی خۆی بڕیاری دابوو خۆی نەفی بکات، خۆی تاراوگە بکات لە نێو زەمەندا نەك لەنێو شوێن، لەوبڕوایەدام ئەمەش سەخترین تاراوگەیە کە نوسەر لەساتەوەختێکی بەریەکەوتنی لەگەڵ ژیاندا هەوڵی کردنەوەی دەرگاکانی دەدات و ئیدی کە نوسەر چووە نێو ئەو زەمەنە هەڵبژاردەیەوە ، چووە نێو ئەو تاراوگە زەمەنیە، هاتنە دەرەوەی کارێکی ئەستەم دەبێت، زۆرجاریش لەو تاڕواگەیەدا نوسین و داهێنان ماناکانی خۆیان وندەکەن، ئەمەش نێزیکبوونەوەیەکە لە مردنێکی ڕۆحی کە مردنی جەستەیی درێژبوونەوەیەکی ئەو مردنە ڕۆحیە دەبێت.. من و ئەنوەری ڕەشی عەولا کەبەکۆلانی قەزازەکاندا هەنگاومان دەنا، هەر وەك جاران، وەك کوڕە کۆنەکانی سلێمانی هەموو خانوو و شوێنەکانمان گرێدەدا بەکەس و نەوەکانیان، هەستکردنێك بە گەڕانەوەو سەربەنیشتمان بوون دەگەڕایەوە نێومان، کەچیدی ئێمە بێگانەیەك نین. ئەنوەر باسی شەیدای کرد ، باس منداڵی خۆی لەگەڵ شەیدا و پەیوەندی بەشیعرەوە، باسی ئەو زۆرانبازیە سەختانەی کرد کەشەیدا لەنێو خێزانی موحافزکارانەی ئەوسای سلێمانیدا ، لە پێناو شیعر و بۆ شیعرو بۆ نوسین تێدا ژیاوە، شەیدا وەك نمونەیەك وابووە، نمونەی فیگورێکی زۆر ڕاستەقینە کە چیدی لە وێنەی برا گەورەیەکی

تەقلیدیدا پێناسەناکرێت، بەقەد هێندەی وێنەی شاعیرێك بوو بەکۆمەڵێك بیرو جیهانبینی ئاڵۆز و پڕ ئیشکالیەتی زمان و بیرەوە لەبەرامبەر کۆمەڵگەیەکدا تاسەر ئێسقان دژی ئەو فیگورە شیعریە بوو، بەهۆی ئەو هۆکارە مێژوویەیە کەکۆمەڵگەی کوردی تێدا دەژیا، هەمووان دژی ئەو جیاوازیە بوون، دژی ئەو ئاڵۆزیە بوو کەچیدی نایەوێت لەگەڵ مێگەلدا وەکو ئەوان شێوەی ژیانی خۆی ڕێکبخات و بژی. ئەمە ڕێگەیەکی دوورو دێژی شەیدا بووە ، ئەنوەر لەپڕ ڕاوەستاو گووتی : شەیدا لەخانوەکەی پیرەمێردا تەنها ژوورو هەیوانێکی کرێی هەیە..ئەمەش لەلای من ئەو پرسیارەی هاروژاند ئایا بەهەقەت نوسەرە ڕاستەقینەکان فێرە ژیان بوون؟!..

١٢

شەیدا ماوەی زیاتر لەهەفتەیەك دەبوو خۆی لەماڵەوە گۆشەگیر کردبوو، کەئەو ئێوارەیەش چووین بۆ لای ، ئەنوەر هەوڵیدەدا لەو گۆشەگیریە بیهێنێتە دەرێ ، بۆ هیچ نا، تەنها بۆ ئەوەی زیاتر لەنێو ئەو تاریکاییە ڕۆحیە پشوویەکی دیکە بدات ، شەیدا ئەو پیاوە دڵپاکە بوو کەحەزی لەهەموو شێوەجوانەکانی ژیان بوو، پیاوێك بوو غەمباربوو بەو هەموو شێواندنەی ژیان و جوانی ، هەموو ئەو خۆ گرمۆڵەکردنەوەی لەنێو بێدەنگی و هەڵبژاردنە سەختەی ونبوون ، جۆرێك بوو لەهەڵگەڕانەوە دژی هەموو ئەو دزێویانەی ئازاری ئەویان دەدا، شەیدا کەئێمەی بینی وەك منداڵ گەشایەوە، ئەو ئێوارەیە دوا ئێوارەی من بوو لەشار، دەبووایە ڕۆژی دووهەم بگەڕێمەوە بۆ شام و لەوێشەوە بۆ ئەڵمانیا، پێکەوە ئەنوەرو من و کوڕەجوانکیلەکەی شەیدا سواری تەکسیەك بووین ، کەلەبەردەم باخچەی گشتی دابەزین، من و شەیدا باوشمان کرد بەیەکتردا، ئەو پیاوە وەکو ئەوانی تر سەیری منی نەدەکرد، هەستی دەکرد کە تاراوگە چ وەك شوێن و چ وەك زەمەن جۆرێکە لە جەنگ دژی ونبوون ، دژی وشکبوونەوەی خەیاڵ و داهێنان ، دژی خەونبینین و ژیان وەك نوسەرێك. ئەو دەیزانی کەئێمە هەندارانیانە نین بەدوو ئێوارە دانیشتن، شارو ژیانی شار و نیشتمان هەڵبسەنگێنین، دەیزانی ئێمەش وەکو ئەو لە تاراوگەدا دەژین، جیاوازی ئەو و لەمن، لەوەدابوو ، ئەو بڕیاری دبوو ون بێت و منیش هێشتا لەونبوون نێزیك نەبوومەتەوە، ونبونی ئەو جۆرێك ڕەتکردنەوەی ژیانێکی ناجۆر بوو ..بەچاوێکی پڕ فرمێسکەوە

ماڵئاوایمان لەیەکتری کرد، چاوەکانی شەیدا زۆر شتی دەگووت ، کەتاوەکو ئێستاش هەوڵی ئەوە دەدەم ئاسەواردەکانی بهێنمە نێو تۆڕەکانی هۆشمەندیەوە، ئەوە دوا ساتەکانی من وشەیدا بوو..

١٣

(بەڵام ئەوە شەیدایە کەمردووە، هاوڕێکەم.. لەدواجاردا ئەوە ئەوە کەمردووە، ئەوەی کەئێستا باسی دەکەین شەیدایە .. بەڵام شەیدا مرد ئازیزم ..) ، ئەمە قسەکانی ئەنوەر بوو لەتەلفۆندا، کەدوای داخستنی تەلفۆنەکە هەستم بە بەتاڵایی ژوورەکەم دەکرد گەورە و گەورەتر دەبێت، هەستمدەکرد تارواگەی ئێستام قوڵتر ووەحشیتر و بێئەمانترو تێکوپێکشکێنەرتر دەبێت، هەستمدەکرد نوسین قورستر وبێئەمانتر و گۆشگیرتم دەکات،هەستمدەکرد لەبەردەمی دەرگاکانی ژیاندا دڕندەی نوسین هەڕەشە لەهەموو شێوە ژیانێك دەکات کەبوونی هەبێت، بەتایبەت ژیانی جەستەیی..(لەدواجاردا ئەوەشەیدایە کەمردووە..) ، ڕستەیەك کۆتایی بەهەموو گفتوگۆیەك دەهێنێت. چونکە مردن ئامادەیە، مردنێك کەگومانێك و هەستکردنێك بەتاوان بەجێدەهێڵێت بۆ ئەوانەی کەهێشتا لەژیاندا ماون، بەڵام لەسەرێکی دیکەوە مردن کۆتایی هێنانە بەو ونبوونەی شەیدا کەلەم ساڵانەی دوایی تەمەنیدا مومارەسەی دەکرد، چیدی شەیدا ئەو تێکستانەی نەدەنوسی کەپێویستە بنوسرێن و بیانوسێت!، ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام لە هاوینی ساڵی ١٩٩٧ بوو ، لەئێوارەیەکی درەنگدا لە یانەی فەرمانبەران شەیدا ئەملاو ئەولای ماچکردم و ئامیلکەیەکی پێشکەشکردم کە چەندەها شیعری کاریکاتۆری تووڕەی لەخۆ گرتبوو، لەڕێگەی گەڕانەوەمدا بەردەوام بیرم لەو شەیدایە دەکردەوە کە بەجیاوازی دەقەکانی پێشووی خۆیەوە، بەجیاوازی کارەشانۆیەکانی کەبەشداربووە تێدا وەك وەرگێڕێکی بەتوانا، بەجیا لەو ووردبونەوەیە لە دنیاکانی شیعرو زمان، شیعری کردۆتە هۆکارێك بۆ دەربڕینی تووڕەیی، تووڕەبوونێك وەك هەندێك نەبۆتە جنێوفرۆشتنێکی هەرزان بۆ گردکردنەوەی خوێنەر لەخۆی ، زیاتر پەلبکێشێت بۆ قوڵکردنەوەی سادەخوازی لەڕۆحی خوێنەری کوردیدا، نەخێر، گەر ئەو ئەوەی بکردایە ئەوا هەمیشە لەنێوەڕاستدا دەبوو، چونکە حزبی کوردی هەمیشە موجامەلەی ئەو جنێو فرۆشانە دەکات و خەڵاتیان دەکات و ئاشتیان دەکاتەوە

بۆ ئەوەی جنێو بدەن بەنەیارەکانیان، ئەو جنێوانەی خۆیان نایەوێت بیلێن. شەیدا لەو شیعرەکاریکاتێریستیانەیدا تورە بوو بەرامبەر زوڵمی کۆمەلاّیەتی کەتاوەکو ئێستا لەم کۆمەڵگەی کوردیەدا بەردەوامی هەیە، زوڵمێکە کە شۆڕشگێڕە دێرینەکان دەیکەن و کولتوری بەعس بەشێوەیەکی دیکە دووبارە دەبێتەوە، شەیدا هەستی بەو زوڵمە دەکرد و نەیدەویست لەگەڵ مەسلەکیەکاندا کەمانچەژەنی پلەدوو بێت لەدوای دەسەلاّتێکەوە ڕۆژ بەڕۆژ گەندەڵ دەبێت. دیارە ئەمە بەخشینی هیچ بوعدێکی سیاسیانە نیە بە شەیدا، بەڵکو وەلاّمدانەوەیەکە بۆ هەموو ئەوانەی کەوامەزندە دەکەن شەیدا بەتەواوەتی لەنێو خۆیدا گرمۆڵە بوو و چیدی بونەوەرێکی کۆمەلاّیەتی نەمابوو.. من و لەو ساتەوە بیرم لەوە دەکردەوە کەئیدی ئەو نایەوێت خۆی دووبارە بکاتەوە ، هەروەك چۆن نایەوێت لەسەر شکۆی ڕابووردوی دابنیشێت و بژیت..دیارە تەنها ناوی عوسمان شەیداش وەك ناو گەر خۆی بیویستایە زەمانەتێك بۆ بۆ ئەوەی باشتر بژی لەوەی کەژیا بوو..بەلاّم ئایا ئەوە مانای ئەوەیە کە ئەو نەیزانیوە بژیت؟!، ئایا ئەو ونبوونە لەداهێنان ، مانای ونکردنی ژیانە یاخود بە پێچەوانەوە؟!..ئایا بەهەقەت داهێنەرەکان و نوسەرە جیدیەکان دەزانن بژین؟!!..

١٤

لەمردنی شەیداوە ئەو پرسیارە جارێکی دیکە خۆی قوتدەکاتەوە، ئایا شەیدا و زۆری وەکو شەیدا کەداهێنەر بوون و شوێنایەکیان لە کولتوری ئەم نەتەوەیەدا هەبووە، زانیویانەبژین؟، ئایا بەهەقەت هۆشمەندیەکی سیاسی هەیە کە خۆی بەرپرس بکات لە پاراستنی داهێنان؟!..ئایا دەبێت چارەنوسی نوسەری داهێنەری کوردی ژیان بێت لەگۆشەگیریەکی ئاوەها کوشندەی وەك عوسمان شەیدا تێدا ژیا ، یاخود شەڕێك بێت لەگەڵ ژیانی ماتریاڵیدا کە زۆر جار بە کوشتنی داهێنان کۆتایی پێدێت؟!، ئایا دەبێت کەمانچەژەنی دووهەمی سیاسەتێکی خراپ بیت یاوەکو دەبێت لەمەنفاکاندا بەدوو کەسایەتیەوە بژیت یەکێکیان کرێکارێکی هەرزانە و ئەویدیکە نوسەرێکە لەژێر هیلاکی و پەستانی دەروونیدا دەنوسێت؟!، ئەوە چ دەسەلاّتێکی سیاسیە قبوڵ دەکات داهێنەرەکانی ئاوەها گۆشگیربکرێن و ئاوەها کۆتاییان پێبێت، ئەو دەسەلاّتە دەبێت

شەرم لەخۆی بکات ...بەمەرجێك کەمانچەژەنەکانی دوێنی بەعس و ئەوانەی لەژێر دروشمەکانی بەڵێ بەڵێ بۆ سەرۆکدا ژێر لەژێرەوە پارە و ئیمتیازاتیان وەردەگرت، هەر هەمان ئەو دەستە بۆگەنانە بوون ، جارێکی دیکە بەو هونەرەی لەبەعسەوە فێری بوون، کە بەهەڵە نێوی دەنێن هونەری ژیان، دەزانن چۆن بژین و دواجار بەداخەوەخۆیان لەتەنیشت دەسەلاتی نوێی کوردیدا بینیەوە، ئیدی کولتوری بەعس هێشتا جێگە پەنجەی لەسەر ژیانی ڕۆشنبیریمان جێهێشتووە و هەوڵدەدرێت هەموو داهێنان و ڕۆحی ڕەخنەیەك و دەنگێك خەفەبکرێت ، نوسەرە جیدیەکان ڕام بکرێت و بیانکەن بەکەمانچەژەنێکی خراپی نەشاز، هەر لەناو ئەو دەزگایانەشدا دوای شێلانینا وەك هەویرێك ،شوێنی هەڵەچنێکیشیان پێنەدەبەخشین!، پارەیەك بەمنەتەوە بەشی مەمرەو مەژی دەدرا بەداهێنان بەمەرجێك جنێو فرۆشان و تەنانەت ئەنفالچیەکانی دوێنێ لە پارە و ئیمتیازاتدا نقومبوون، ئەوەندەش نا بەڵکو چەندەها گزگلی بەنێو نوسەر و ڕۆژنامەوانی نیوەزمانیان بۆقوتدەکردنەوە بۆ ئەوەی نەیەڵن لەوێش، لەو شوێنا پیسەشدا کە بەناچاری تێیکەوتوون، ژیانیان لێ تاڵبکەن.. شەیدا لەژێر ئەم هەموو پەستاوتە و لەنێو ئەم هەموو زوڵمەدا ئەوەندە پیاوێکی ناسك بوو کە ونبوونی هەڵبژارد، ئاخر ئەو زۆر لەوە ناسکتر بوو بچێتە ئەو شەڕە وەحشیانەی ئەوانەی کەبەکولتوری بەعس گۆشبوون ، ئەو نە سەر بەکوتلە بوو نەسەر بەهیچ گروپێك، ئەو دەیویست تەنها شاعیرێك بێت و وەك شاعیرێك بژیت ، دیارە ئەو بەپلەی یەکەم کێشەی لەگەڵ داهێناندا هەبوو ، کێشەی ونبوون و دەرکەوتن..

١٥

دەبێت دەسەلاتی کوردی شەرم بکات لەخۆی بەوەی داهێنەرەکان بەنیوەی کۆنە بەعسیەکیان پێ نەبەخشراوە..زۆریش هەبوو بەمنیان دەگووت ئاخر شەیدا نازانێت بژی !!..

١٦

لەوانەیە ئەوانەی لەسەرەوە باسمکردن بەشێك بێت لە تێگەیشتن لە مەرگی شاعیرێك، کەناکرێت ئاوەها بەیادکردنەوەیەکی ئاسان و باسکردنی چەند دێڕێك یاخود تەنها لەچاپدانەوەی چەند سەد نوسخەیەکی دیوان و نوسینەکەی ، وەکو باوە، کۆتایی

پێبێت، نەخێر من پێمووایە مردنی نوسەرەکان زۆر کێشەی گرنگ لەگەڵ خۆیاندا دەهاروژێنن کەنیوەندی بەنێو ڕۆشنبیری کوردی نایەوێت تێبیگات، یاخود لە ساناکردنەوەو سانخوازیەك و بەئاسانی ڕوانین لەژیانیان و لەکلێشەی یادکردنەوەو چلەکاندا زیاتر هیچی دیکەیان پێناکرێت ، ئەو نێوەندەی ئێمە بەئاسانی ڕێگەدەدات هەموو شتەکان تێپەڕبن..

١٧

بەگەڕانەوە بۆ مۆریس بلانشۆ لەچیرۆکی ساتەوەختی بەرانگەربوونەوەم لەگەڵ مردندا، دەتوانین لەساتەوەختەکانی مەرگی بونەوەرێکی بیرکەرەوە لەجیهان تێبگەین، بەوەی مردن زۆر جار قوتاربونە لەژیان ، کرانەوەیەکە بەسەر بێکۆتاییەك کەنوسەر قوتار دەکات لەو هیلاکیە ڕۆحیەی پێوەی دەناڵێنێت. لەسەرێکی دیکەوە مەرگی ئەوانی دیکە وامان لێدەکات هەمیشە بڕوا بەوە بکەین کە مردن لە دەرەوەی ئێمەیە ، ئەوانی دیکەیە دەمرن نەك ئێمە!!، ئاخر (لەدواجاردا ئەوە شەیدایە کەمردووە...)، ئەوە ئەوە مردووە و هەر ئەویشە کەباسدەکرێت، ئێمە باسی ئەو دەکەین بۆ ئەوەی بیر لەمردنی خۆمان نەکەینەوە، لەهەمان کاتیشدا باسکردنی مردووەکان بەباشی و مەزنکردنیان خۆ دوورخستنەوەیە لە هەستکردن لەبەرپرسیاری ئەو بارودۆخەی تێدا ژیاون، هەمووان دەمانەوێت بەشان و باڵای مردووەکانمان هەڵدەین و ئێستاکێی خۆمان و مردنی خۆشمان لەبیربکەین..

١٨

هەموو نوسەرێك لەو جۆرە مردنە دەترسێت، چونکە هەموو نوسەرێك دەزانێت کە لەداهێنان ونبوون سێبەرێکی سەختی مردنە و هەناسەی داهێنان توند دەکات و خەیاڵ بەسەر ڕۆژانەژیاندا وشکدەکاتەوە ، وەستان لەبەرهەمهێنانی تێکستی داهێنەرانە، ئەو تێکستە ناکاملانە بەرهەمدەهێنێت کە بانگەشەی ونبوونی نوسەرەکەیەتی..

## ١٩

شەیدا سالأنێکە بەهۆشمەندیەوە ونبوو بوو، ئەو نەیدەویست خۆی لەنێو تێکستی دووبارە بەرهەمبهێنتەوە، ئەوەش زیاتر لەڕوناکیەکان دووری خستەوە بۆ نێو تاریکایە سەختەکانی پەراوێز، تەنانەت زۆر هەبوون نەیاندەتوانی وێنەی ئەو شەیدایە پێکبهێنن ،کە زەمەنێك لەنێوەڕاستی ڕوناکیەکاندا بوو، تەنانەت خودیب خۆیشی نەیدەویست ئەوەبیرخۆی بهێنێتەوە!، ئە دژی ئەو فیگورە شیعریە بوو، لەدەرووەی ژیاندا دەژیا، لەبەر ئەوە مردنی ئەو مردنی ونبوویەك بوو ، مردنێکی دووبارە بووە بوو ، ئە مجارەیان مردنێکی جەستەیی بوو.. جەستەیی و هیچ تر ...

# تیرۆر و سێکسوالیەت

هەندێك ڕووداوی بچوك هەن ڕوودەدەن ،دواجار دەبنە پێچێکی گرنگی مێـژوویی و مرۆڤەکان دەخەنەبەردەم ئەو هەقیقە تالانەی سەردەمانێکە دەرکیان پـێـنەکردووە و لەگەڵیشیدا ژیاون . لەم ڕووداوە بچوکانەوە ڕاستیەکان زەق و بێـئامان هەڵدەکشێـنە سەر ڕووبەری هۆشمەندی کۆمەڵایەتی و پریڤاتمـان (کەسـی و تایبـەت )کەزەمەنێـکە خەفەبوون و ساتێکی مێژوویيان پێیوست بووە بۆ سەر ئاوکـەوتنی.. هـەر وەك ئـەوەی هەقیقەت کۆمەڵێك لاشە بن و لەشەوێکی تاریکی زەمەنێکی دێریندا نقـووم بووبێتن ، نقومبوونێك کە شیببوونەوەی پێست و گۆشتی بۆگەنبوویان ڕووبـەری ئاوەکانیـان بـە تێپەڕبوونی زەمەن بۆگەنکردبێت ، تاوەکو ڕۆژێك ماسیگرێك یاوەکو منداڵێکی چەتوون ،یان بارانێکی لە پڕ و زریانێك بەڕێکەوت سەرئاویان دەخات، ئەو ساتە وەختە، ساتی مێژوویی دەرکپێکردنی هەقیقەتی تام و بۆنی سەیری ئەو ماسیانەن کـە ماوەیـەکی دوورودرێژ بووە لەو ڕووبارەدا ڕاومانکردوون و خواردومانن.

ڕووداوی ئاشکرا بوونی باندەکەی( شێخ زانا) ئەو لاشانەی هێنایەسەر ڕووبـەری ئـاوی ڕووبارەکانی ژیانی ئێمە کەدەمێکە ئەو لەت لەتیکردبوون و بۆگەنیان لەژێر خۆڵەوە خەوی ئێمەی زڕاندبوو. بێئەوەی بزانین ئـەم هـەموو بۆگەنیـە هـی گۆڕەوەیـەکانمانن یاوەکو بۆنی لەشی ئەو بیروکراتیە مشەخۆرەیە، کە سێبەری قورسیان ژیانی ئێـمەیان هەراسانکردووە.. ئیدی لەگەڵ ئاشکرابوونی لاشەی قوربانیەکان هەموو بۆگەنیـەکانی کۆمەڵگەی ئێمەش ئاشـکرابوو ، کەبـەڕای مـن چـەندەها دووری تێکچـڕژاو وڕەهەنـدی جۆراوجۆری لەخۆ گرتووە .

یەکێك لەو کێشانەی ئەو باندە تەقاندیەوە ، کێشەی لاشەیەکی ڕەمـزی و سـۆمبۆلیە لە کۆنەستی کۆمەڵگەدا، کەنیشانەکانی بەسەر لاشە سەرئاوکەوتووەکانەوە جێهێشتووە ، ئـەویش لاشـەی زایەنـدە و سێکسیـکی تیرۆرکـراو و لەتلـەتکراوە بەچـەقۆی ئیسلامچیەکان..لەم پێچەدا چەمکەکان جارێکی دیکە بـەتۆبزی هەقیقەتێـکمان لـەلا ئاشـکرا دەکـەن، کەبەدرێـژایی زەمەنێـکی دوورودرێـژی مێـژوویی لـەقولایی گۆمەلەبیرکاوەکاندا چەپەو خەفەبوون .

تیرۆر و سێکس دوو چەمکی ئاڵۆز و تێکچڕژاون و ڕووداوی ئاشکرا بوونی باندەکەی شێخ زانان و خوێندنەوەی ئەم دووچەمکە دەکەین بەدەروازەیەك بۆ تێگەیشتن لەو بۆگەنیەی بەدرێژایی مێژوومان هەناسەی توند کردووین .

لەم تراژیدیایەوە دەتوانم بڵێم: گەر دانپێدانانی گروپەتیرۆریستیەکەی (شێخ زانا) تەنها تایبەت بووایە بە گروپەیەکی ئیرهابی وەك زەرقاوی وسەبعاویەکان کەخەڵکی بێتاوانیان قەسابی بکردایە ، ئەوا ئەو کاریگەریە قوڵەی نەدەبووە سەر کۆمەڵگەی کوردی و ئێمە وئەو هەموو مەلا و ڕۆشنبیر و سیاسەتمەدارانی نەدەهێنایە سەر شاشەی تەلفیزۆنەکان و ئەو هەرا گەورەیەی نەدەنایەوە. گرنگی ئەو مەسەلەیە پابەند بوونی تیرۆر بوو بەتابۆترین و قەدەغەترین و بابەتی نێو کۆمەڵگەی ئێمە ، کەبەسەدەها ساڵە وەك تابۆ و قەدەغەیەکی ترسناك تەماشا کراوە و چەپێندراوە، ئەو تابۆیە بابەتەکانی( سێکس و هۆمۆسێکسوالیەتە) بەهەموو دەرکەوتەکانیەوە.ئەمەش بۆ یەکەمجارە پەیوەندی نێوان دەسەڵات و ئۆرگانیزەکردنی سێکسوالیەت لەکۆمەڵگەی ئێمەدا بهاروژێنێت، کەدووری و ئەرکێکی دیکە دەبەخشێت بەدەسەڵات و بێگومان دەسەڵاتیشی خستۆتە بەر لێپسراویەتێك کەچیدی ناتوانێت لێی قوتار بێت، گەر هاتوو هەزارەها مەلای مزگەوتیش بێن بەهانایەوە! ئەوانەی لەدواجاردا هەموو ئەم کێشانەش پێکەوە گرێدەدات: پەیوەندی دەسەڵاتە بەدۆزی ڕۆشنبیری کۆمەڵگەوە و لەدوایشدا پرسی جۆری مامەڵەی دەسەڵات لەگەڵ ڕۆشنبیری دەهاروژێنێت.

(شێخ زانا) و گروپەکەی پرۆدێکتێکی کۆمەڵگەی کوردین و لەدەرەوەی ئەم کۆمەڵگەیەوە نەهێنراون، زمانی ئەوان کەقسەی پێدەکەن کوردیە و دیالەکتێکی ناوچەکەی خۆیانە و هیچیشیان لەنێوەندێکی کولتوری دەرەوەی ئەم کۆمەڵگەیەوە نەهاتوون، هەر لەبەر ئەوە هەموو ترس و گومان و دڵەڕاوکێیەك ، ترس وگومانێکە لە خودی کۆمەڵگەی کوردی، هەموو مامەڵەکردنێکی دەسەڵات لەگەڵ ئەم گروپانەدا مامەڵەیەك نیە لەگەڵ دیاردەیەك لەدەرەوە هاتبێت بۆ نێو کۆمەڵگەی ئێمە و جەستەیەکی نامۆ بێت بەجەستەی کوردی ، بەپێچەوانەوە لەنێو هەناوی کۆمەڵگەی ئێمە و کولتوری ئێمەوە سەریهەڵداوە و بەشێوەیەکی ترسناك و وەحشیانە ئەو دیاردەیە بەرامبەر هۆشمەندی گشتی کۆمەڵگە خۆی نیشانداوە.

ئەوەی لەیەکەم سەرنجەوە هەمووانی هەژاند، پابەندبوونی تیرۆر و تاوان بوو بە سێکس و لەوەش خراپتر ئەوەیە کە تاوان پابەند دەبێت بە هۆمۆسێکسوالێەت و نێربازیەکی کوردیەوە، بەمەش دوو قەدەغەو تابۆ (تاوان و سێکس) لەکونجە تاریکەکانی چەپاندنی سەدەها سالایان بە شێوەیەکی جەیاچوونی و سکاندالْ ئامێزانەوە دێنە سەر رووبەری تەلفیزۆنەکان و باس لەخۆیان دەکەن .گەر هاتوو گریمانەی ئەوەش بخەینە بەرچاومان کەئەم چیرۆکە بەشێکی دروستکراوی دەزگاکانی ئاسایش بووبێت بۆ زیاتر ریسواکردنی تیرۆر،ئەوا لەم بارەشدا هەر لوتمان دبێت بەلوتی بابەتێکەوە کەتاوەکو ئەمرۆ قێزەوەر بووە و لەرێگەیەوە دەزگایەك دەیەوێت باندێکی تیرۆریستی زێدە ریسواتربکات و ئێستاش بۆتە دیاردەیەکی کۆمەلایەتی سیاسی زەق و جەستەی کۆمەلگە ژێرپەنجەیی دەکات بە تاوانەکانی، پرسیارەکە ئەوەیە. بۆچی دەبێت سێکسوالێەت هەمیشە پابەند بکرێت بەتاوانەوە؟!! بۆچی دەبێت کۆمەلگە ژیانێکی نهێنی شاراوەو نهێنی بۆخۆی پێکبێنێت و لەتەنیشت ژیانی ئەخلاقی گشتی ئیسلامخوازیەوە؟ بۆچی دەبێت مرۆڤەکان بەدوو دەموچاو و بەدوو مۆرالی کۆمەلایەتی و بەدوو کەسایەتی دژبەیەك بژین؟...ئەمانەو زۆری دیکە پرسیاری هەنووکەیمان دەبن و هەولی خوێندنەوەیان دەدەین.

ئەوەی تێبینی ئەو تاوانبارانەی بکردایە ، ئەو راستیە سادەیەی بۆ دەردەکەوێت کە میکانزمێك لەئارادایە بۆ ( داپۆشینی ژیانی سێکسی)، بەشێوەیەك کەمرۆڤەکان بەرۆژ ممارەسەی ژیانێکی بالای پر نۆرم و ئەخلاق دەکەن ( وەك وانەگوتنەوە بە قوتابیان و خوێندکارانی زانکۆ و بازرگانی و پاراستنی ئاسایش ) و لەئێوارە بەدوا مالەکانیان دەکەنە شانۆیی نێربازی و سەربرین و تیرکردنی ئارەزووە سێکسیە نەخۆشەکانیان، هەروەك چۆن لە لێخشاندنی چەقۆو هەسانەکەی نێو ژوورەکاندا وەك ئەوەی ئارەزوویەکی چەپێندراوی چەندەها سالە بەرەلاکرابێت، ئاوەها یەکێك لەو تاوانبارانە بەهێزێکی شێتانەوە ژوورەکە پرکردبوو لەدەنگی ئەو لێخشاندنە وەك تینویەك بۆ لەت لەتکردنی جەستەی قوربانیەکەی، دەنگی لێخشاندنی چەقۆ و هەسان دەیویست بەئێمە بلێت کەئێوەش قوربانیەکی دیکەی ئێمەن و چەقۆوهەسانێکی دیکە لەشوێنێکی ئەم ولاتەدا چاوەرێی ئێوەیە . لەو ساتەدا من بیرم لەو هێزە درەندەیە کردەوە کەلەنێو کۆمەلگەی کوردیدا خۆی حەشارداوە و ئەمرۆ لەرێگەی

کەسێکی ئاوەهاوە خۆی نیشاندەدا ، دەشێت لەداهاتوودا هەموو یەکێک لەئێمە ببین بەقوربانی ئەو هێزە کوێرە دڕەندەیەی، سالانێکە کولتورێکی چەپاندن بەرهەمی هێناوە.

بۆچی دەبێت (ژیانی سێکسوالیەت) لەکۆمەلگەی ئێمەدا بەو شێوەیە تەعبیر لەخۆی بکات، لەشێوەی دوژمنداریەکی ترسناک و تاوان، بەشێوەیەك کەژیانی نهێنی و سێکس و تاوان لێکجودا نەکرێتەوە، ئەو پرسیارەی لێرەدا خۆی زەقدەکاتەوە ئەوەیە ، بۆچی دەبێت ئەم پەیوەندیە بەو جۆرە بێت و بۆچی دەبێت سێکس ببێت بەو هەویرەی ماسی دڕەندە بۆخۆی بگرێت و ڕامیان بکات بۆ کاری تیرۆریستی؟!. ئەمە پرسیارێکە کەدەبێت بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ جێگەی گفتوگۆی نێوەندەکانی زانکۆ و دەزگاکانی خزمەتی کۆمەلایەتی و حکومەتی کوردی بێت..

کەسەکانی نێو گروپەی شێخ زانا هەر خۆیان جەلادن و هەر خۆشیان قوربانین، جەلادی ئەو کەسانەن کەسەریان لەلەشیان کردونەتەوەو خۆشیان قوربانی حەزە چەپێندراوەکان و بیرورا سادەو کاڵ وکرچەکانیان بوون،لەمەڕ دنیاو ئیسلام وکۆمەلگە. هەموو یەکێك لەوان لەنێو ژینگەیەکی سەختی کۆمەلایەتیەوە هاتوون، ژینگەیەك جگەلە نەبوونی و بێکاری و بێ شوێن وڕێگەیی، ژینگەیەکی ڕاخاودراوە بە وێنەکانی چەپاندن، ئیدی دوژمنایەتی لەو ژینگەیەدا وەك ڤایرۆسێکی ترسناك گەشەدەکات و کاریگەری خۆی لەسەر کەسەکان دیاری دەکات. شێخ زانا ئەو کەسەیە کە دەستی ئەو هەمووە دەگرێت و پێیان دەلێت: من ئێوە دەکەم بە کەسێك کە گرنگیتان هەبێت، من کارتان بۆ دەدۆزمەوە، من ڕێگەتان دەدەم کچان بێنە خانووەکەم و لەگەلیاندا بخەون، ئیدی هەموو تابۆکان (قەدەغەکان) ڕەواخواز دەکات لەژێر ناوی جیهاد و شەڕی پیرۆز و پەیمانی ژیانی ئەبەدی بەهەشتێکی پڕ حۆری ڕووت و قوتی جوانکیلە هیلاکی ڕێگەی جیهاد بڕەوێننەوە. پەیمانێکە لەڕووی سێکسوالیەوە لە ژوورو خانوەکانی شێخ زانادا موماەرەسەدەکرا. لەژێر سێبەری ئەم پەیمان و شێوەژیانەدا کەشێخ بۆنەوانی ئامادەکردووە، هەموو ئەو چالاکیانەی دیکە (لە کوشتنەوە بیگرە تاوەکو لەت لەتکردن) ئەو کاریگەریە دەروونیە قوڵەی نابێت لەسەر کەسەکان، مادامەکی لەڕۆژانی داهاتوودا کیژێك دێتە باوەشیان کە بەڕای ئەوان بەشێکی بچوکە لە چێژێکی گەورەی چاوەڕوانکراو لە بەهەشتێکی بەریندا، یاوەکو پێکەوە کردەی سێکسی یاوەکو

هۆمۆسێکسوالیەت دەکەن وەك بەشێك لە تێگەیشتن لەو (چێژە )مەزنەی خوادوەند پێیان دەبەخشێت ..ئەمە بەکورتی دایناموی چالاکیەکانی ئەو گروپەیەبوو. کەلە پشت ئەم دیاردەیەوە کۆمەلگایەك خۆی دەردەخات لێواو لێوە لە چەپاندن و دوژمنایەتی و لەگەلیشیدا شاردنەوەو داپۆشینی هەموو کێشەکان ..

کاتێك (سێکسوالیەت) دەبێتە تابۆیەکی ئاوەها و مومارەسەکردنی لەدەرەوەی (دەزگای خێزان) دەبێتە گوناهەیەکی گەورە و سزای جەستەیی و ئەخلاقی بەسەردا دەسەپێنرێت، ئا لەوکاتەدا سێکسوالیەت هەموو رێرەوە سروشتیەکانی خۆی وندەکات و تێکەل دەبێت بە گومان و دلەڕاوکێ و پەشێویەکی رۆحی ئاوەها کە چێژی سێکس وەکو چێژێکی جوانکاری و خزمەت بەمرۆڤ کاری خۆی ناکات، بەلکو چێژ لەو بارەدا زیاتر قولکردنەوەی هەستکردنە بەتاوان ، ئەم هەستکردنە بەتاوان مرۆ زیاتر تورەتر و نائارامتر دەکات ، زیاتر هێزێکی دوژمنکاری تێدا دەهاروژێنی، هەموو بەتالکردنەوەیەکی ئەو دوژمنایەتیە هێوربوونەوەیەکەی رۆحیان پێدەبەخشێ ، بەلام ماوەیەکی دیکە ئابات هەستکردن بەتاوان و حەزی سێکسوالیەت دەبێتە خولیایەکی خراپ و ئیدی دیسانەوە گەڕان بەدووی نێچیری سێکسی و گەڕان بەدووی لەت و پەتکردنی جەستەیەك دەستپێدەکاتەوە و بەم شێوەیە ئەم بازنە شەیتانیە بەردەوامی بەخۆی دەدات.

کۆمەلگای کوردی وەك هەموو کۆمەلگایەك کەئاینی ئیسلام و شێوەژیانی ئیسلامیانە زالە بەسەر پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکانیسدا، کۆمەلگەیەکە پڕیەتی لە چەپاندن بەهەموو شێوازە توندوتیژەکانیانیەوە، سێکسوالیەت بەجۆرێك چەپێندراوە کە تابۆترین و قێزەوەرترین حەزی مرۆڤ ببێت، بەجۆرێك باسکردن لە (چێژ ) و (ترۆپکەچێژ / ئۆرگازم) باسکردنێکی حەرام بێت، گەر باسیش لە سێکسوالیەت بکرێت لە نێو دەزگای خێزاندا ئەوا تەنها لەڕووە بەرهەمهێنانەوەکەی باس دەکرێت ، کەئەویش بەرهەمهێنانی منداڵەباسدەکرێت و هیچی دیکە. لەلایەکی دیکە گەر ئەم بابەتە باسکرێت ئەوا لەچوارچێوەی قەحبەبازی و سۆزانیدا پێناسەدەکرێت ، ئەم بابەتە حەرامترین بابەتی ئەم کۆمەلگایەی ئێمەیە و بەجۆرێك چەپێندراوە کە ژیانی نهێنی سێکسوالی وپەیوەندی نهێنی لەو جۆرە بۆتە شێوازی ئەو پەیوەندیانە، هەموو مەسەلەکان لە کۆمەلگەی ئێمەدا تەواو بە پەردەیەکی پڕ حورمەتی درۆزنانە

داپۆشراوە و بۆتە هۆی پێکهێنانی ژیانێکی دیکە ، هاوشان لەگەڵ ژیانی کۆمەڵایەتیدا ڕێدەکات، ژیانێك جیهانێکی نهێنیە و مومارەسەی هەموو تابۆکان و حەزەکانی تێدا دەکرێت و هەر یەکەی بەپێی تواناو و بەردەستی ماتریالی و مەعنەوی ئەو ژیانە بۆخۆی پێکدێنێت. هەر لەمنداڵیەوە ئێمە فێر دەبین درۆبکەین و حەزو ئارەزووە سادەکانمان بچەپێنین و بیشارینەوەو گەر هەلمان بۆ ڕەخسا بەدزی هەموانەوە مومارەسەی بکەین، ئیدی ژینگەیەك پێکدێت کە بەردەوام مرۆڤی دووموڕاڵ و دوودەموچاو و دوونەخلاقی دژ بەیەك بەرهەم دێنێت، هەر بۆیە ڕاستی بڕواکردن بەقسە و (زمان)یش و ڕێزگرتنی هەموو پرۆتۆکۆلێك لەلای ئێمە لەسەر کاغەز دەمێنێتەوە، چونکە ئەوەی کەبڕیاردەرە ، ئەوە نیە کەقسان دەکات بەڵکو ئەوەی بڕیاردەرە دەمووچاوی دووهەمە و کەسی دووهەمی نێو ژیانی دووهەمی ئێمەیە.من پێمووایە کەچەپاندنی سێکسی نەك تەنها مەسەلەیەکی لاوەکی نیە لەکۆمەڵگەدا بەڵکو کرۆك و چەق و داینەمۆی هەموو چالاکیەکانی کۆمەڵگەیە، لەسیاسەتەوە بیگرە تاوەکو ژیانی رۆشنبیریمان، ئیدی دەبێت چێژ لەو مانا کەسیی و تەسکبوارەوە بچێتە نێو بازنەیەکی گەورەتر و فراوانترەوە کەئەویش بواری گشتی کۆمەڵگەیە بەهەموو دووریەکانیەوە.
ئێمە بەوە تووشی شۆك نەبوون کە باندێکی تیرۆر هەیە و مومارەسەی کوشتن و تاوان دەکات، ئەمە گەر بەشێك نەبووبێت لە ژیانی رۆژانە، ئەوا بەحوکمی بارودۆخ بەشێکە لەو دیاردانەی کە دووبارەبوونەوەیان سروشتێکی ئاسایی پێبەخشیوە، کۆمەڵگەی کوردی بەوە تووشی شۆك نەبوو، بەڵکو بە مومارەسەی سێکواڵیەتی نێر و مێینەکان لەنێو ژوور و خانووە تایبەتەکان و نیشاندانی چەند بەشێکی بچوك و تەماوی لەسەر شاشەی تەلفیزۆنەکان ئەو شۆکە گەورەیەی لەنێو کوردی نێوەو دەرەوەی وڵاتدا دروستکرد.
ئەم شۆك و بەریەکەوتنە دەروونیەکە چەندەها پرسیاری هاروژاند ، لەوانە: ئێمە لە نێو چ جۆرە کۆمەڵگەیەکدا دەژین، کۆمەڵگەیەك بەرۆژ پاك و بێگەردە و لەئێوارە بەدوا نێرباز و پیاوکوژە؟، ئایا ئێمە هەر ئاوەها بووین و ئێستا بەهۆی دەستگیرکردنی ئەم باندەوە مشتێك لە خەرواریکی ترسناك ئاشکرادەبێت؟ گەر لەنێو ئیسلامیەکاندا کە زاخاودراون بەفیکری جیهادی ئەوە ڕوویدات، ئەی دەبێت لەنێو گروپەکانی دیکەدا لەسەر چ شێوازێك بێت؟، گەر سێکس دەکەیت بۆچی دەکوژیت ، گەر دەشکوژیت بۆچی ئاوەها بەو شێوەیە ئەنجامی دەدەی؟!،بۆچی نێربازی و (گەمەی سێکسی ) نێربازی

لەنێوان بکوژەکان؟، لەدوا جاردا ئەو پرسیارە زەقدەبێتەوە بۆچی تاوان و سێکس ؟، دەبێت کەی من یاوەکو مندالم یاوەکو هەر کەسێکی دیکە ئاوەها ببنە قوربانی باندێکی لەوجۆرە، دەبێت چەندە باندی ئاوەها هەبن!!ئەی کوا دەسەلاتی حکومەت !!..
ئەمە و چەندەها پرسیاری دیکە لەمەڕ پەیوەندی دەسەلاتی کوردی و کۆمەلگە هاروژاوەو دەسەلاتیش هەولدەدات لەرێگەی مەلاکانەوە ئەم پرسیارو هاروژاندنە هێور بکاتەوە، کەبەڕای من مەلاکان وچالاکردنی رۆلیان و نەك هەر کێشەکان چارەسەر ناکەن، بەلکو ئەوان هۆکارییێکن بۆ قولکردنەوەی چەپاندن، کەمزگەوت و نوێنەرکانی بەدرێژایی چەندەها سەدە بە مەوعزە و ئامۆژگاریە وشکەکانیان ئەو چەپاندنە قولتر دەکەنەوە. ئەوەی لێرە من دەمەوێت بیلێم نەفیکردنی رۆلی مەلایەکان نیە لە چارەسەکردنی کێشە کۆمەلایەتیەکان،بەلکو دەبێت جارێکی دیکە بەو پەیوەندیەدا بچینەوە کەسالاهایە بەنەگۆڕی ماوەتەوە ، کەئەویش پەیوەندی نێوان (مزگەوت و کۆمەلگە)یە.
بۆ تێگەیشتن لەو پەیوەندیە پێویستە چاوێکی خێرا بە(پەیوەندی نێوان سێکسوالیەت و کۆمەلگا) بخشێنین، ئەمەش بێئەوەی بمانەوێت لەبەردەم تیۆرەو تێزەکانی (ڤلهێم رایخ) دا خۆمان دەبینینەوە.کەلەوبڕوایەدایە پەیوەندی نێوان کلتورەکان و هێزی سێکسوالی پەیوەندیەکی ئالۆز و تێکچڕژاوە، پەیوەندیەکە نەك تەنها لەچوارچێوەی حەزە چەپێندراوەکانی تاکدا هەلدەسورێت و کاریگەری خۆی هەیە بۆسەر کەسەکان، بەلکو ووزەیەکی گرنگی جولانەوەی مێگەلی کۆمەلایەتیە بەرەو ئامانجەکان، نمونەی فاشیزم و ناسیونال سۆسیالزمی ئەلمانی لە سەرکەوتنیاندا بەسەر پەیژەکانی دەسەلاتدا کاریان لە (کۆ نەستی جەماوەری) ئەلمانی وئیتالی کردووە لەرێگەی جولاندنی سۆمبۆلە سێکسوالیەکان و هێزە دوژمنکارە خەفەبووەکانی نێو قولایی کۆنەست . سێکسوالیەت و کێشەکانی لای رایخ چیدی لەنێو عیادەو پراکسیسەکانی دەروونشیکارو خەستەخانەکاندا خۆی نابینێتەوە، بەلکو رەهەندێکی کۆمەلایەتی گەورەی هەیەو لەنێو کۆمەلگەدا چارەسەری خۆی درێژە پێدەدات، .گەر سیگمۆند فرۆید لە کلاسیکیەتی دەروونشیکاری خۆیدا زیاتر لەسەر (ناك و كەس) کاری کردبێت و تیۆرەی خۆی پەرەپێدابێت، ئەوا رایخ دەروونشیکاری پابەند دەکات بە رەهەندە سیاسی و کۆمەلایەتیەکانیەوە، ئەو لە شیکارکردنی فاشیزم لەو بڕوایەدا بوو کە هیتلەر ئەو

هێزە سیکسواڵیەی هاروژاند کەدەمێکە لەنێو هاوڵاتیـانی چینی بچـوك و خوارمـام ناوەندی پەنگی خواردبوو، هەموو یەکێـك بـەڕای ڕایـخ خـۆی وەك هیتلەرێـکی بچـوك دەبینی ، ڕایخ لە کتێبی (سایکۆلۆژیای جەماوەری فاشیزم) دەڵێت :

هـەموو ناسـیونال سۆسیالیستێـك سـەرەڕای ڕەدوکـەوتن و ژێردەسـتەیی ،خـۆی وەك هیتلەرێکی بچوك دەهاتە بەرچاو...) ل٨٩

Wlihelm Reich. Massenpsychologie des Faschismus.Kiwi ١٩٧٧

هیتلەر بە دانپێـدانانی وشـەکان و هـاوارکردن و هاروژانـدنی ڕاسیسـتیەت و تـرس لەناوچوونی توخم و یەکگرتوویی جەستەی ئەڵمانی و ڕەگەزی ئاری لە ڕەگەزە ناجۆر و بێـگانەکان، ڕۆڵـی ئـەو پاڵـەوان و باوکـەی دەبـینی کەمنداڵـەکان دەپارێزێـت لەهەڕەشەکانی دەرەوە،سەرەڕای ترس و هەیبەت لەباوك منداڵان لە قۆناغێکی دیکـەدا دەیانەوێت لەگەڵ ئەو وێنەیەدا یەکبگرنەوە، سـۆمبۆلی خاچـی شـکاو خـۆی لەخۆیـدا دەبێتە سۆمبۆلێکی سێکسـواڵی و هێـز و حەزەسێکسـواڵیەکان دەهاروژێنێـت، لەڕێـگەی تورەیی و مێگەلخوازی و ڕاسیستی ئەو سۆمبۆل و هاوار و گوتـارو جوڵانە دەبنـە وێـنەی زاڵ بەسەر هۆشمەندی باوی کۆمەڵگەدا و فاشیزم بەو شێوەیە توانی جـەماوەر بۆخـۆی ڕاکێشێت.

فرۆید لە تیۆرەی خۆیدا بـاس لـەوە دەکـات کـە چـەپاندنی پرسـیارە سێکسـیەکان کەمنداڵ لەدوای پێنجساڵیەوە لەدایك و باوکی دەکات وەك ئێمەلەکوێـوە هـاتووین و منـداڵ چـۆن دروستدەبێـت و لەهەمانکاتیشـدا یـاریکردنی منـداڵ (بەتایبـەت کـوڕ) بەئەندامی نێرینەی و هەستکردنی کچی بچوك بەجیاوازی ئەندامی خـۆی لـەهی کـوڕ، یاوەکو دۆزینەوەی جیاوازی لەنێوان ئەندامی کوڕ و ئەندامی مێینە !، ئایا دایـك بێـت یاوەکو هەر مێینیەکی دیکە بێت، ئەمانە هەمووی لەڕێگەی دەزگـای خێـزانەوە وەڵامـی جۆراوجۆری دەدرێتەوە، یاوەکو لە حاڵەتی کۆمەڵگەی ئێمەدا کەئیسـلام بەشێـکی زۆری کولتـوری هەڵسـوکەتی پێکدەهێنێـت، دەچەپێنرێـت و وەڵامنادرێـتەوە، یـاوەکو وەڵامدانەوەی دەگەڕێنەوە بۆ ئاین، ئیدی ئەم (پشێویە ڕۆحیە) لەگەڵ منداڵـدا گـەورە دەبێـت و هـەموو چـەپاندنەکان شێـوازی دیکـە لەخۆدەگرن،کـەزیاتر لەشـەرمنی و دوژمنکاری و خەفەبوونی ڕۆحی خۆی ئاوێـنەیی دەکات،بۆنمونـە مرۆڤـی ڕۆژهـەڵاتی

مرۆڤێکی شەرمنی پڕ ترس وپەشێویە و لەڕووی زمانەوانی و ڕیتۆریك و فەساحەتەوە بەگشتی کەسێکی پەرتبووە.

شێوازی چەپاندنی بیروڕاکان خۆی لەخۆیدا چەپاندنی هێزێکی شاراوەی سێکسوالیە کەلەگەڵ مرۆڤدا گەورە دەبێت. گەر کۆمەڵگە ژێرخانی ئابووری هەبێت، ئەوا ژێرخانی ئابووری تاکەکان، هۆرمۆنەسێکسوالیەکانن کە بەشێکی گرنگی گەشەپێدانی لەشن و لەداهاتووشدا گرنگترین هۆرمۆنی کردەی لەدایکبوونن، هۆرمۆنەکان کاردانەوەی رۆحیان هەیە و سایکۆلۆژیەتی مرۆڤەکان دیاری دەکەن، لەتورەیەوە بیگرە تاوەکو پێکەنین و تەرکیزکردن و چالاکی و سستی مرۆڤەکان، بەتایبەت لەمنداڵدا کەبەڕاستەوخۆ بە غەریزە ڕەمەکیەتەوە بەندە وەك لە سوستمێکی بالای پەروەردەی بەهاکان کەلەدوایدا پێدەگات و کاریگەری خۆی هەیە لەسەری. ئەم سەرەتا کلاسیکیانە وەرگێڕانی ڕایخ بوو بۆ تیۆرەی فرۆید لەسەر کۆمەڵگە و پەیوەندیەکانی. ڤلهێم ڕایخ لەوبڕوایەدا بوو کە سوستێمی دەوڵەت و دام و دەزگاکانی ئەو ڕۆڵەگرنگە دەبینن لە چالاکی و ڕێرەوخوازیکردنی (ووزەی سێکسوالی) ، مزگەوت و کلێسا کاریان چەپاندنی ئەو حەزانەیە بەبالاکردنیان، هەموو مەوعزە و گوتارەکان و تەنانەت لەتەنیشتیەوە سزاکان ڕۆڵی ئەو (زەبری چەپاندن) ە دەبینین کە سێکسوالیەت دەکەنە تابۆیەك و قەدەغەیەکی باسلێنەکراو، لەژێر ناوی فەزیلەت و پاکیتیدا هەموو ئەو ووزەیە بەرەو بالایی ڕاپێچدەکرێت ، بالایەك کەئاین پێمان دەڵێت:هەتاوەکو ئێوە سێکسوالیەت لەبیربکەن ، ئەوا ئێوە بونەوەرێکی کۆمەلایەتی پاك و بێگەردن و لەخەڵکە ڕێزدارەکانی کۆمەڵگەن، بە پێچەوانەی ئەوەوە دەبنە کەسە قێزەورەکانی نێو کۆمەڵگە. لەسەر ئەم بنەمایە بەداخەوە کۆمەڵگە(بەنێو ئیسلامیەکان) بناغەی خۆی دامەزراندووە و لەگەڵیشیدا پارتە کۆنەخوازەکان بەو بەها و نۆرمانە پابەندن ، مادامەکی ڕەدووکەوتنی ئەو بەهاو نۆرمانە زەمانەتێکی ڕاکێشانی جەماوەرێکی بەرفراوانە، تەنانەت پارتە بەنێو ڕادیکاڵ و لیبرال و مارکسیەکانیش لە پێچەکاندا موجامەلەی ئەو بەهایانەدەکەن و تائەوەندە بانگەشەی گۆڕانکاری دەکەن کە لەشوێنایەکی لاوازن و دوورن لە دەسەلاتەوە ، بەلام کاتێك یاری دەسەلات دەستپێدەکات ، ئەوا دیموکراتیرین پارتی کوردی لە ئیسلامیەك ئیسلامیترە. لەبەر ئەم دوو دەموچاویە کەسوستێمی چەپاندنی سێکسوالی لەڕۆحی مرۆڤەکانی کۆمەڵگە

(ئیسلامیەکان) بینای دەکات ، مرۆڤی بارنۆیت و دەسەڵاتخوازی پڕ ووزەیەکی تێکدەرانە و تورە لە پێچەکانی مێژوویاندا قووت دەبنەوەو لە موجامەلەکردنیان بۆ بەها کلاسیەکانی شەرف و کەرامەت و مزگەوت ، ئەقلی باوی زاخاودراو بە چەپاندن دەدووێنن. لەبەر ئەوە سەیر نیە کەلەجیاتی هیتلەرێك سەدەها هیتلەر لەم وڵاتانەدا پەیدابن،هەر لە پاکستانی (موشەرف)ە وە بیگرە تاوەکو ئێراقی سەدام و دوای سەدامیش کە لەهەموو شوێنێکدا سەدامۆچکەیەك یاوەکو بن لادنێك یاوەکو زەرقاوی وسەبعاویەك لێ پەیدا دەبێت کە بەناوی شەرف و کەرامەت و حورمەت هەوڵی جەماوەر کۆکردنەوەو مەوعزە و پراکتیزەکردنی زەبر دەکات لەژێر ناوی حوکمی نەتەوە و حوکمی ئاین و حوکمی پرۆلیتاریا و هتد .. بەم شێوەیە فۆرمەکانی چەپاندنی سێکسواڵیەت لەمومارەسەی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا خۆی نیشاندەدات. ڕایخ تاوەکو مردنی لەزیندانێکی ئەمریکادا کاری لەسەر ئەو پەیوەندیەی نێوان سێکسواڵیەت و کۆمەڵگادا کرد.

ڕایخ پێی وەهابوو کەناکرێت لەفاشیزم بڕوانین بەبێ ئەو هۆکارە ئابووری و کۆمەڵایەتیانەی دەوروبەری تەنیووە، بەبێ ئەو ژینگەیەی تێدا گەشەی کردووە ، ناکرێت زۆرانبازی چینەکۆمەڵایەتیان لە شیتەڵکردنەوەی چەپاندن ڕووتبکەینەوە،بەمەش دەیویست تیۆرەی زۆرانبازی چینەکانی کارل مارکس پەیوەست بکاتەوە بە تیۆرەی چەپاندنی سێکسواڵی شیکارە دەروونیەوە. بەپێچەوانەی فرۆیدەوە ڕایخ ئەگرسیۆن و چەپاندنی بەهۆکارە دەرکیەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی پابەند دەکرد، یەکێك لەوانە دەزگاکانی ئاین و کڵێسا بوو کە ئەو بە ڕۆڵی پۆلیسی گەورەی ئەخلاقی دەچوواند.

ئاین بەگشتی و خۆی لەخۆیدا و (ئاینی ئیسلام) بەتایبەتی ئەو ووزە چەپاندنە دوژمنکارەی لەنێوان دێڕەکانیدا حەشارداوە کەهەموو قوڵبوونەوەیەك لەو دێڕانە ، زاخاودانی دوو حەزە ، یەکێکیان بۆ چەپاندنی خود و حەزێکیش بۆ چەپاندنی ئەویدیکەیە، وشەی (کوشتن) و بەتایبەت سورەتە جیهادیەکان، پڕیتی لە شەی وەك (ئیرهاب) و سەربڕین (نحر) و لەت لەتکردنی دوژمنەکان، کەمێژووی ئیسلام و مێژووی ئاینەکانی دیکە بەتایبەت مەسیحیەت لەسەدە تاریکەکاندا پێی بەناوبانگ بوون،ئەوەی قوڵبێتەوە لەئیسلامدا بەرامبەر دوو چەمکی دەبێتەوە ، یەکەمیان

(ئازایەتی و بەئس) و دووهەمیان (سەبر و دان بەخۆداگرتن) ، ئەمە دووە پێکهاتەی دیارو بەرچاوی کەسانی موسوڵمانی ڕاستەقینەنەن، ئیسلامیە نوێیەکان بەگشتی خەڵکانێکن لەدەرەوەی نێوەندی ئەکادیمیەوە نەهاتوون ، بەڵکو لەنێو ئەکادیمیەتەوە پەرورده بوون ، دان بەخۆداگرتن و جیهادی علیمیان وەهایان لێناکات کە سیفەتی دووهەم لەبیربکەن کەئەویش (ئازایەتی/ شەجاعەت و بەئس)ە، لەوانەیە فیگورێکی وەکو (حەجاج بن یوسف ئەلسەقەفی) باشترین نمونەی کۆکردنەوەی ئەو دووسیفەتە بووبێت، لە مامۆستایەکی ئاینی کە وانەی قورئانی دەگوتەوە و ببێت بە ئەو سەرکردە دڵرەقەی کەلەئێراق و حیجازداسەری هەزاران نەیارانی ئەمویەکانی پەڕاند،مێژووی سیاسی وجیهادی ئیسلام پڕ لەهەزارەها نمونەی ئاوەها ، هەمیشە شەرو پێکدانەکان لەسەر مێز و لە کتێب و نوسینەکانەوە سەرچاوە هەڵدەگرێ و دەگوازرێتەوە بۆ سەر گۆرەپانی ژیان، هیچ شەرێك نیە لەم جیهانەدا بەبێ کولتورێکی تایبەت بەخۆی و تیۆرەزەدیەکی تایبەت کە ئەو شەرانە ڕەوازەدەی بکات، تواناى بەردەوامی هەبێت. کاتێك ئێمە دەچینە نێو لاپەڕیەکی ئینتەرنێت و پێش ئەوەی کلیپی سەربڕینێك تەماشا بکەین ، ئەوا لەسەرەوەی لاپەڕەکە سورەتێکی سەحیحیان هێناوەتەوە لەسەر سەربڕین (نەحر) و نوسراوە کەسەربڕینی دوژمن ڕەوایە تاوەکو شەڕ کۆتایی پێدێت، هەروەك ئەوەی بیانەوێت بڵێن کەئەم سەربڕینانە زەرورەتێکی شەڕە نەك حەزێك بۆ خوێن ڕشتنێکی کوێرانە، تەنانەت لە ڤیدۆکلیپەکانیاندا کاتێك تەقینەوەیەك نیشاندەدەن ، خێرا سورەتێك تیلاوە دەکەن کە دەڵێت ئێمە بۆ ئەوانمان نەهاویشت (بێگومان مەبەستی بۆمب و خۆتەقینەوەکانە) بەڵکو خودا دەیهاوێت بۆیان (وانما الله رمی). ئەمانە و چەندەها نمونەی دیکە هەیە لەسەربڕین و کوشتن و لەتەتکردنی جەستە و سەبڕین، کە کەش وهەوای تایبەتی فیکری جیهادین. لێرەوە تیرۆر و ئیرهاب لای ئیسلامیەکان نەك سیفەتێکی ناشرین نیە ، بەڵکو یەکێکە لەسیفەتە باشەکان کە نیشانەی بەئس و شەجاعەتە،ئەوتا ئیسلامیەك لەلاپەرەیەکی ئینەتەرنێتدا گوتارێکی سەرنجراکێشی نووسیبوو ، تێدا هاتبوو، کە ئێمە خۆشحاڵین بەوەی پێمان دەڵێن ئیرهابی و ئیرهاب کردنی دوژمن واجبێکە و وەسیلەکەشی هەرچیەك بێت مەشروعە، ئەم تێزە جێگەی بیرکردنەوەو تێگەیشتنە لە تیرۆر کەلە سەرچاوەیەکی ئاینیەوە، ئارگومێنتخوازی ئەم دێرە بەچەندەها ئایەت و سورەتەوە دەکات و بەرووداوەکانی

فەلەستین و ئێراق و گوانتانامۆ پۆزشی بۆ دەهێنێتەوە، ئەمەش بەدیویێکی دیکەدا ڕەهەندێکی دیکەی کێشەبەندی و ئیشکالیەتی گلۆبالی ئەمریکانزمە لەجیهاندا.
کەواتە ئێمە لەبەردەم تیرۆردایین بەدووری و بینینێکی چەپاندنەوە. بە نوێنەری بەهایەکی بالاوە کە خۆی بەپاریزگاری دەزانێت، لەدنیایەکدا بەڕای فوندەمێنتالْ دنیایەکە ئەخلاقی خۆی فەوتاندووە، دنیایەك کە نۆرمە تەقلیدیە کۆنەخوازەکانی تێدا ونبووە و تەلفیزۆن و ئینتەرنێت و کۆمۆنیکاسیۆنی هاوچەرخ کولتورێکی دیکەی لە جیهانگیری (گۆلۆبال) هێناوەتە نێو کۆمەڵگە ئیسلامیەکان، ئەمە بۆ ئیسلامیەکان مەترسیەکی گەورەیە و ئەمریکانیزمیش،( کەئەمەش جێگەی باسێکی دیکەمان دەبێت)، بەتۆبزی خۆی کردووە بە نوێنەری دنیای (پۆست مۆدێرنە و دیموکراسی ) ، کەبێگومان ئەم تێزە جێگەی گومانە، بەلام لەدەرکەوتن و بەرەنگاربوونەوەدا بەرەکان ئاوەها دابەشبوون و گەیشتونەتە ترۆپکێکی خوێناوی.
بەگەڕانەوە بۆ ئەو شۆکە گەورەیەی گروپەکەی شێخ زانا و نیشاندانی دانپێدانەکانیان، ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت کە شۆکی گەورە لە سەربڕین وکوشتندا نەبووە ، بەڵکو لەهاروژاندنی ئەو تابۆ و قەدەغەیە بوو لەکۆمەڵگەی ئێمە ، کەئەویش (سێکس)ە و لەئەویش خراپتر (هۆمۆسێکسوالیەتە) ، لەوەش خراپتر لەشارێکی وەك هەولێر ڕوویدا کە شارێکە خۆی بەهەڵگری نۆرمە هەرە کۆنەخواز و کۆنزەرڤاتیفی کوردی و ئیسلامی دەزانێت!، لەمەش سەختر ئەوەبوو کە فیگورێکی وەك (شێخ زانا) لەخێزانێکی زێدە ئارتۆدۆکسی ئیسلامی و کۆنەپاریز پەروەردە بووە.
لەلایەکی دیکەوە بۆ ئەوەی تەنها ئیسلامیەت و ژینگەی کۆنەپارێزی تاوانبارنەکەین ، دەتوانین سەرنجێك لەئەندامانی ئەو باندەبدەین ئەوا لەنێوەندی ئەکادیمیای کوردیشەوە دوو کەس بەشدارن و ئەمەجگە لەوەی باندەکە ئەندامی تێدا بوو کەلەحکومەتی هەرێم و هەستیاترین دەزگای ئەمنیەوە هاتووە، ئەوانی دیکەش لەچین و توێژەکانی دیکەی کۆمەڵگەن. هەر وەك ئەوەی ئەمانە نوێنەری هەموو چین وتوێژەکانی کۆمەڵگەی کوردی بن و دوومەسەلەی گرنگ هەمووانی بەجیاوازی ڕۆشنبیری وپلەی کۆمەلایەتیەوە کۆکردبێتەوە، کەئەویش سێکسە لەفۆرمی تیرۆردا.
(شێخ زانا) گەر لە دەوونێکی نەخۆشەوە بێت یاوەکو لە تێگەیشتنیەوە بێت لە کۆمەڵگەی کوردەواری، (سێکس)ی کردبووە خاڵی سێنترالْ بۆ ڕاکێشان و ئەکتیڤکردنی

گروپەکەی، ئەوانەبەرۆژ پیاوە موعتەبەرەکانی کۆمەڵگە بوون و شەویش حەزی خوێنڕشتن و لەتەتکردنی جەستە و هەوسبازیان بەشێوەیەکی نەخۆشانە تێرکردووە، ئەمەش لەشیکاری دەروونیدا خۆی لەخۆیدا تێرکردنێکی هێزێکی ئەگرسیۆنە پابەندە بە هێزی سێکسواڵیەت، سێکس کردن و کۆتایی هێنانی بەکوشتنی قوربانی خۆی لەخۆیدا ئارەزوویەکی نەخۆشانە تێردەکات، ئەو دیاردەیە لەهەموو جیهاندا بوونی هەیە، بەلام لێرەدا حەزدەکەم هەڵوێستەیەکی کورتبکەم، ئەویش ئەوەیە، کەلەکۆمەڵگە ڕۆژئاوایایەکاندا دیاردەکانی نێربازی و هۆمۆسێکسواڵیەت و دیاردەکانی سێکس کردن لەگەڵ یەکێکدا و لەدویدا کوشتنی، (بەتایبەت فڕاندنی منداڵی کچ و کوڕ و کوشتنی یاوەکو دیاردەی ئەوەی کەهەندێك کەس خۆی لەئینتەرنێتدا پێشکەش دەکرد بۆ خواردن و هەندێك کەسیش هەن ئەوە دەکەن)، ئەمانە و زۆری دیکە کەلەکۆمەڵگەی ڕۆژئاوایدا ڕوودەدەن نابێت لەگەڵ ئەو لادانە سێکسوالی و مۆراڵ مرۆڤانەی ئێمە تێکەڵ بکرێن، لەوانەیە بەگشتی بتوانین بڵێین کە لەکۆمەڵگەی ئێمەدا لەچەپاندنی سێکسوالی و کۆمەلایەتیەوە لادانی سێکسوالی کۆمەلایەتی سەرهەڵبدات، بەلام لەکۆمەڵگەی ڕۆژئاوایایدا ژیانی پۆست مۆدێرنە و تێگەیشتنی خراپ لەمەڕ گەیشتن بە دوای چێژ و (پۆست چێژ) هۆکاری ئەو لادانە کۆمەلایەتیانە بن (بەتایبەت کوشتن و لەت لەتکردن) و ئەو کردانەی لەسێکسواڵیەتە دەردەچێت و دەچێتە خانەی تاوانەوە، ئیدی لێرەوە ئەو جیاوازیە دەبێتە جێگەی بابەتێکی دیکە.
چەپاندن و سێکس و هۆمۆسێکسواڵیەت و دەسەلات، ئەو پرسیارە سەختانە بوون کەگروپەکەی شێخ زانا هاروژاندنیان و دەسەلاتی کوردی چاوەڕێی ئەو هەموو کاردانەوەیەی نەکرد، بەلای ئەوانەوە ئاشکراکردنی ئەوباندانە لەسەر تەلفیزیۆن سەرکەوتنێکی دەزگا ئەمنیەکانە و ڕیسواکردنی ئیسلامیستەکانی نیشاندەدا، گەر بیانزانیبا ئەو هەرایە دەنێتەوە، لەوبڕوایەدانەبووم لەسەر شاشەکانیش نیشانیان بدایە، گەر نیشانیان بدایەئەوا وەکو هەموو گروپێکی توندڕەوی ئیسلامی کەلەسەرانسەری دنیادا تیرۆر ئەنجامدەدەن نیشاندەدران. نەك بەو شێوەیەی کەبینیمان. ئەوان نەیاندەزانی کەفڕێدانی بەردێك بۆنێو گۆمێکی پڕ چەپاندن هەموو ئەو مەسەلانە دەتەقێنێتەوە کە بەدرێژایی مێژوومان لەگەڵماندا ژیاوەو خەفەمانکردووە. هەموو سوستێمێکی کۆمەلایەتی وەك کۆمەڵگەی ئێمە لەسەر

ئامرازەکانی چەپاندن و لەخزمەت چەپاندندا کاردەکات و هەوڵی شاردنەوە و پەردەپۆشینی ئازارەوە سروشتییەکانی مرۆڤ دەکات . چ لەرێگەی وەعزەوە بێت و چ لەرێگەی سزادانی کۆمەڵایەتی وجەستەیی و چ لەرێگەی یاسای پشت ئەستوور بەشەریعەتەوە بێت و چ لەرێگەی دەزگای پەروەردە بێت کەلەسەر بنەمای سزای جەستەیی و چەپاندنی سێکسوالی دامەزراوە.

دەسەڵاتی کوردی بێئەوەی ئاگای لەخۆ بێت خزمەتێکی گەورەی بە تێزەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی دەکرد . ئەویش بەهاروژاندنی مەسەلەیەك کەبەبێ ساڵەهایە بەبێ چارەسەرکردن ماوەتەوە. کەبەداخەوە دەبوایە ئەم مەسەلەیە دەمێك بایە بەشە ئەکادیمیەکانی سایکۆلۆژیاو سۆسیۆلۆژی زانکۆکان بیانهاروژاندایە. نەك لەرێگەی باندێکی تیرۆریستەوە. هاروژاندنی ئەم مەسەلەیە کردنەوەی دەرگاکانی [illegible] گفتوگۆیە لەسەر پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانی نێو کۆمەڵگەی ئێمە و [illegible] جیدی پێویستە لەسەر دووبارە بیناکردنەوەی پەیوەندی نێوان نێر و مێ [illegible] ئەو دەرکەوتەیە کە سێکس و تیرۆر هاروژاندنیان. دەرکەوتنەی ئەو دەبوایە [illegible] بایە ئێمە لە پرسەکانی دیموکراتیەت جیامان نەکردبایەوە . دەبوایە [illegible] قوتابیان و خوێندکاران ولاوان و [illegible] بیانهاروژاندایە نەك باندێکی تیرۆر. دەسەڵاتی کوردی [illegible] کێشەیەکەیە کرد و هەوڵی کۆکردنەوەی ڕیبەرخوازی ئەم [illegible] لەرێگەی تەلەفیزۆنەکان کەبوون بە مزگەوت و [illegible] وەکو ڕوشنبیرێکی جیدی لە مێژووی کورتدا ڕێگەی ئاخافتنی پێنەدرێت. دیسەها مەلا لەبەرنامەکانیدا دەردەکەون [illegible] پێموایە دەسەڵاتی کوردی کارێکی باشی دەکات کەئەم مەسەلەیە دەهاروژێنێت. بەمەرجێك ئەمە لە [illegible] وەك (پارتی دیموکراتی کوردستان)وە سەرپەرشتی دەکرێت. کەهەڵگری [illegible] کوردەواریین. ئەوان بەمیتۆدێکی شارستیانە (جۆرە ئەخلاقیەت و [illegible] تەلەفیزۆنی کراوە و ڕێبەری) و ئەقلیەتێکی [illegible] ئەو مەسەلەیە بخەنەبەر گفتوگۆ. [illegible] ئەکە لەچوارچێوەیەکی ساڵاتر وماوچارەخانەتر و [illegible] بیانهاروژاندایە. [illegible] ئاوەکو ئێستا هۆشمەندی سیاسی [illegible] چوارچێوەیەکی [illegible] جێبەجێ بێنێت. ئەمڕۆش ئەوەی

ئەوەکە...

[illegible]

بەمانەشەوە [illegible] لەسەر بنەمای موحافزکارانە و توێژەکانی کۆمەڵگەدوارە
کاردەکەین. هەچی لە پێچێکدا هێزە موحافزکارەکان چ ئەبێت کێشەکە ناخاتە نێو
ئەمومزوو و هەوڵی فەرامۆشکردنی ئادات. نەك لەبەر ئەوەی لەدەست دەرچووە و ئیدی
دانا پۆشری . چونکە لە کۆمەڵگەی ئێمەدا شارەزابوون لەداپۆشین و پەردەپۆشین کردن و
ئامادەگی یادەوەری کۆمەڵایەتی بۆ لەبیرکردن هێزێکی جادوگەرانەی سەیریان هەیە.
مەسەلەکان زۆر زوو پەردەپۆش دەکرێن و ئەقڵی کۆمەڵایەتی زۆر زوو مەسەلە
گرنگەکان لەبیردەکەن، هێزێك هەیە بۆ لەبیرچوونەوە کەئەویش لە پەروەردەی
مرۆڤەکانەوە هاتووە لەگەڵ چەپاندن، ئەو هێزەی بەردەوام لەمنداڵیەوە داوای
لەبیرکردن و داپۆشینی مەسەلە بەنێو حەرامەکانمان لێدەکات، ئەو هێزەیە
لەگەڵماندا گەورەبووە، لەبەر ئەوە سەیرنیە کەتاوانبارەکان(فایلدار و بیرۆکراتی
گەندەڵ و ئەنفالچی و..هتد) لەکۆمەڵگەی ئێمەدا دوای ماوەیەکی زەمەنی کورد
جارێکی دیکە دێنەوە نێو شوێنا هەستیارەکانی کۆمەڵگە و ڕابوردوویان لەلایەن
کۆمەڵگەوە لەبیر دەکرێت.. مانگرتنێك کەدەکرێت دوای ماوەیەك هەر خۆیان مانگرەکان
و هەمان گروپی مانگرتوو زۆر زوو هیلاکدەبن وبەنیوەڕازیکردنێك هەموو ئەو
ئامانجەسەرەکیانە لەبیردەکەن کە بانگەشەیان بۆکردووە، موتابەعەکردن و
چیرەدرێژی لەکۆمەڵگەی ئێمەدا بەبوغز لەقەڵەمدەردێت و لەبیرکردن و بیرچوونەوەش
بە فەزیلەت..لەبەر ئەوە میتۆدی فەرامۆشکردن ، تەنانەت لە نێو ڕۆژنامە و
گۆڤارەکوردیەکانیشدا بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکیانە وەك مامەڵەیەکی سروشتی پیادە
دەکرێت..لەبەرئەوە لەلام سەیرەنیە کە بابەتێکی ئاکتوێل و گرنگی ئاوەها تەنها
جێگەی گرنگی پێدانی لایەنێکی میدیای کوردی بێت و ئەوانی دیکە بە بابەتێکی
گرنگی تێنەگەن.. بەهەر حاڵ ئەو کردنەوەی دەرگای موناقەشەیە لەسەر تیرۆر کارێکی
زۆر پۆزەتیفە بەڵام من لێرەدا لەسەر ڕۆشنایی ئەو خاڵەقورسانەی لەسەر سێکسواڵیەت
و چەپاندن هاروژاندنم سەرنجەکانی خۆم دەخەمە ڕوو ، بەو هیوایەی کردنەوەی

دەرگایەك بێت لەسەر كێشەی چەپاندن و لەپێناو (دووبارە بنیاكردنەوەیە پەیوەندی نێوان نێر و مێی كوردی )بێت.

هەمیشە كۆنزەرڤاتیفەكان هەستیارترن بەرامبەر مەسەلەكانی مۆراڵ و نۆرم و بەها كۆمەڵایەتیەكان (شەرەف و كەرامەتی نەتەوەو ئاین و نیشتمان و ئیسلامەتی..هتد)، ئەوان، بەتایبەت ئێمە باس لەكۆمەڵگەی ڕۆژهەڵاتی دەكەین كەئیسلام سێبەرێكی قورسی بەسەر هەموو هەڵس و كەوت وپاساو مامەڵەكۆمەڵایەتیەكاندا جێهێشتووە و لەپشت هەموو دەزگایەكی كۆمەڵایتیەوە كاری خۆی دەكات،هەستیاری ئەوان لەوەدایە ئەوان خاوەنی میراتیەكی پڕن و جیهانبینیەكی ڕوون و ئاشكرایان هەیە، كریستێك كاتێك قسەدەكات خاوەنی پاكەتێكی تەواوە لەبیروڕاو و لێكدانەوە، ماركسیەكی تەقلیدی كاتێگ قسەدەكات خاوەنی كۆمەڵێك هێڵی گشتیە و پێكهاتەكانی دیارن، ئیسلامیەكیش هەروەها و بەهەمان شێوەش كاتێك مەلایەك قسە دەكات نۆرم وبەهاكانی ڕوون و ئاشكران، لێرەوە ئەو هەستیاریەی ئەوان بەرامبەر هەموو لادانێك لەسەر ئەو نۆرمانە،لە هەستیاریەكە كەسی لادەر یاوەكو گروپی لادەر بەهێزترن مادامەكی ئەوان خۆیان بەپارێزەری ئەو نۆرمانە تێدەگەن. دەسەڵاتی كوردی زۆر زوو دەركی بە لێكەوتەكانی نیشاندانی تاوانەكانی ئەو باندەكرد، زۆر بەووردی هەستیانكرد كە تەنها مەسەلەكە لەپرسیاری ئەمنی دەرچووە ، بەڵكو ئەوەی كەكێشەكەی هاروژاند كێشەی سێكس بوو، لەیەكەم كاردانەوەیاندا بۆ پێچانەوەو گۆڕینی ئاڕاستەی مەسەلە هاروژاوەكە مەلایەكانی هەولێریان خستە سەر تەلەفیزۆن و زیاتر تەئكید لەتیرۆركرا و تاوەكو ئێستاش هەوڵدەدرێت تیرۆر بكەن بەمەسەلەی سێنترالی گفتوگۆ ، گەر بڕوابەوە بكەین ئەوا دەبووایە ئەوان لەدوای تەقینەوەكانی بیرۆكانی(مەكتەب) پارتی و یەكێتیەوە ئاوەها بەگەرمیەوە باسیان لێبكردایە، مەسەلەكە دۆزینەوەی ڕێگەقوتاربوونێكە لە كێشەیەكی گەورەتر كەلایەنێكی ئاكتیڤی (سێكس و چەپاندن)ە كەئەمیش بێگومان بەسوودوەرگرتن لەنێزدكانی ڕایخ پابەند دەبێتەوە بە(پرسی ئازادیەكان) و ووردتر قسەبكەم بە پرسی (جۆری ئازادیەكان).

دەسەڵاتی كوردی بەبەردەوامی مامەڵەیكی نەگونجاوی لەگەڵ ئیسلام و ئیسلامیەكاندا كردووە، لەلایەك موجامەلەی كردوون و لەگەڵیاندا دانیشتوون و سازشیان لەگەڵدا كردوون و لەلایەكیش بەسەختی لێیداوون، هەر دوو مامەڵەكەش لەخزمەتی ئەواندا

بووە، هەمووشی ژینگەیەکی پێکهێناوە کەتێدا ئیسلامی توندڕەو گەشەبکات، تاوەکو ئێستا ئەو ڕاهەڵەیە زاڵە بەسەر دەسەلات و تەنانەت زۆربەی ڕۆشنبیرانی ڕەسمی کوردی ، بەوەی چارەسەری توندڕەوی ئیسلامی لە ئەکتیڤکردن و چالاکردنی ڕۆڵی مەلا و ئیسلامیە مام ناوەندی و هێمنەکانە، لەوەدایە، مەلایەکان بە ئیدانەکردنیان بۆ تیرۆر دەتوانن پایەگەکانی فیکری جیهادی تێك و پێك بشکێنن، تاوەکو ئێستا لەو بڕوایەدان کە مەوعزەی وەکو (ئیسلام بەرەکەتە بۆ ئۆمەتی موحەد ) دەتوانی زینی ئەو ئەسپەخوێناویە بکات کەسمکۆلانی لەنێو خوێنی ئێمەی سیڤیلدا وەردەدا و دەیەوێت تێکمانبشکێنێ، تاوەکو ئێستا لەو بڕوایەدان کەدەبێت مەلایەکان و پیاوە ئاینیەکان هەڵوێست وەرگرن و لەڕێگەی مەوعزەوە دەتوانن بەر بەئەو شەپۆلی توندڕەویە بگرن ، بەلام گەر سەرنجێکی خێرای ولاتێکی وەك عەرەبی سعودیە بدەین ، کە لەگەڵ ئەوەی حکومەت بەردەوام هێزو توانای خۆی تەرخانکردووە بۆ چالاککردنی ئیسلامی مام ناوەندی و هێمن ، لەگەڵ بوونی چەندەها نێوەندی فەتوا کەدژی فەتواکانی قاعیدە و جیهادیەکان بەسورەتی سەحیح و هۆشمەند کردنەوەی ئاینی هەڵدەستن ، کەچی تیرۆر لەو نێوەندەدا پەلاماری خودی ئەو دەسەلاتە دەدات کەخۆی لەسەر بنچینەکانی ئاین دامەزراوە..ئەو ڕایە تاوەکو ئێستا خاڵی بنچینەی کارکردنی زۆربەی میدیا و سیاسیەکانی ئێمەیە، بەڕای ئەوان گەر هاتوو ئایەتی ڕەحمەت گەشە پێبدرێت، ئەوا ئایەتی جیهادی پاشکشێ دەکات، بەبێئەوەی ئەوە بزانن کەهەردوو ئایەتەکان تەواوکاری یەکترن و ئەلقەی زنجیرەیەکی دوورو درێژن لە دەسەلاتێکی ئاینی کەدەیەوێت دەسەلاتی خۆی قایمبکات. دیسانەوە دەسەلاتی کوردی پەنا دەباتە بەر ئەو مزگەوتەی کەژینگەی ئەو توندڕەوانەبوون،لەشێخ زانا وە بیگرە تاوەکو دەگاتە مەلاکرێکارو زەرقاوی و ئەبو قوتادەکان.. ژینگەیەکە لەسەرەتادا بەهێمنی و مامناوەندی دەستپێدەکات و لە گەڵ قۆناغبونەوە بەبە بەشەجیهادیەکەی تەواوکاری دەبێت، هەموو توندڕەوەکان ئیرهاب وەك وەسیلەیەك دەبینن بۆ گەیشتن بەئامانجی باڵاو پیرۆز ، سەرەتا لەئایەتەکانی ڕەحمەتەوە دەستپێدەکات و لەدوایشدا ڕێگەکان دەچنەوە سەر جیهاد.

ئەمە سەرەتایەکی سادەیە بۆ تێگەیشتن و هەموو توندڕەوەکانیش لەشەو و ڕۆژێکەوە نەبوون بەو درندانە، لێرەوە گەڕانەوە بۆ مزگەوت و چالاکردنی مزگەوت پەرەپێدانێکی

نێگەتیفانەی ڕۆڵی هێزەئاینیەکانە لەکۆمەڵگەی ئێمەدا، ئەوەی من تێبینیم کرد لەقسەی مەلایەکان لەسەر شاشەی تەلفیزۆنەکان فۆرمێك بوو لەفۆرمەکانی پەرەپێدانی دەسەلاتی ئاینی و داواکردنی سەلاحیاتە بۆ ئەوەی بتوانن زیاتر خۆهەڵقورتێنە ئەو دەزگا کۆمەلایەتە مەدەنیانەی کەلەدوای ڕاپەڕینەوە بە ئازارو زۆرانبازیەکی سەخت ئێستا خەریکی پەرپێدانی خۆیانن، لەبەرامبەر ئەوەدا مەلایەکان دەیانەوێت دەسەلاتی کوردی بخەنە سەر ئەو بڕوایەی کە ڕۆڵی ئەوان لەکۆمەڵگەدا فەرامۆشکراوە ، لەبەرئەوەیە توندڕەو ئاوەها هاربووە و مەسەلەکان گەیشتونەتە ئەو ئاستە خوێناویە، مەلایەکان بەوەشەوە نەوەستان و لەبەرنامەیەکدا مەلایەکی گەنج داوای پێکهێنانی ئەڵتەرناتیفێکی کرد بۆ فەتوای ئاینی کەبەڕای ئەو ڕێزدارە گوێگرتن لە فەتوانی ئیسلامی عەرەبی و وەرگرتنی لەلاپەڕەکانی ئینتەر نێتەوە والەگەنج دەکات کە ببێت بە توندڕەو ، مادامەکی مەرجەعێکی فەتوای کوردی نیە ڕێگەی نیشانبدات!!. گەر ئەمە خەونێك نەبێت بۆ بەڕێوەبردنی ژیانی کولتوری وکۆمەلایەتی ئێمە لەژێر سێبەری فەتوادا و داواکردنی زیاتر دەستڕۆیشتوویی نەبێت بۆ ڕێگەگرتن لەکولتوری بەئازاری دیموکراسی و قە[illegible]کردنەوەی هەینەیەکی وەك عولەمای موسلیمینی کوردی لەشێوەی ئەوەی بەغدا[illegible] هیچی دیکە نیە. ئەوەی گوێیی لەو بەڕێزانە بووایە تێبینی ئەوەی دەکرد کەمەلایەکان دوو خاڵ پێشنیار دەکەن یەکەمیان ئەکتیڤکردنەوەی مزگەوت و سێنترالکردنی خوتبەی هەینیە، و دروهەمیان لەوەزیاتر پێدەهاوێژێت و داوای دامەزرادنی هەیئەیە و سێنتەرێك بۆ فەتوا و ئەکتیڤکردنەوەی ڕۆڵی ئەوان دەکات زیاتر لەوەی کە پێیا[illegible] بەخشراوە لەکۆمەڵگەدا. گەر دەسەلاتی کوردی ئەم داواکاریانە جێبەجێبکات و [illegible]امەلەیان بکات ، ئەوا دەبێت لەداهاتوودا نەك شێخ زانا بەڵکو هەولێر پڕدەبێت لە گەنجی ڕیشن کەهەر یەکە و فەتوایەك و مەزهەبێکی لەبن هەنگڵدا دەبێت.

خاڵێکی دیکەی ئەوەیە. کەدەمێکە کۆمەڵگە (بەتایبەت هەولێر) لەژێر دەسەلاتی مەلایەکاندا دەناڵێنێ،بۆنمونە هەر لەو زەمەنەی زانکۆی سلێمانی گواسترایەوە بۆ هەولێر و بوو بەسەلاحەدین، دیاردەی قبولکردنی خوێندکاری زانکۆ لە کۆمەڵگەی هەولێردا قبولکردنێکی نێگەتیفانە و تۆبزیانەی هەبوو، زانکۆی جاران و بەتایبەت خوێندکارانی، زۆریان دەویست لەکۆ ئەقلی کۆمەڵگە تێبگەیەنن ، کە کوڕوکچەکان

مەلایەکان و مزگەوتەکان و نوێنەرکانیان قوڵکردنەوەی ئەو چەپاندنە سێکسواڵیانەن کەکۆمەڵگەی ئێمەی کردۆتە بەندیخانەیەك بۆ ڕۆح،مرۆڤەکانی ئێمەی کردۆتە مرۆڤێك کەبەدوو دەمووچاوە وە بژین، ژیانی نهێنی بۆتە ژیانی ڕاستەقینە و ژیانی ڕاستەقینەش بۆتە ڕووکەشێك و پەردەپۆشکردنێکی بێماناى ژیانی نهێنیمانە. لەکاتێکدا نوێنەرانی چەپاندن لە کڵێساوە بیگرە تاوەکو مزگەوت و هەموو دەزگائاینیەکان ، مرۆڤەکان ناچار دەکەن لەسەر شێوە ژیانیـ و لەجیاتی مۆراڵێکی مرۆیی ، مۆراڵێکی ئاینی دەسەپێنن بەسەر کۆمەڵگەدا، لەکاتێکدا مەلا و قەشەکان دەستڕۆیشتوویان دەگاتە ئاستێك کە تەواوی تۆڕی پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکان بە ئەمرو نەهیەکانیان دا پۆشن، ئیدی فۆرمەکانی چەپاندن لەشێوەیەکی فەرمانی دەرەکیەوە دەبێتە سوستێمێکی چاودێری لەنێو دەروونداو لەوێوە هەموو حەرامەکان گەر مومارەسەش بکرێت ،ئەوا دەبێت لە بوارێکی دیکەی ژیاندا مومارەسەبکرێت ، ئەویش مومارەسەی ژیانی نهێنیە، فوندەمێنتاڵترینیان نمونەی نمونەی باندەکەی شێخ زانا بوو.

توند ڕەوی لەو ژینگەی چەپاندنەدا زیاتر گەشەدەکات و زیاتر سنورەکانی ژیانی نهێنی خۆی پەرپێدەدات. کاری ئێمە قوڵکردنەوەی چەپاندن نیە بە پێکهێنانی سێنترالی دیکەی فەتواو زیادکردنی سێنتەرە ئاینیەکان، بەڵکو کردنەوەی سنورەکانە بەرەو ئازادی پەیوەندیەکانی نێو کۆمەڵگەیە لەچوارچێوەی ڕێکخستنێکی شارستنیانەی ڕاتسیۆناڵ و ئەقلانیدا، گەڕانەوە بۆ تێگەیشتن لە مافە سروشتیەکانی مرۆڤ و دووبارە ڕێکخستنەوەیان لەڕێگەی ئەو هەموو توانا ڕۆشنبیری و ئەکادیمیەی لەکۆمەڵگەی ئێمەدا بوونیان هەیە ، دەبێت ئەرکێکی دیکەی دەسەلاتی کوردی و هەمووان بێت. دەبێت ئێمە پێناسەی زۆر بەهاو نۆرم بکەین کەتاوەکو ئێستا تەنها لەوشە و دێڕی نێو گوتارە سیاسی و ئاینیەکان نەبێت هیچی دیکە نەبووە، لەوانە داب و نەریتی کوردەواری چیە و کامەن تاوەکو ئێمە پێیانەوە مولتەزیم بین؟، ئایا ئەمانە نەریتی ئیسلامی نین ، ئیدی جیاوازیان چیە لەگەڵ نەریتێك تایبەت بێت بەهاکانی ناسیونالەوە؟!، بۆچی دەبێت مولتەزیم بین پێوەی و لەخزمەت چ شارەستانیەتدا پابەندبوومان بەسوودە!. لەم ساڵانەی دوایدا ڕۆشنبیرێکی چالاك لە هەوڵدانەکانیدا ویستی نێزیك بێتەوە لەو بەهاو نۆرمانەی بە مەزندەی ئەو بەهای

پیاوەتی و ئازایەتی کوردانەیە و بەڕای وی سەردەمی کەڵە پیاوانی کورددوا...
بەسەرچووە، سەردەمێك کە پیاوە ئازاکانی کورد ، سەردەمی کەڵەمێردان و جوامێری و
غروری کوردان بەسەر چۆوە ، سەردەمانێکە من گومان لەهەبوونی دەکەم بەو شەبارەی
کەباسی لێوەکراوە و خۆیشی سەرەڕای بەگەڕ خستنی ئەو هەموو توانا نەک...یەی
ناتونێت پیمابڵێت ئەم سەردەمی جوامیریە کەی و چۆن بووە!! (لەوانەیە ...ری
ناوبراو ئەم دەرکپینەکردنەم بە جەهل و کولتوری کۆیلە تێبگات کە جوامێری ...
نابینێت) ، یاخود ئەو ڕقە سەیرەی لەو فیگورەی کەلەنێو کۆمەڵگەی ئێمەدا ...
کاری خۆی دەکات و توانیویەتی دەسەلات و کۆمەڵگەی کوردی لەبەردد لێپرس...
ڕاستەقینەدا پابەندبکات، ئەو فیگورەی کەتاوێك بەناوی دژە (بەهاکانی کو...
ناودەبرێت و تاوێك بەناوی (ڕژئاوا پەرست ) و تاوێك بەنێوی (غەیرەدین) و ...
مۆدێلیش ، مۆدێلی فاروق ڕەفیق ئەوە بوو کە(ڕۆشنبیری کورد)ئەم جارە ...
فەلسەفەو ڕۆشنبیری کورد بە (کۆیلە و ئەمریکانزم ) و دژە (جوامێری کەڵەمێ...
کوردانە) تاونبار کرا . هەموو نوێنەرکانی چەپاندن ڕقیان لەو دۆزەیە. ڕقیان ...
فیگورەیە کەنێوی (ڕۆشنبیر) و ڕۆشنبیریە..
بەگەڕانەوە بۆ تێزەکانی (ڕایخ) تێدەگەین کەکارکردن لەسەر جەستەی چەپێنە
کێشەبەندی گەورەی کولتوری بەرهەمدێنێت و لەنێو ئەم کەلێنە سەختانەدا ئیـ...
سیاسی کاری خۆی دەکات و پەردەدات بە مومارەسەی چەپاندنی سێکسوالی وەك ...
هەنگاو بۆ دەستبەسەراگرتن بەسەر هەموو ڕەهەندێکی ئازادانە کۆمەڵگە بەرەو ...
بەرێت، ئیدی دەرکەوتن و فۆرمەکانینان لەچەندەها شێوەی جیاوازدا نوێنە...
خۆیان دەکەن، هەموویان پێکرا لەنێوەندا کاریان لەسەر جەستە... ...ەر
لەچەپاندنیەوە بیگرە تاوەکو لەت لەتکردنی و سزادانی.
لەسەر ڕۆشنایی ئەم وتووێژەی سەرەوە ئەو پرسیارەمان ئاراستەدەکرێت . کەئایا چی
بکەین بۆ ئەوەی ئیسلامی توندڕەو سنورداربکەین؟ ، گەر مەلایەکان ئەو بەراوردەنەکە
و ئایەتەکان بەدیوی ڕەحمەتدا تەفسیر نەکەن ئەی چ ڕێگەیە چارەیەکی دیکە هە...
گەر نەگەڕێنەوە بۆ تیژکردنەوەی بەهاکوردیەکان و (ڕۆشنبیری جوامێران و کەنە...
و غروری کوردی ) ئەی کەواتە پشت بەچ بەهاو نۆرمێك ببەستین بۆ هەڵ...

ڕێسی کۆمەڵایەتیمان؟، گەر مۆراڵی ئیسلامی جڵەوبەندمان [illegible]، کامەیە مۆراڵی ئەڵتەرناتیف؟!.

ئێمە لەبەشێك لەم نوسینەماندا باسمان لەوەکرد کەشۆکی خەڵکی لەمەڕ گروپەکەی شێخ زانا لەوەدا نەبوو کە ئەمانە باندێکی تیرۆیستن و خەڵکی دەکوژن و سەریاندەبڕن، ئەمەش جێگەی شۆك نیە لەبەرئەوەی کۆمەڵگەی ئێمە لەتیرۆری حکومەتەمەرکەزیە ئێراقیەکانەوە بیگرە تاوەکو تیرۆری پیاوانی بەعس و تیرۆەکانی دیکەی ئەوەندە نایخاتە سەر بارێکی پشێوی ،بەتایبەت هەولێر کەشەقام و جادە و کۆڵانەکانی شانۆی چەندەها ڕووداوی خوێناوی سەخت و بێبەزەیی بوون، شۆکی گەورە لە دارمانی کۆشکی شوشەیی (کۆمەڵگەی کوردی پاکیزە) بوو، وەهمی ئەو پەردە پاکیزەیە بوو کەسالاهایە مزگەوت لەکۆنەستی کوردیدا چاندوویەتی و لە پڕێکدا لەنێو موحافزترین خێزانی شێخانەوە باندێك سەرهەڵدەدات کەنەك تەنها خۆی مومارەسەی هۆمۆسێکسوالیەت دەکات، بەڵکو هەموو وێنەکانی (ژیانی نهێنی ) کۆمەڵگەی ئێمە ، لەکیژی چەپێندراو کە مومارەسەی سێکس دەکەن، تاوەکو مێردمنداڵی زاخاودراو بە حەزەکانی هۆمۆ سێکسواڵ لەسەر شاشەکان دەردەکەون و دەبنە قوربانی باندێکی تیرۆریستی . ئەمە کرۆکی ئەو مەسەلەیە کەدەسەلاتی کوردی بەیارمەتی مەلایەکان و بە پشتیوانی میدیاکانی هەوڵی پێچانەوەی دەدات و دەیگەڕێنێتەوەبۆ نێو پرسی تیرۆر ، کەوەك هەمووان دەزانین ئێستا تەنها هەولێر و سلێمانی ئامانجی تیرۆر نیە ، بەڵکو میسر و لەندەن و باریس و بەرلین و مەدرید و هەموو پایتەختەکانی دنیای تازە. دەبووایە ئەو پرسیارە بکرایە بۆچی (سێکس ) ئەو جادووە دەبەخشێت بەڕادەیەك کە گەر کوشتنیشی قوربانیەکەشی بەدوودابێت!!، لەچاوی هیچ یەکێك لەوانە پەشیمانی نەدەخوێنرایەوە ، لەگێڕانەوەی هەموویاندا ئەوە سەرنجی ڕادەکێشام کە زۆر بە(ئاسایی) ڕووداوەکانینان دەگێڕایەوە، هەر وەك ئەوەی باس لەکڕینی کیلۆیەك تەماتە بکەن لەبازاڕێکی قەرەباڵغدا.

ئێستا لەهەموو دنیادا باس لەتیرۆر ناکرێت ، بەڵکو باس لە بنەبڕکردنی هۆکارەکارەکانی تیرۆر دەکرێت، باس لەو تەرزە بیرانە دەکرێت کە تیرۆر لەکوێوە سەریهەڵداوە و بۆچی و چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکەین ، دیارە ئەمە لەدنیای ئێمەدا خەمێکی جیهانیە و کوردیش بەشێکە لەو جیهانەی کەلەنێوان زۆرانبازیەکاندا

هاوکێشەیەکی تایبەت بەخۆی هەیە. گەر دەوڵەتانی ئەوروپا جارێکی دیکە بەسیاسەتی دەرەوەی خۆیاندا بچنەوە لەمەڕ پەیوەندیان لەگەڵ کۆمەڵگە (بەناو ئیسلامیەکاندا) و جارێکی دیکە هەوڵبدەن جەمسەرکانی ئەو هاوکێشەیە ڕاڤەبکەن و شوێنای خۆیان و هەڵوێستی خۆیان لەکێشە سەرەکیەکان دیاری بکەن ، ئەوا لەڕووی ناوخۆی وڵاتەکانیانەوە هەوڵدەدەن جارێکی دیکە پەیوەندیان بە گروپە کلتوریەکانی نێو کۆمەڵگەی خۆیان دووبارەبیناکەنەوە، هەوڵدەدەن لەو پێکهاتەیە تێبگەن کەنەتەوە و گروپە بێگانەکان لەنێو تۆڕی پەیوەندیەکۆمەلایەتیەکانی ئەواندا پێکیان هێناوە و بەدەر لە تەفسیر و مامەڵەکانی لەوەو بەر جارێکی دیکە گفتوگۆو مامەڵەی لەگەڵدا بکەن. لە دوای یازدەی سێپتمبەرەوە ئەو پرسیارە بەردەوام دووبارە و دەبارە دەکرێتەوە ، هەڵە لەکوێدایە؟، کەلێنە فیکری و ڕۆشنبیرەکان لەکوێدایە و ئەم قەیرانەی کەلەهەناوی کۆمەڵگەی شارستانیتەوە بەرهەمهاتووە، بەرهەمی هێزێکی ئاینیە بەتێزەکانیەوە ، یاخود بەرهەمی هەڵەی مامەڵەی مۆدێرنەیە لەگەڵ کولتور و ئاینەکانە؟!! ... ئەمە و زۆر پرسیاری دیکە لەدوای خۆکێشانی فڕۆکەکانی باندەکەی (موحەمەد عەتا) بەبورجەکانی مانهاتنەوە ، بەردەوام سەرهەڵدەدەن و دەکرێنەوەو دووبارە ڕاڤەکردن و گفتوگۆ لەنێو ئەڵقە فەلسەفی وفیکری وئاینی و سیاسیەکاندا بەردەوامی هەیە تاوەکو ڕۆژانی ئەمڕۆ .

(شێخ زانا) و باندەکەی ئەو فڕۆکە سمبۆلیانە بوون کەخۆیان کێشا بەباڵاخانەکانی کۆمەڵگەی هەولێردا، هەموو ئەو نۆرم و بەها کۆنەخوازی و ئیسلامخوازیەکانی ساڵانێکی دوورودرێژە مزگەوت لەهەولێر بینای کردبوو ، لەساتی بیستن و بینینی ئەو دۆکۆمێنتانە و ئەو دانپێدانانە ، دارمان و ئێستا دەسەڵات هەوڵدەدات لەجێگەی دارو پەردووکەی جارێکی دیکە دوو بورجەکە لەڕێگەی مەلایەکانەوە بینابکاتەوە.

ئەمەش ئیشکالیەتێکی گەورەیە کە دەسەڵات لەجیاتی پێداچوونەوە بە پەیوەندی خۆی لەگەڵ مزگەوت ، دێت و جارێکی دیکە ئەو پەیوەندیە قوڵتر دەکاتەوە و دەیەوێت مەوعز و فەتواکان ،(کە ژینگەی توندڕەوی ئیسلامین)، ببن بەڕێنیشاندەرێك بۆ دوور کەوتنەوە لە توندڕەوی !!، ئەمە کارێکی دژ بەیەکە و پێمووایە ژینگەیەکی فراوانتر و گونجاوتر بۆ توندڕەوی پێکدەهێنێت. ئەمە پێچە بەدەورە و هەڵاتنە لە جەوهەری کێشەکە ، لەسیحری ئەو باندە کەهەموو پێکهاتەکانی کۆمەڵگەی کوردی لەخۆگرتبوو،

ئەو سیحرەی کوڕ و باوك و قەساب و مامۆستای زانکۆی پێکەوە گرێدابوو، سیحرێك کە (سکێس) کۆبەندی هەموو باندەکەبوو . من پێموایە دەبووایە دەسەلاتی کوردی تۆزێك دانی بەخۆیدا بگرتبا و نێوەندی ڕۆشنبیریشی بە هەمان هێزی پشتگیری خۆی لەمەلایەکان بەشدارکردبا لەو گفتوگۆ سەختەی کەنەك تەنها تایبەتە بەهەولێر، بەڵکو تایبەتە بەهەموو کۆمەڵگەی کوردی و ئەگەری هەڵتۆقینی هەیە لەهەر شوێنێکی دیکەی جەستەی کۆمەلایەتی کۆمەڵگەی کوردی . دەبووایە ئەم مەسەلەیە جێگەی لێکۆڵینەوەی قوڵ و جۆراوجۆری ئەکادیمی بێت و دەسەلاتیش پشتگیری ئەو پڕۆژەیە بکات و هەموو ڕەخنەجیدیەکان بەهەند وەربگرێت.

بەگەڕانەوە بۆ هەموو ئەو هیپۆتێزە و گریمانەی باسمان لێوەکردن ، بەگەڕانەوە بۆ خاڵی سێکسوالیەت و چەپاندن لەکۆمەڵگەی کوردەواریدا و پەیوەندی بەتیرۆری جەستە و ڕۆحەوە دەتوانین چەند هێلێکی گشتی دیکەی گفتوگۆ و پێشنیار بخەینەڕوو ، کەلەمانەی خوارەوە پێکدێن..

* دووبارە بیناکردنەوەی پەیوەندی نێوان مزگەوت و دەسەلات: لەکوێ دەبێت دەسەلات سنوری خۆی کۆتایی پێبێت و لەکوێش دەبێت مزگەوت سنوری خۆی دەستپێبکات و هەروەها بەپێچەوانەوە. تاوەکو ئێستا مزگەوتەکان لەپشت بڕیاری سیاسەوە کاری خۆیان دەکەن و سێبەرێکی قورسیان خستۆتە سەر هەنگاوەکانی دەسەلات و دەسەلاتیش بەردەوام خۆی بە پەراوێزەکانی مزگەوتەوە هەڵواسیوە.

کارکردنمان لەسەر بنەماکانی سێکولاریەت (عەلەمانیەت) و گوتارێکی ڕاتسیونالْ و ئەقلانی نێزیکمان دەخاتەوە لە ئاشکراکردنی نهێنیەکانی ووردەکاریەکانی ئەو پەیوەندیەی نێوان دەسەلات و مزگەوت و تێگەیشتین لێی ، ئەمەش لە دوابازنەدا سنوری دەسەلاتی ڕۆحی لە چوارچێوەی سروشتی خۆیدا دەپارێزێت وەك سەرچاوەیەکی ڕۆحی و پەیوەندی نێوان خودا و مرۆڤ. لەلایەکی دیکەوە دەبێت هۆی ڕێکخستنەوەی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و دەسەلات لەچوارچێوەی پڕۆسەیەکی سیاسی دیموکراسیدا جولچەی خۆی هەبێت..

- دووباره بیناکردنەوەی پەیوەندی نێوان کۆمەڵگە و مزگەوت. ئەمەش بە شێوەیەکی گشتی لە پەیوەندی نێوان دەزگا مەدەنیەکانی نێو کۆمەڵگە و مزگەوت خۆی دەبینێتەوە. ئەم پەیوەندیە دەبێت چیدی وەکو جاران نەمێنێت و دەبێت دەزگاکان ئەوندەی گرنگی دەدەن بە پەرەسەندنی سروشتی خۆیان بە پێی خێرایی گۆڕانکاریەکانی پەیوەندی مرۆڤ بە کۆمەڵەوە ، ئەوەندە ڕەچاوی بەهاکانی مزگەوت نەکەن ، بەلام ئاین لەو چوارچێوە ڕۆحیە گەورەیەدا تەماشابکەین کەهەیە و دەبێت پێناسە بکرێت. گەر ئەوە نەکرێت، ئەوا لوتژەنینی ڕاستەوخۆی مەلایەکان لەهەوڵەکانی بیناکردنەی کۆمەڵگەی مەدەنیدا و بەکارهێنانی توندوتیژی زمانەوانی لەشێوەی خوتبەی جومعە و خەڵك هاندان دژی ئەو دیاردە شارستانیانەی سەرهەڵدەدەن ، دەبێتە هۆی قوڵکردنەوەی قەیرانەکانی نێوان مزگەوت و کۆمەڵگە. بۆنمونە کاتێك لاوی کوروکچ ویستیان وەکو هەموو ئەو گەنجانەی دنیا کە گۆرانبێژ و موزیکەی خۆیان هان دەدن و قاش دەکەن ،کۆبنەوە لەدەوری تەختە شانۆی کۆنسێرتەکاندا ، مەلایەکانی هەولێر ئەوەندەیان خوتبە و مەوعزی توڕەدا دژی ئەم دیاردەیە ، کەچیدی گەنجێك نەوێرێت جارێکی دیکە مومارەسەی ئەو مافەی خۆی بکات.

- دیاریکردنی پەیوەندی نێوان ئیرۆتیك و پۆرنۆگرافی: گەر جوانترین پەیوەندی لەژیانی ئێمەدا، پەیوەندی خۆشەویستی و لێتگەیشتن بێت ، ئەوا ئیرۆتیك و سێکسوالیەت و مومارەسەکردنی دروستی ئەو پەیوەندیە، کۆمەڵگە دوور دەخاتەوە لەهەموو لادانێکی نادروست و لەهەموو توندوتیژیەك لەسەر جەستە. لەلایەکی دیکەوە دەبێت ئێمە بەهەموو ئەو پەیوەندیانەدا بچینەوەو بزانین لەکوێدا ئێمەدا باس لەئیرۆتیکا دەکەین وەك پەیوەندیەکی سروشتی نێوان نێر و مێی کوردی و لەکوێشدا ئەو پەیوەندیە دەبێتە پۆرۆنۆگرافیایەك کەلەپشتیەوە قازانجەکەسیەکان و ئارەزووەکان لەچوارچێوەیەکی بەرژەوەندی ئامێزدا مومارەسەدەکرێت. تاوەکو ئێستا مرۆڤی کورد ناتوانێت سنورەکانی ئەم لەوی دیکە جودا بکاتەوە، پیاوان هەموو

خەوتنێك و مومارەسەیەكی پێش ژنهێنان لە گەڵ ئەشقەكانیاندا بە خەوتن لەگەڵ سۆزانیەكدا تێدەگەن ، كەمن ئەو گەنجانەی لەگەڵ ئەو ئافرەتانەدا بەردەوامی بە پەیوەندی خۆشەویستی بدەن ، گەر هاتوو لەگەڵ ئەشقەكانیاندا پێكەوە مومارەسەی سێكس یاوەكو جۆرێك لە سێكسیان كردبێت. برینی مەمكی قوربانیەكانی باندەكەی شێخ زانا سومبۆلێكە بۆ ئەو مافدانە بەخۆ بە لەناوبردنی سۆزانیەكان و پاكردنەوەی كۆمەڵگە لێیان كە مێژوویەكی دوورودرێجی هەیە لە نەستی ئیسلامی و ئاینیدا. لەهەمان كاتدا تێكەڵكردنی ئەم دووجۆر مومارەسەی سێكسواڵە، (ئیرۆتیك و پۆرنرگراف) و نەبوونی هۆشمەندی سێكسواڵی دەبێتە هۆی ئەو نیگەرانی پشێویەكی ترسناكی ڕۆحی ، كەزۆر جار نەك هەر پەیوەندی خۆشەویستی و لێتێگەیشتن تێكدەدات ، بەڵكو توندوتیژی دژی جەستەش ڕەواخواز دەكات، مادامەكی ئەمە جەستەی ئافرەتێكە لەگەڵ مندا هاتۆتەجێگەوە بەبێ بوونی ڕەوابەندی پیرۆزیەكانی ئاین و مزگەوت ، كەواتە ئەمە سۆزانیەكە و رەوایە كۆمەڵگە لە سۆزانیەكان پاكبكرێنەوە.

- تێگەیشتنێكی دیكە لەسۆزانیەت و پۆرنۆگرافی: گەر شتێك هەبێت پێبگوترێت شار ، ئەوا سۆزانیەت دیاردەیەكی سروشتی دەرهاویشتە كۆمەلایەتی و تەنانەت لایەنە بازرگانیەكەی دەبێت. پۆرنۆگرافی پابەندە بە بەرژەوەندیەكی ماتریالیەوەو سۆز و لێتێگەیشتنی سروشتیانەی نێوان نێرو مێ ڕۆڵێكی ئەوتۆی تێدا ناگێڕێ. دەشێت خۆتێركردنە كاتیەكان لە پۆرنۆگرافی و هونەرەكانی تێركردندا كۆبكەینەوە،بەلام ونبوونی پێناسە و لێكۆڵینەوەی تایبەت بەو دیاردەیە و ونبوونی هۆشمەندی سێكسواڵی بەرەو تێگەیشتنی هەڵە و دواجاریش بەرو توندوتیژیمان دەبات.

- ئۆرگانیزە نەكردنی ئەم دیاردەی سۆزانیەت و تێنەگەیشتن و پەراوێزكردنی ئەم بابەتە لەلایەن دەسەلات و كۆمەڵگەوە دەبێتە هۆی ئەوەی سۆزانیەت بەشێوەیەكی نادروست و تاوانكاریانە تەشەنەبكات. دەبێت نێوەندە

ئـــەكاديمی و حكوميـــەكانی ئێـــمە ئـــەم دياردەيـــە پێناســـەيە بكـــەن و چوارچێوەكانی دياريكەن و خاسيەتە سـەرەكيەكانی خاڵبەنـدی بكـەن لـە چەندەها تەوەرەی گرنگی لێكۆڵینەوە . ئاشكرايە لەوەتـەی كۆمەڵگـە هەيـە دياردەی سۆزانيەت ئامادەگی خۆی هەيە، بەڵام كۆمەڵگەی كـوردەواری لەژێـر كاريگەريـەكانی مزگـەوت ئـەم دياردەيـەی فـەرامۆش كـردووە و هـەوڵی پەراوێزكردنی داوە و لـەدژی توندوتيـژی بەكارهێـناوە، تەنانـەت زۆرجـار تيرۆريش كراون.

- <u>دياريكردنی پەيوەندی نێوان مزگەوت و زانكۆ و رەهەندە توندوتيژيـەكانی</u> :

گەر سێبەری قورسی مزگەوت نەبووايە لەسەر كۆنەستی كۆمەڵگەی كـوردەواری ئێمە، ئەوا منێوەندە ئەكاديميەكە ئەوەندە وێـران و ترسـنۆكانە نـەدەبوو، گەر ئەوانيش ئەوەندە لاواز و خۆكۆنترۆڵكراو نەبوونايە ، مزگـەوت ئاوەهـا كـۆنترۆڵی ژيـانی تايبـەتی ئێـمەيان نـەدەكرد، تەنانـەت بـوارە هـەرە تايبەتيەكانيش زاخاودراون بە پشتەوێنەكانی مزگەوت و دەرهاويشتەكانی . تاوەكو ئێستا ئێمە لێـكۆڵینەوەكانی بەشـەكانی دەروونـزانی و كۆمەڵناسـی زانكۆكانی لەو بوارەدا بە پێـی پێويسـت نـەبوون ، گـەر هـاتوو بەهەقـەت بوونيان هەبووبێت. نێوەندە ئەكاديمەكانی ئێمە لەژێر كاريگەری مزگـەوت و ئيسلامدا خۆيـان نـادەن لـەهيچ بابەتێـك كـە حەرامـەكان بهاروژێنێـت و تەنانەت ئەو بەشە تايبەتـانەی پێويستە لەچوارچێوەی داخراوی زانكۆكانـدا باسبكرێن لە موحازەرەكاندا لادەبرێن، بۆنمونە بابەتێكی وەك ( پـەروەردەی سێكسی) و( سێكسـواڵيەت) نـەك هـەر لەموحازەرەكانـدا لادەبرێـت و بـازی بەسەردا دەدرێت و وەك تابۆيەكی ترسناك تەماشا دەكرێت. لێـرەوە سێـبەری مزگەوت لەبواری زانستە مرۆيەكاندا، سێبەرێكە هەناسەی هـەموو تێزێـكی زانستيانەی دروست توند دەكات، بێگومان گەر ژەهراويشی نەكات.

- <u>كۆنترۆڵكردن و رێرەو خـوازكردنی دوژمنكـاری و تـورەيی لەنێـو كۆمەڵگـەی ئێمە</u>: كوردستـانی ئێمە وەكـو لەوەوپێـش باسـانكرد پرێـتی لەتورەيـەكی

بەردەوام کە (چەپاندن ) ووزەدەرێتی ، چەپاندن لە پشتیەوە وەستاوەو دەیجوڵێنێت. لەهەموو شوێنێکدا دەموچاوی تورەو مۆن سیمای کۆمەڵگەی ئێمەیە، دیارە نارەزایی لەم فەوزای ژیانی ئێمە و ئەو هەموو بیروکراتیەت و جەردەییە بەشێکی زۆری هۆکارە کۆمەڵایەتیەکانی بەخشینی سیمایەکی تورەن بەم مرۆڤەکانی ئەم کۆمەڵگەیە. ئەگرسێۆن (دوژمنکاری) لەهەموو کون و کەلەبرێکدا بەرووسا دەتەقێتەوە، ئەوەی سەیری جولچەی ئۆتۆمبێلەکان و شێوازی لێخورینیان ربکات، هەستدەکات کە شۆفێری لای ئێمە قوڵکردنەوەی دوژمنکاریەکی بێوێنەیە، شەرکردنێکە لەگەڵ خود و هامووشۆکاران و جادە و دارو بەرد، بەهەمان شێوە لە قوتابخانە سەرەتایەکانمانەوە بیگرە تاوەکو دەگاتە زانکۆیەك کە پرێتی لەماجستێر و دکتۆرای ساختە و ئەگرسیڤیەت (دوژمنکاریەت) دەگاتە ئاستێکی ترسناك کە ئیدی هیچ شتێك بۆ ئاتەکێتی زانکۆیی نامێنتەوە. ئیدی لەم نێوەندەدا بزە ونە و دەموچاوی بەبزەی خزمەتگوزراری بە خەڵکی ونە و لێرەشەوە ئێمە لەبەردەم ناگفتوگۆیەکی بێوێنەداین....

هەر یەك لەم هێڵەگشتیانەی باسمانکردن خۆی لەخۆیدا تەوەرەیەکی باس وخواستی تایبەتن، ئێمە بە سوود وەرگرتن لە تێزەکانی ڤلهێلم رایخەوە توانیمان وەك هێپۆتێزەیەك (گریمانە) یەك بینای چەندەها بیرو ئیدیا لەمەر رەهەندەکانی (چەپاندن ) و (سێکسوالیەت ) و (دوژمنکاری ) بخەینە بەر تیرۆژە تیشکەوە.

ئەوەی هەموو ئەم مەسەلانەی تەقاندەوە ئەو فرۆکانەی باندەکەی شێخ زانا بوون کە خۆیان کێشا بەبورجەکانی چەپاندنی دێرینەی کۆمەڵگەی ئێمە.

بەسوود وەرگرتن لە رایخ دەتوانین بڵێن ئەمرۆ ئەرکی دوورودرێژی هەمووان ئەوەیە لە رەهەندەکانی چەپاندن و سێکسوالیەت و پەروەردە نێیزیك بینەوەو هەوڵبدەین لەو هاوکێشە ئاڵۆزە تێبگەین کەبەدرێژایی سەدەکان لەگەڵ کولتوری ئیسلامدا پێکیهێناوە، ئەرکی ئێمە وەرگتنەوەی (دار و عەسای بەئەدەبکردنی ئیمامی عومەرە ) لەدەستی مزگەوت و توردانی بۆ نێو رابووردەیەکی ناشرین و کردنەوەی

پەنجەرەیێك لەسەر سێكسواڵیەت و خۆشەویستی و پێكەنین و گفتووگۆ. باندەكەی شێخ زانا لەم گۆشەنیگایەوە فینۆمینێكە كە دە شێت بكرێت بە بابەتێكی بەردەوام بۆ توێژینەوە و لە مێژووی لێكۆڵینەوەی زانستی دەروون و كۆمەڵناسی كوردیدا دووبارە و دەبارە و سەرلەنوێ لێكۆڵینەوەی زانستیانەی دەرئەنجامبدرێت.

بەگەڕانەوە بۆ ڕایخ دەتوانین بڵێین ئەو دارەی ئیمامی عومەر هەیبوو بۆ لێدانی هەموو خواروخێچییەك لەگەڵ پڕۆزیدا نەگونجێت، ئەو دارەی كەمەلایەكان و مزگەوت خەونی بەوەرگرتنەوەی دەبینین،ئەو دارەی سەردەمانێكە بەدەستی مامۆستا و پەروەردەكارو و تەواوی پیاو و ژنەئێپسراوەكانی كۆمەڵگەی ئێمەوەیە، هیچی بەرهەمنەهێناوە جگە لە چەپاندن و شێواندنی پەیوەندی سروشتی نێوان نێرومێ و خێزان و قوتابخانە و دەسەلات و خەڵكی ، ئەركی ڕۆشنبیر لێسەندنەوەی ئەم دارەیە لەدەست ئەو ئیمامانەی بەبەرگی جۆراوجۆرەوە كۆمەڵگەی ئێمە بەرەو بێمانایی و پەڕەپووتی پەلكێش دەكەن..

# هەڵبژاردن و دابەشکردنی دیموکراسی

لەهەڵبژاردنی یەکەمی کوردستاندا پەنجا بە پەنجا یەکەم شێوازی بەشکردنی دەسەڵات بوو کەتێیدا هەموو مانایەکی خودی پرۆسەی هەڵبژاردنی بێماناکرد و ڕووتیکردوە لە هەموو ناوەڕۆکێکی جیدی کە پابەند بێت بە چەمکی هەڵبژاردن. گەر ئەو زەمەنە پارتی ویەکێتی حونجەتی ئەودیان هەبوایە گوایە بۆ هاوسەنگکردنەوەی هێزی هەردوولا ئەم ڕێگەیان گرتەبەر، گەر ئەوسا لەژێر ئەو حونجەتەبوو کە شەڕی ناوخۆ هەڵنەگیرسێت و کارەسات ڕوونەدات، ئەوا ئەزمونی دوای هەڵبژاردن ئەوەی سەلماندا کەهەڵەکاریەکانی ئەو جۆرە دابەشکردنەی دەسەڵات شەڕی خوێناوی و نەخۆشی کۆمەڵایەتی ناوەهای لێکەوتەوە کەتاوەکو ئێستاش زۆریان بەچارەسەرنەکراوی ماونەتەوە.

گەر هاتوو پەنجا بە پەنجا لەژێر ناوی ئەوە پیادەڕەو دەکرا کەگوایە خەڵکی کوردستان فێرە هەڵبژاردن نەبوون و هێشتا پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و نەخشەی سیاسی کوردستان ئەو هاوسەنگیەی پێویستە و تێگەیشتن لە بوون بەئۆپۆزیسیۆن و گرتنی کورسی پەرلەمان وەك هێزێکی ئۆپۆزیسیۆن، چوارچێوەیەکی دیاریکراوی قبوڵکراوی وەرنەگرتووە و زۆربەی کادێران و حزبیش ناتوانن بەرگەی ئەو ژیانە بگرن لەدەرەوەی دەسەڵات و هێشتا پێویستە سەبر بگرین لەسەر ئەو دابەشکردنەی دەسەڵات تاوەکو قۆناغێکی دیکە. ئەو ڕایانە کەپۆزشی بۆ ئەو دەسەڵاتبەشکردنە دەهێنایەوە زۆر زوو لەنێو خوێنی ڕژاوی شەڕی ناوخۆ مایەپووچی خۆیان ڕاگەیاند..

ئەوەی سەیری نەخشەی هەڵبژاردنەکانی ئێراق بکات خۆی لەبەردەم دوو وشەی دابەشکردن و گونجاندن (المحاصّەو التوافق) دەبینێتەوە، هەر ئەم دوو بنەما سەرەکیەی یاری هەڵبژاردن ولەداهاتووشدا شێوەی بڕیاردان و داڕشتنی دەستوری ئێراقی لەسەر دادەمەزرێت ، هەردووکیان ڕێگرێکی گەورەن لەبەردەم بەدیموکراسی بوونی ئێراق بەگشتی و کوردستانیش بەتایبەتی.

خاڵی یەکەم وسەرنجی یەکەمم ئەوەیە، گەر دابەشکردن و موحاسەسە وەك خۆیان ناوی دێنن، لەوەوە سەرچاوەی هەڵگرتبێت کە ئێراق لە تایەفەو نەتەوەو مەزهەب و ئاینی

جیاواز پێکهاتبێت و دابەشکردنی دەسەڵات کورسیەکانی پەرلەمان پێشوەخت بەسەر شیعە و سونە و کورد و سابیئە و کریست و ئێزیدیەکاندا لەسەر بنچینەی ئەو جیاوازیە قوڵانەوە سەرچاوەی هەڵگرتووە، دابەشدەکرێت . ئەوا ئەو ئارگومێنتە دووبارە کردنەوەی هەمان تراژیدیای نموزەجی یەکەمی حکومەتی هەرێمی کوردستانە لەژێر فۆرمێکی دیکەدا، دابەشکردنێکی دیکەیە کە پابەندە بەهەموو شتێکەوە جگە لەتێگەیشتن نەبێت لەدیموکراسی. کاتێك من و تۆ دەسەڵات پێشینە بەش بکەین . ئیدی دەبێت هەڵبژاردن چ مانایەکی هەبێت!!. لەکامە فەرهەنگی سیاسی دیموکراسی دەسەڵات پێش هەڵبژاردن بەشکراوە و دیاریکراوە، خۆ ئەگەر من پێشینە ٥٥ کورسیم بۆ دیاریکرابێت، ئیدی هەڵبژاردن چ مانایەکی دەبێت؟!. خۆ ئەگەر مەسەلەی دابەشکردن ئەوەندە گرنگ و هەستیارە ، ئیدی بۆچی هەر لەئێستاوە کەسەکانتان ناخنە سەر کورسیەکان و لە پەرلەمانی کوردستانیش هەر بەو شێوەیە یازدە مەلاکەی یەکگرتوو ناهێنن و چل و ئەوەندەکەش ناهێنە سەر کورسیەکان و بە پێی ڕێڕەوی حکومەتێکی ئیئتلافی کە دەسەڵات تێدا دابەشکراوە بە پێی تەرزاووی هێزەکان حوکم ناکەن و ئێمەش لەم پڕوپاگەندەیەی دیموکراسی قوتار ناکەن. گەر وانیە ، من تێناگەم کەهەردوو پەرلەمانەکە (کوردستان و ئێراقیش) بەشکردنی برایانەی کورسی بێت ، ئیدی نازانم هەر پێناسەی پەرلەمان چ مانایەکی هەیە!!.

خاڵی دووهەم ئەوەیە گەر دەسەڵات ئاوەهاش دابەش بێت و گریمان پێی ڕازی بووین!، ئەی لەدەنگدان و بڕیارداندا (گونجاندن و توافق) مانای چیە؟!. باتۆزێك ووردتر بڕوانینە ئەم مەسەلەیە، حزبی کوردی دەڵێت ئێمە تەوافقمان پێ باشە بۆ ئەوەی ڕێگر بین لەزاڵبوونی دەسەڵاتی زۆرینە ، کەدژە پڕۆژەی کوردی زۆرن و سوستێمی گونجاندنی ڕایەکان بۆ ئەو مەبەستە میتۆدێکی باشە. گەر ئێمە قەناعەت بەو سوستێمە بکەین کەواتە دەبێت ماف بدەین بەوی بەرامبەریش کە هەمان میتۆد بەکاربهێنرێت، بۆ نمونە گەر زۆربەی ئەندامانی پەرلەمانی داهاتووی ئێراق دەنگبدەن بۆ چەسپاندنی مافە شارستانیەکانی ژنان ، ئەوا بە پێی سوستێمی تەوافق و گونجاندن دەبێت ئەو دەنگدانە دیسانەوە چاوی پێدا بخشێنرێتەوە و بگونجێنرێت لەگەڵ دەنگی ئیسلامیست و هێزە ئاینیەکان کەداوای پەیڕەوکردنی شەرع دەکەن لەمەسەلەکانی خێزاندا. گەر ئەم ڕایە وانیە ئەی کەواتە تەوافق چیە، هەر خۆی ئەم وشەیە چەندەها تەفسیر هەڵدەگرێت و

توانای درێژکردنەوەو کورتکردنەوەو گونجاندنی پلاستیکی هەیە لەگەڵ هەموو ڕا و بۆچوونەکان بە پێی ئەو قاڵبە مەزهەبی وسیاسی و نەتەوەیانەی دەسەڵاتیان هەیە. تەوافق گونجاندنی دیموکراسیەتێکی ڕووکەشیە لەگەڵ دەسەڵاتدا، بە پێچەوانەشەوە، دیموکراسیەت ئەوەیە کە پێویستە دەسەڵاتەکان خۆیان لەگەڵ فۆرمە جەوهەریەکانی دیموکراسیەتدا بگونجێنن.

خاڵێکی گرنگتر ئەوەیە کە داڕشتنی یاساو بنچینەکانی هەڵبژاردن دوورن لە ڕوون وئاشکرایی و شەفایەتەوە، ڕوونکردنەوەو ڕوونخوازی و شەفافیەت یەکێکە لەبنچینە سەرەکیەکانی زمانی داڕشتنی دەستورو یاسابنچینەیەکانی ئەو هێزانەی دیموکراتخوازن ودەیانەوێت دیموکراسی بچەسپێنن. زمانی تەمومژاوی و داڕشتنی چەمك ودەستەواژەتەموژاوی و گەلێك ماناهەڵگرەکان زۆر نیازی شاراوەی ئاشکرانەکراو لەدووتوێی خۆیاندا هەڵدەگرن، هاولاتیان مافی خۆیانەلەمەسەلە گشتیە جەماوەریەکاندا، بەڕاستەوخۆ لەڕێگەی خودی تێکستەکانەوە لە پڕۆسەی سیاسی و یاسایی تێبگەن، دەستەواژەکان دوو ڕوو نەبن لەمانا و تەمومژاوی نەبن . نەك ئەوەهای لێبێت هەر حزب و دەسەڵاتێك دەستەواژە و چەمکەکان بەشێوەیەك تەفسیر بکات کەدەگونجێت لەگەڵ جەماوەرخوازی خۆی. بەداخەوە هەر وشەی گونجاندن / تەوافق خۆی لەخۆیدا چەندەها تەفسیر هەڵدەگرێت کە لەوانەیە یەکێکی دیکە بێت و تەفسیرێکی دیکەی بداتێ. هەموو ئەو وشە و دەستەواژانەی چەند مانایەکی دژ بەیە ك هەڵدەگرن یاخود تەموژاوین خزمەتی دەسەڵاتێکی تایبەت دەکات، بەلام هەرگیز ناچێتە نێو خانەی دیموکراسیەتەوە.

ئەوە بەشکردنەی دەسەلات وایکردووە کەباس لەلیست بکرێت و دەنگدان بۆ لیست بکرێت و کەسەکانی نێو لیستەکان گرنگی پلەدوو وەربگرن، ئەم گشتگیریە و ئاشکرانەکردنی ناو و کەسەکان کە پێویستە لەڕێگەی ئەوانەوە پروپاگەندەی هەڵبژاردن دەستپێبکات ، بەشێوەیەك هەمووان بزانین لەلیستێکدا کێن ئەوانەی بۆ ماوەی ساڵێك هەڵدەبژێردرێن و لیستیش ئاشکرای بکات کە ئەم کەسایەتیانە بەقەد هێندەی لیستەکان گرنگن و لیست وکەسەکان پەیوەندیەکی ئۆرگانی پتەویان هەیە پێکەوەو ئەوانەش لەداهاتوودا لێپرساوێتی دەگرنە ئەستۆ. بەلام بەداخەوە ئیدی کەسەکان وەك هەڵبژاردنی یەکەمی کوردستان بوونەتە قوربانی لیستێکی گەورەتر

وزەبەلاحتر، بەجۆرێك كەدەنگدەر بەڕوونی نەزانێت كێن ئەوانەی ئەم پرۆسەیە تاوەكو جەولەی داهاتوو بەڕێوەدەبەن. بۆنمونە لەهەڵبژاردنی یەكەمی كوردستاندا دەنگدرا بەلیست و لیست لەپێش كەسەكانەوە بوو، تاك و تواناكان لەژێر هێزی لیستی گشتیدا كز و لاواز كرا. بەجۆرێك كەهەر دوای هەڵبژاردن هەندێك ئەندام پەرلەمان لادەبراو هەندێكیش دەخرایە جێگەی، ئیدی پەرلەمانی كوردستان بوو بەفەرمانگەی لابردن و تەعینكردنی ئەم و ئەو. بەمەش هەموو ئەندامێكی نێو لیستەكە لەبەردەم ئەو هەڕەشەیەدا بوو سبەینێ لاببرێت.كەئەمەش بێگومان ئازادی رادەربڕین ودەنگدانی لاواز و مەرجدار كرد. گەر هاتوو ئەو كەسەش لەبەر توانا و دڵسۆزی دەنگی سی وپێنج هەزار هاولاتی كوردی بۆ خۆی و لیستەكەی ڕاكێشابووبێت ئەوا لەپێچێكدا لادەبراو یەكێكی دیكە دەخرایە شوێنی . مادامەكی خەڵكی دەنگیان بۆ لیست داوە!!.

حزبێكی وەك سۆسیال دیموكراتی ئەڵمانی و زۆربەی حزبەكانی دیكە ڕاستە سوستێمی لیستیان هەبوو و دەنگت بۆ لیست دەدا، بەلام مرۆ دەیزانی كەئەمانە هەڵسوڕێنەری ئەو لیستەن و ئەوانەن لەسەرجادە و لەكۆبوونەوەكاندا باسیان لەبیروڕاوبۆچوونەكانیان دەكرد. كەسەیاتیەكان گرنگن بوون و لەنێوەندا بوون نەك پەراوێزی لیستێك بن، ئەمانە هەرگیز پاشكۆی لیست نەبوون . تەنانەت لەداهاتووشدا زۆری ئەندام پەرلەمانی سەوزەكان بۆنمونە لەگەڵ زۆر پێشنیاری حزبەكەی خۆیان نەبوون.ئەوانە هەر خۆیان لەسەرتاوە دروستكاری لیست بوون بەبێ زیاد و كەم، نەك لیستەكە ئەوان دروست بكات و توانای كەنارگیری ئەوانیشی هەبێت . بەلام لەسیناریۆی دابەشكردنی دەسەلات پێش هەڵبژاردن و سوستێمی موحاسەسە، لیست حوكمی ئەم لابردن و تەعینكردنانە بۆ خۆی قۆرغ دەكات، بێگومان ئەمانە هەمووی دەر ئەنجامی ئەو موحاسەسە و بەشكردنەی دەسەلاتە كە بەگشتی دەسەلات پێش هەڵبژاردن بەشدەكرێت و بەگشتیش لیست مافی تەعینكردن و لابردنیش وەردەگرێت.

دیارینەكردن و نەبوونی شەفافیەت لە دیاریكردنی چەمكی لیست و كەسەكان و بوونی شێوەیەك لە (مەتاتیەت و لاستیكیەت) لە بانگەشەكردن و بلاوكردنەوەدا، ئەو ژوورە بینادەكات كە یاری بكرێت بەدیموكراسی وەك چەمكێكی لاستیكی بكشێنرێت بەپێی دابەشكردنەوەی دەسەلات.

دوا خاڵ کەدەمەوێت باسی بکەم ئەویش باسکردنی گشتیەکانەو وەلانانی ووردەکاریە گرنگەکانی مەسەلە سەرەکیەکانە. بۆنمونە بەناڕاستەوخۆ ئەو ڕایانە بلاودەکەنەوە گەر تۆ دەنگ نەدەیت کەواتە کورد نیت، کەئەمەش مافی هاوڵاتیبوونی دەخاتە بەردەم مەترسی لەگەڵمدای هاوڵاتیت لەگەڵمدانیت بێبەریت لەهاوڵاتیبوون!!. هاوڵاتیبوون بەگشتیدەکرێت لەژێر تەنها دەنگدان و دەنگنەدان.یاخود باسکردنی ئەم مەسەلانە (کەرکوك و فیدارلیەت و عەلمانیەت) هەموویان بەگشتی باسدەکرێن. بەبێ چوونە نێو ووردەکاریەکانیەوە. تاوەکو ئێستا دەستەواژەی جیاکردنەوەی ئاین لەدەوڵەت باس ناکرێت، کەجەوهەری زۆرانبازی مەسەلەی بیناکردنەوەی دەوڵەتی ئێراقی دەبێت لەداهاتوودا. گەر ئەو مەسەلەیە باس بکرێت بەلاوەکیەوە باسدەکرێت، مەسەلەی کەرکوك و شێوازی فیدارلیەت و حوکم باس ناکرێت، باس لە دابەشکردنی سامان ناکرێت کەگرنگترین مەسەلەیە بۆ دیاریکردنی پەیوەندی دەسەلاتی کوردی بەمەرکەزەوە،بەو سیفەتەی لەسەدا حەفتا زیاتری نەوتی ئێراق لەکوردستانە. زۆربەی مەسەلە گرنگ و هەستیارەکان بەگشتگیری باسدەکرێت ، بۆ هیچ نا، تەنها بۆ ئەوەی بوارێك بمێنێتەوە بۆ سازش و گونجاندنی پلاستیکی.

مەسەلەی داپێدانان بەدیموکراسی و عەلمانیەت لەسەر دیکۆمێنتێك دەبوایە پێش هەڵبژاردن ئیمزای لەسەر بکرایە وەك مەرجێکی پێشینەی چوونە نێو گەمەی هەڵبژاردن و دیموکراسیەوە،، نەك ئیمزاکردن لەسەر یاسایەکی کاتی کەهەر خۆیان دوای ئیمزا پاشگەزبوونەوە لێی بەحوکمی ئەوەی کاتیە. ئیمزاکردن لەسەر دیکۆمێنتێکی جێگیر وئاشکرا وەك بەشێك لەدانپێدانانی هەمووان بە پرۆسەی دیموکراسی و دانانپێدانان بە کۆمەڵگەی مەدەنی و لەسەر بنچینەی جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەت، مەرجێك دەبوو بۆ ڕێگەگرتن لەو هێزانەی شورا لەدیموکراسیەت بەباشتر دەزانن. ئەمانە هەمووی وەك بەشێك بۆ خوڵقاندنی کەشوهەوایەکی کولتوری دیموکراسی کارێکی گرنگ دەبوو. دەبوایە بەسەراحەت و بێپەردە بگوترایەو خەباتی ئاشکرا،(نەك شەرمن) ی بۆبکرایە. دەبوایە وەك مەرجی یەکەمی دیموکراسیەت هەموو ئەمانە یەکلابکرابێتەوە و لەکوردستان و ئێراقدا بەهەموو هێزەکان ئیمزابکرایە ، دەبوایە ئەوە بکرایە و باسبکرایە و هێڵەگشتیەکانی ڕوونبکرایەتەوە. نەك بەخشینی کورسی پێشوەخت بە

ئیسلامی شیعەکان و مەسەلەی دیموکراسیەتیش دوا بخرێت بۆ دەستورەکاتی و یاساکاتیەکانی داهاتوو..

ئێستاش دوای ئەزمونی پەنجا و پەنجا و شەڕی ناوخۆ ، دەبێت ئەو پرسیارە بکەین : ئایا دووحزبە سەرەکیە خاوەن یادەورەی سیاسین و ئەزمونی پەنجا بە پەنجایان تەجاوەزکردووە؟ ئایا بەهەقەت بەشێك بۆمن و بەشێك بۆتۆ (المحاێیە) و خاترخوایانە و مەحسوبیەتی بڕیاردان بە (توافق) و ڕێکەوتنی برایانە ، درێژکردنەوەی ئەو ئەزمونە تاڵە نیە؟، بەشێوەیەکی دیکە بڵێم ڕێڕەوکردنی یاری دەسەڵات و بڕیاردان نیە لەسەر هەمان نموزەج لەسەرانسەری ئێراقدا؟..

ئەم پرسیارە بەکراوەیی بۆ خوێنەری ئازیز جێدێڵم..

# زانكۆ و شەڕی فیلە پەڕۆینەكان

ئەوانەی لەگەڵماندا دانیشتن، كۆمەڵێك مامۆستای زانكۆی سلێمانی بوون سالانێكی دوورودرێژ بوو لەتاراوگەوەمەنفای خۆیاندا و لێرەو لەم كومەڵگەیەدا و لە خۆرئاوادا درێژەیان بەخوێندن دابوو، بەو هیوایەی ڕۆژێك لەڕۆژان بتوانن خزمەت بە خوێندكاری كوردبكەن. هەروەها ئەوانی دیكەش كۆمەڵێ خوێندكاری زانكۆ بوون ، خەونیان بەوە دەدەی لەئاستێكی بالای تێگەیشتنی زانستیانەدا بن. بەلام ئەم خەونانە زۆر زوو بەر بەردی واقعێك كەوتبوو، تێدا كۆمەڵێك كێشەلەبەردەمیاندا قوت بوو بۆوە ، ئەم كێشانە هەر شتێك بن لەم دنیایەدا ، ئەوا لەجەوهەردا كێشەی زانكۆ و زانست نین، دەتوانم بڵێم كێشەی شەڕكردنە لەگەڵ فیلە پەڕۆینەكان.

ئەم فیلە پەڕۆینانە مەجازێكی ئەدەبی و یاریەكی زمانەوانی منن وەك چیرۆكنوسێك، هەوڵدانێكە بۆ پێناسەكردنی چەند فیگورێك كەلەكۆمەڵگەی ئێمەدا بوون بەواقیعێكی تاڵ و ڕۆژانە ژیاو . ئەم فیلە پەڕۆینانە ئاماژەیەكن بۆ ئامازەبۆكراوێك كە بەرهەمهاتووی دیاردەی گەندەڵی ئیداری وبیروكراتیەتێكی ڕەشن، ئەم فیلانە لەهەموو كون و كەلەبەرێكی ئەم دەڤەرە پرهەرایەدا هەن. لە نێوەندی سیاسیەوە بیگرە تاوەكو دەگاتە نێوەندی بەناو ڕۆشنبیری و لەهەمووشیان تراژیدتر لە نێوەندی زانكۆكانیشدا وەك فینۆمینێك ئاشكراو دیارن. من پیموایە ئەمانە فیلی گەورەن ، زل و زەبەلاحن، بەلام لەجەوهەردا پەڕۆینەن. لە پێچێكی بیروكراتیەتی كوردیدا بەرهەمهاتوون و ساڵ لەدوای ساڵ گەورەبوون ،بەلام گەر دژایەتیەكی ڕەوا و ئەقلانیان بكەیت ، هەستدەكەیت، توانای پلیشاندنەوەی مێشولەیەكیان نیە ، جچای تۆی مامۆستای جیدی و ڕۆشنبیری جیدی و هاولاتی جیدی و ڕاستەقینە.

ئەم فیلانە زۆرن، بەلام بائێمە باس لەفیلەكانی نێو زانكۆ بكەین و خوێنەر دەبێت بمبورێت كەلە لەئەنجامی گفتوگۆی نێوان من و كۆمەڵێك خوێندكار و مامۆستاكانی زانكۆوە ، تەنها باس لەفیلە پەڕۆینەكانی نێو ئەو نێوەندە دەكەم. دەشزانم فیلە پەڕۆینەكانی بوارەكانی دیكە زۆرن و لەهەژمار نایەن و هەندێكیشیان بۆ داهاتوو هەڵدەگرین، بەتایبەت فیلە پەڕۆینەكانی نێوەندی ڕۆشنبیریمان!.

سەرەتا مەحسوبیەت و وەرقەکاری و حزبایەتی و گەندەڵی بەگشتی یاری خۆی دەکات و ئەو فیلە پەڕۆینانە بەرهەمدێنن کە ئەمرۆ ڕێگرن لەبەردەم هەموو پرۆسەیەکی پێگەیشن و نەشونماکردنێکی زانستی لەنێو زانکۆکاندا، یەکێك لە مامۆستاکان گووتی : هەندێك جار موحازەرەکان بەشکردەکرێن ، بەشکردنەکانیش بە پێی کوتلەکانن، هەر کوتەلەیەی بڕێك موحازەرەی بەر کەوتووە، هەندێکیان تایبە تمەندێتی ئەوان نین . یەکێکی دیکە گووتی : ئەوەش گرنگ نیە، بەلام ئەم فیلانە تورەن و قبولکردنی ڕەخنەی زانستی لای ئەوان دەبێتە کێشەیەکی ئیداری و خوادەزانێ چیدی لێدەکەوێتەوە.. یەکێکی دیکە لەمامۆستاکان گووتی : توندوتیژی لەنێو مامۆستاکانیشدا لەفۆرمێکی تایبەتی ئیداری و زمانەوانیشدا بونێکی ترسناکی هەیە. لەقسەی ئەوانەوە و نمونەکانیانەوە گەیشتمە ئەو دەرئەنجامەی هێشتا ئەقلیەتێك هەیە کە بڕوای بە (تەمبێ کردن) هەیە ، ئەمەش ڕەنگدانەوەی هەیە بۆسەر پەیوەندی نێوان مامۆستاو ئیدارە و خوێندکار ، ئەوەشی لێیدەکەوێتەوە، سەرقاڵبوونی هەموانە بەکێشەی لاوەکی ئاوەهاوە ، کەدەبووایە کێشەکان زانستی و فیکری بن نەك لەو جۆرەی کەهەیە. ئەمانە هەمووی لە دڵسۆزیەوە دەگوترێ نەك هەوڵدانێکە بۆ تێکدان، فیلە پەڕۆینەکانی گەندەڵی هەموو توندوتیژیەکی وشە و ڕەخنە دەکەنە ململانێی ئیداری و یاسایی و گەر پێیانبکرێت بڕگەی یاسایت بۆ دەردەهێنن بۆ ئەوەی دادگا هیلاکتر بکات و پۆلیست دەکەن بەگژدا، ئەوانە کێشەکان وورد دەکەنەوە بۆسەر چەندەها کێشەی لاوەکی و دووری دەخەنەوە لەجەوهەری خۆی ، کە دەکرێت هەمان کێشە لە ئەنجامی گفتوگۆیەکی ئەقلانی چارەسەر بکرێت.

ئەو خوێندکارەی پارتەسیاسیەکەی هێناویەتی یاوەکو پارتی سیاسی پشتگیری دەکات. ئەو خوێندکارەیە پشێوی ڕۆحی و دەروونی لەلای مامۆستای زانکۆ دەخولقێنێ و ئەویش وەك هەموو مرۆڤێك توانای بەرهەمهێنانەوەی توندوتیژی هەیە مادامەکی ئەو بەرامبەر ئەو خوێندکارە دەسەلاتدارە دەبێتەوە کە کوتلە و موتلەی حزبەکان ناردویانن بۆ وەرگرتنی باکالۆریۆس و گەر دەرفەت هەبوو ماستەر و دکتۆرا. ئەو خوێندکارانە ئەو فیلە پەڕۆینانەن کە کوتلەچێتی و حزبایەتی بەرهەمی هێناون و فڕێیان داوەتە نێو نێوەندی زانکۆوە ، یەکەم بۆ هێورکردنەوەیان و دووهەمیش بۆ پێدانی ئیمتازێك. ئەمانە بەلایانەوە گرنگ نیە شتێك هەبێت پێی بلێن وزانست و

جەوهەری دنیابینی زانستیانە، نەخێر ، ئەمانە هاتوون بۆئەوەی بڕوانامەیەك وەرگرن، بۆ ئەوەی بتوانن جارێکی دیکە بەهیمەتێکی دیکە بچنەوە نێو شەڕی کوتلەکان و پۆستێکی بالاتر وەرگرن. ئەمانە ئەو فیلە پەڕۆینانەن کە مامۆستای جیدی و هێزی زانستی دەخەنە بەردەم چەندەها کێشەی بچوك و بێماناوە. بەم شێوەیە خوێندکارانی ڕاستەقینەش هیچ پالپێوەنەرێکی زانستیان نامێنێت بۆ بەردەوامبوون.

لێرەوە دیاردەی توندو تیژی لەنێو زانکۆدا، دەبێتە دیاردەیەکی زەق و ئاشکرا و کێشەبەندیەکی ئالۆز، تەنها تایبەت نابێت بە مامۆستایەکی بیروکراتەوە، بەڵکو تایبەتە بەکاراکتەری خوێندکاری زانکۆ و ئاستی تێگەیشتنیەوە، بەم شێوەیە ئێمە لەبەردەم توندوتیژیەکداین کە هەر مامۆستا لێی بەرپرسیارنیە، بەڵکو خوێندکاریش، ئەوەی هەردووکیشیان گرێدەدا، بیروکراتیەت و کەش و هەوای سیاسی و ئیداری گشتیە لەم کۆمەڵگەیەدا. لە پاڵ ئەمەشدا هێزێك هەیە پێت دەڵێت : تۆ معاشی خۆت وەربگرە و واز لەم سەرئێشەیە بێنە.. مامۆستایەك هەیە تابینەقاقای تورەییە، هەندێکیان لەبەر هۆکارانەی باسمکردن و بەدیوێکی دیکەدا هەندێکیان تورەن نەك لەبەر ئەوەی ناعەدالەتی سوستێمی خوێندن و کەش وهەوای سیاسی بێزاری کردوون، بە پێچەوانەوە، لەبەر ئەوەیە کە تواناکانینان دیاریکراوەو توانای زۆرانبازی فیکری وزانستیان نیە و پەنادەبەنە بەر بیروکراتیەت و کوتلەی حزبی و دەسەلاتیش بەداخەوە بۆ شەڕەکانی خۆی کەسانی ئاوەهای پێویستە.

لەم شیکردنەوە سانایانەوە دەگەینە بەرامبەر دیاردەیەکی ترسناك،من ناوی دەنێم (پەڕپوتکردنی جەوهەری شتەکان ) ، ئەمەیش مانای لێسەندنەوەی هەموو جەوهەرێکە لەزانست و کاری ڕاستەقینە، لەسەر دوو ئاست ئەم پرۆسێسە ترسناکە هەڵدەسوڕێت ، ئاستێکیان (زۆرو بۆرکردنی) هەموو شتێکە و ئاستێکی دیکەیان (ئاسانکردنی) هەموو شتێکە!!، لەزانستەوە بیگرە تاوەکو کارکردن لەهەموو بوارەکاندا.

لەم دەقەرەی ئێمەدا ژمارەی زانکۆ ئەوەندە زۆرن کەمرۆڤ دەگەیەنێتە سەر ئاستی سەرسامبوون، لەدایکبوونی زانکۆکان لەبەر خاتری ناوچەکانە، نەك پێداویستی زانستی و بەرهەمهێنان، ئەمە جگەلەوەی بڕیاری سیاسی دامەزرێنەری زانکۆکانە. بەشێکی دیکەی کێشەکە ئەوەیە کەئاسانکاریەك دەکرێت بۆ هەموو کارێك و مەحسوبیەتێکی ترسناك پەیرەو دەکرێت، بەڕادەیەك مامۆستای زانکۆی ڕاستەقینە

گەمارۆداوە و خوێندکاری ڕاستەقینەشی تووشی پشێوی کردووە. ئەمە جگە لەوەی من باس لەجەوهەری ئەو تایبەتمەندیانەو پرۆگرام و شێوازی وانەگوتنەوانە ناکەم، کەزۆریان بابەتی بەسەرچوون و گۆڕانکاریان بەسەردا نەهاتووە. لەم پێچە سەختانەدا توندوتیژی بەرهەمدێت، مادامەکی زانکۆ بۆتە شانۆیەك بۆ وەرگرتنی بڕوانامە لەسەر لیستی زانست و فاتورەی زانستی، مادامەکی گەندەڵی ئیداری و حیزب بەهەموو هێزێکەوە لە تەشکیلەی ئیداریەوە بیگرە تاوەکو دامەزراندن و هێزدان بەکوڕی فلان وفیسار و پشت ئەستوری بەپلەی حیزبی ، پرۆسەی خوێندن ئیفلیجدەکات ، مامۆستای زانکۆ سنوردار دەکات لە مومارەسەکردنی دەسەڵاتە زانستی و پەروەردەیەکانی. ئەمانە و زۆری دیکە ئەو فیگورە ناشرینە بەرهەمدێنن کەمن لەسەرەتای نوسینەکەمدا بەفیلی پەڕۆینە ناوزەدمکردن. لەم خاڵە قورسانەوە توندوتیژی خۆی لەهەستیارترین و گرنگترین دەزگای ئەم کۆمەڵگەیەی ئێمەبەرهەدێنێت کە زانکۆیە.

ئەمانەی سەرەوە مشتێکن لە نمونەی خەرواریکی گەورەو گران، بەداخەوە بۆتە کاراکتەر وسیفەتی نێوەندی زانکۆ زۆر و بۆرەکانی ئێمە، ئەو پرسیارەی کەدەیکەین ئەوەیە : ئەم بارودۆخە تاوەکو کەی توانای بەردەوامی دەبێت؟ کەی فیلە پەڕۆینەکان واز لەزانکۆ دەهێنن بۆ ئەوەی سەرقاڵ بێت بە کێشە زانستیەکانی ، نەك کێشەکوتلەگەری و بیروکراتیەکانی ؟ سەیر نیە لام زانکۆیەك بەبڕیارێکی سیاسی دامەزرێت و بەئاسانیش هەڵوەشێتەوەو تێکەڵ بەزانکۆیەکی دیکە بکرێت!، سەیر نیە کاتێك دەرچوویەکی زانکۆی ئێمە زۆر بەخۆشحاڵیەوە پۆلیسی پێ باشتر بێت ، من لەو بڕوایەدا نیم گەر دەرچووی زانکۆیەك بەهەقەت بڕوای بە بڕوانامە و تایبەتمەندێتی خۆی هەبێت . بچێتە بوارێکی دیکە کەپێویستی بەبڕوانامە نەبێت. باپارەی زیاتریش وەربگرێت، ئەمە عەبەسیترین هەڵبژاردنە گەر پێکەنینهێنەر نەبێت.

ئەو مامۆستایانەی کەهاتوونەتەوە و دەیانەوێت خزمەت بکەن و پەیامێکی زانستیان پێیە، لەگەڵ ئەو مامۆستایانەی لەم وڵاتەدا لەزەمەنی گەمارۆ و نەهامەتیدا خزمەتیان کردووە، هەردووگروپەکە پێکەوە یەك پەیام کۆیان دەکاتەوە ، ئەویش خزمەتکردنی زانست و پێگەیاندنی خوێندکارێکی جیدیە ، کەلەداهاتوودا ئەم کۆمەڵگەیە لەم هەموو خوار وخێچیە قوتاربکات، بەداخەوە هەر دوو گروپەکە بەر

دیواری ڤیلە پەڕۆینەکان دەکەون، ئەو ڤیلانەی نێوخانیان پڕێتی لەلۆکەی پیسی بیروکراتیەت و خەمێك بۆ دەستبەسەراگرتن و لوژدانی هەموو تەڕو وشکێك..
ماموستاکان گووتیان و خوێندکارە ڕاستەقینەکان گووتیان و منیش گووتم و هەمووان دەڵێن و لەدوایشدا گڕ گڕ دەچینەوە بەردەم ئەو ڤیلە پەڕۆینانەی گەندەڵی و زۆرو بۆری و ئاسانکردن و پەڕپوتکردن بەرهەمی هێناون .. وەکو هەموو مرۆڤێك کەسروشتێکی لاوازی هەیە و حەزێکی هەیە بۆ هەڵهاتن و لەبیرکردن و فەرامۆشکردنی هەموو شتێك.
ویستم هەڵبێم بۆ ناشوێنێك ئەو ڤیلە پەڕۆینە ناشرینانەو چیرۆکەکانیان نەبیستم.
کەسواری تاکسیەکە بووم شۆفیرەکە باسی ڤیلە پەڕۆینەکانی بواری کارەکەی خۆی بۆکردم ، لەڕەنگی دیکە و لە جۆری دیکە، ویستم خۆم لەتاکسیەکە فڕێبدەمە خوارەوە ، هەڵوێستەیەکم کردو و بیرم لەوە کردووە کەمن نەگبەتم و لەوانەیە لەخەستەخانەش ڤیلە پەڕۆینەیەکی دیکە،کەهەموو شتێکی لەلا ڕەوایە وهەرگیز جیدی نیەلەژیانیدا، مقەستێکی هەڵە لە ورگمدا جێبهێڵێت یاوەکو لەوانەیە لەژێر بەنجدا بمرم، پەشیمان بوومەوە لەو بیرۆکەی خۆ فڕێدانەو پێش ئەوەی بەتەواوەتی دابەزم و هێشتا قاچێکم لەنێو تاکسیەکەدا بوو بە شۆفێرەکەم گۆت: ئەزانی چی برادەر ئەوانە ڤیلی پەڕۆن ، پەڕۆ و هیچی دیکە...لەوساتەوە بیر لەوە دەکەمەوە گەر ئێمە ئێمە دژایەتیەکی ئەقلانی ئەم دیاردەیە نەکەین ، ئەوا پێگەیشتنی کۆمەڵگە وبزوتنەوەی کۆمەڵ زامنی ڕزین و بۆگەن بوونیانە ،بەڵام ئەوسا بۆگەنیان ئەوەش ژەهراوی دەکات کەلەم کۆمەڵگەیەدا بەسەوزیی ماوەتەوە..

# نەوەکان و گەڕەلاوژەکانیان

١

کاتێك گەڕەلاوژە و پێکادان و توندوتیژی سەرجادەکان دەستپێدەکات، ساتێك لەساتەکانی سوستمێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی درزی تێدەکەوێت. بیرۆکەیەکی چەسپاوی چەند ساڵە و بیروڕاجێگیرەکان دەلەرزێن و پرسی مۆراڵ و ئەخلاقیاتی جێگیر دەکەونە ژێر سێبەرەکانی بەدگومانیەوە، لەگەڵێشیدا ئەو پرسیارە دێتەکایەوە : بۆچی ئەمانە ڕوودەدا ؟، هەڵە لەکوێدایە و درزتێبوونەکان لەچ زەویەکی فشەڵ خۆی درێژ کردۆتەوە؟، تاچەندە ئەم گەڕەلاوژانە توانای بەردەوامیان هەیە؟ دەشێت ئەمانە نوێنەری نەوەیەکی نوێ بن بە جیهانبینیەکی تازەوە؟! یاخود تەنها گردبوونەوەیەکی نارەزایی کاتین؟!، ئایا ئەم گەڕەلاوژانە مانای ئەوەیە کەسوستم کۆنینە و پەڕپوت و پیرە و نەوە نوێکان و شۆرشۆچکە نوێیەکان و داواکاریە نوێیەکان زەنگی لەناوچوونی کۆنەخوازیەکی دەسەلاتێکی سیاسی و کۆمەلایەتیە؟، یاخود هەژەیی و هەڵچوونی چەند داواکاریەکی ڕۆژانە ژیانی کۆمەلایەتین و لە پشتیانەوە هیچ بیرۆکەیەك گەشە ناکات؟!! .. ئەمانە و زۆر پرسیاری دیکە، پرسیاری دەسەلات و لەهەمانکاتیشدا پرسیاری ڕۆشنبیرانی چالاك دەبێت.

٢

ڕووداوەکانی ئەم ماوەیەی گێتۆ و قەراغ شارەکانی پاریس ، کەلە سەرتای نۆڤێمبەری ٢٠٠٥ دا گەیشتە ئاستی پێکدادن لەنێوان لاوانی ئەو گەڕەکانەوە و پۆلیسی فەرەنسی و تەنیەوە بۆ شارەکانی دیکەی دەوروبەری پاریس، زۆر سەرسامبوون و سەرسوڕمانی هێنایە سەر ئاستی دیار و لە نادیارەوە کردی بە دیاردەیەکی زەق و قوتبۆوە لەبەردەم حکومەتی فەرەنسی و کۆمەڵگەی فەرەنسایی بەتایبەتی و ئەوروپاش بەگشتی. سوتاندنی ئۆتۆمبێلەکان لە گەڕەکە داخراوەکان کەدەتوانین بە (گێتۆ) ناویان بێنین، نەك هەر تەنها کردەیەکی توند وتیژی کۆمەڵێك گەنج و هەرزە نەبوو لەدەربڕینی بێزاری و نارەزاییان بەرامبەر سیاسەتی (کۆچبەری و ئاوێتەبوون )ی چەندەها ساڵەی حکومەتە یەك لەدوا یەکەکانی فەرەنسا، بەڵکو خۆی لەخۆیدا چەندەها دووری دیکەی هاروژاوی هەبوو. ئەم لەکاتێکدایە، کەس ناتوانێت باوا بە لێکدانەوەکانی وەزیری ناوخۆی فەرەنسا (سارکوزی) بکات، بەوەی کەئەم گەڕەلاوژە و

ئاژاوەیە تەنها ڕەهەندێکی تاوانبارییانە و لێکدانەوەیەکی ئاسایش خوازیانە هەڵدەگرێ و هیچ ڕەهەندێکی دیکەی مێژوویی و زۆرانبازی کۆمەلایەتی لەپشتەوە نیە...

هەروەك چۆن گەر ئەم ڕووداوانە پابەند بکەینەوە بە کۆمەڵگەی کوردیمانەوە، ناتوانین قەناعەت بەدەسەلاتی کوردی بکەین، کە لە مانگرتنی خوێندکارانی زانکۆی سلێمانیەوە بیگرە تاوەکو دەگاتەمانگرتنە توندوتیژەکەی کەلار و لەوێوە بۆ سوتاندنی بەنزیخانەکانی ئاگرێ و لەولاشەوە سەرهەڵدانی گروپەی دژ بەگەندەڵی لە سلێمانی و بزوتنەوەی تارمایی لەهەولێر ...هتد، کەئەم فینۆمینانە تەنها گەرەلاوژەن و دەستی تاوانبارانی یاریان تێدا کردووە و گەرەلاوژەکان خاوەنی هیچ سەرچاوەیەکی کۆمەلایەتی و سیاسی تایبەت بەخۆ نین..

ئەم دووبارنەیەی گەرەلاوژە سیاسی و کۆمەلایەتیانە لە فەرەنساو کوردستان، چەندە لەڕووی شوێنەوە دوورن لەیەکتری، ئەوەندەش لەڕووی زەمەنی ناوەکیەوە جیاوازن، سەرەڕای تایبەتمەندی هەریەکێکیان لەڕووی کولتوریەوە و خاڵ جیاوازیان، لەزۆر ڕووەوە، زەمەنەکان لەچەند خاڵێك یەکتری دەگرنەوە، ئەویش نەوەکان و گەرەلاوژەکانیانە، داواکاری و شۆرشۆچکەکانیانە...

لەم گوتارە کورتەدا هەوڵدەدەین ئەو خاڵانەگیری و پێکەوەیە زەمەنیەی گەرەلاوژەمێژوویەکان دیاریبکەین و پابەندی بکەینەوە بەپرسی نەوە نوێیەکان و گەرانیان بەدووی شوناس و جەوهەری بونگەرایاندا..

٣

چەمکی (شۆڕشۆچکە / ڕیڤۆڵتە Revolte) مانای دژایەتی و دژەوەستانەوەی گروپێکی دیاری کراوی کۆمەلایەتیە لە پێناو بەدیهێنانی ئامانجێکی تایبەتدا، لەپێناو بەدیهێنانی دەستەکەوتەکاندا کە لەگەڵ دەستکەوتنی کۆتایی پێدێت. بەپێچەوانەی شۆرشەوەیە کە ڕەهەندرکی فراوان و درێژخایەنی هەیە، شۆڕشۆچکە لە زەمەنێکی دیاریکراو و لەچوارچێوەیەکی دیاریکراودا چالاکە و لەگەڵ بەدیهاتنی زۆر لەو داواکاریانە کۆتایی پێدێت. دەشێت لەڕووی تیۆریەوە شۆڕشۆچکەکان زۆربیروڕای سیاسی وفەلسەفی نوێ چەکەر پێبکەن و زۆر بیروڕاو قەناعەتی دێرینیش بگۆڕن و بیلەرزێنن، دەشێت زۆر جیهانبینی نوێ و تێڕوانینی نوێ بهێنێتە ئاراوە. ئەز لەوبڕوایەدانیم کە(شۆڕشۆچکەکان) بەئاسانی بە ژیانی کۆمەلگەکاندا تێپەڕن وهیچ گۆڕانکاریەکی ڕۆحی و کۆمەلایەتی، گەر ڕێژەیش بێت، نەهێنە ئاراوە. هیچ مۆدەیەکی جلی تازە و تایبێکی نوێی هەڵس و کەوت و موسیقا و مۆدە و هەڵس و کەوتی کۆمەلایەتی لەگەڵ خۆیدا نەهێنێتە ناوەوە. مێژووی شۆڕشۆچکەکان و کرۆنۆلۆژیان و یەك بەدواهاتنی ڕووداوەکان و جۆری ئەو داواکاری و ئیدۆلەکانیان (ڕەمز و بیروڕا و ڕەنگەکانیان)،

پێکهاتەی ئەو شۆڕشۆچکە و گەیشتنیان بە ئامانجەکانیان دیاری دەکەن. لێرەوە دەبێت ئێمە بگەڕێینەوە بۆ سەرە دوای (شۆڕشۆچکە) و بزانین لە کوێوە دەستپێدەکات، لەکوێ ژێی مەترسیداری خۆی وازی دەکات، لەکوێدا هاوار دەکات، دەلەرزێت و شەپۆلێکی هێمن پێکدێنێت، بەلاّم ترسناك بۆ دەسەلاّتی هەبوو، شەپۆلەکان ڕایچی گێرمە و کێشەی خۆی دەکات..ئەو سەرە داوە دەمباتەوە سەر ئەو شوێن و زەمەنەی کە (گەڕەلاوژە) ی تێدا ڕوودەدات، کاتێك لە ڕووداوێکی بچوکەوە ، کێشە هەڵپەسێردراوەکان دەگەنە ئاستی دارمان و گەڕەلاوژە!، ئیدی زەمەنی گەڕەلاوژە دەستپێدەکات و دووریەکی توندوتیژانە لەخۆی دەگرێت و دەگاتە ئاستی پێکدادان لەگەڵ پۆلیس و ئاسایش و دەزگاکانی حکومەتەکان و چیدی زەمەن، زەمەنی ڕۆژانە ژیانی کۆمەڵگە نامێنێ، بەقەد هێندەی زەمەنی گەڕەلاوژە دەبێتە زەمەنی بالاّدەست و ژیاوی کۆمەڵگە، دەبێتە زەمەنێك هەموو ڕووداوەکانی دیکە لەنێو خۆیدا دەتوێنێتەوە.

(گەڕەلاوژە ) هەر لەخۆڕا پێك نایەت و بێ مێژووگەرا ناگرێت، خاوەنی مێژووی خۆی و زەمەنی خۆیەتی و تەقینەوەکانی خۆیەتی لە ساتەوەختێکی دیاریکراودا، دەرهاویشتەی ئەو کێشە چارەسەنەکراو و هەڵپەسێردراوانەیە، کە (هۆشمەندی کۆمەلایەتی) زەمەنێکە لەیادەوەرەی دووری خۆیدا هەڵیدەگرێ و ئیدی بەردێکی بچوك بەسە بۆ ئەوەی ئەو شێرە نوستووە برسیانە بهاروژێنێت و ئەوانیش زەمەنەی دڕەندەیی خۆیان بنوسنەوە، (ئیدواردۆ گالیانۆ) ی نوسەر و ڕۆماننوسی ئۆرگوایی دەڵێت: تاوەکو ئەو ساتەی شێرەکان دەست دەکەن بەنوسینەوەی مێژووی خۆیان، مێژوو هەر مێژووی ڕاوچیەکان دەبێت ...

Eduardo Galeano: Das Buch der Umarmungen. Hammer Verlag ١٩٩١.

ئیدی ئەم بەردە سەرەتای گۆمی مێژووی ڕاوچیەکان دەخاتە شەپۆل و شڵەقانەوە، ئەو بەردە سەرەتای ئەو گەڕەلاوژانەیە کە لەنەڕە و بێزاریەوە دەست پێدەکات، بەلاّم ئایا شێرەکان مێژووی خۆیان دەنوسنەوە ، یاخود تەنها نەعرەتەن لەهەوادا و دواجار گەڕانەوەیە بۆ ژێر سێبەری درەختە پیرەکان ؟!..

گەڕەلاوژەکان ئەو هاروژاندانە دەجوڵێننەوە کە سەرجەم کولتوری کۆمەڵگە دەخاتە بەردەم پرسیاری گرنگ و مێژوویی، چەندە لەڕووی زەمەنی هەڵچوون و سۆزداریەوە کورت و سەر توێژکەوتووە، ئەوەندە پاشماوە و ئاسەوارەکانی بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ کاریگەری خۆیان درێژ دەکەنەوە، بەلاّم ئەوەی پێویستە لێرەدا هەڵوێستەی لەسەر بکەین ئەوەیە، کەهەموو هەراو گەڕەلاوژەیەك و ناپاساغیەك و کۆبوونەوەیەك لەم گوتارەمدا بە (گەڕەلاوژە) لەقەڵەم نادەم، بەڵکو مەبەستم لەگەڕەلاوژە: ئەو چالاکیە نارەزایی دەربڕینەیە کەهەوڵدەدات کێشەکان بخاتە سەر ئاستی جوڵە و هەوڵبدات فۆرمێکی داواکاری لەخۆبگرن و خاوەنی مێژوویەکی خۆیان بن. ئیدی ئەم داواکاریە لەشێوەی

ریفۆرم و چاکسازی یاوەکو نارەزایی و لابردن و گۆرینی ریشەیی زۆر بارودۆخی کۆمەلایەتی و یاساییدا بێت، یاخود لەدوای خۆی تیۆرەی سیاسی و روانینی کۆمەلایەتی و فەلسەفی نویٚ بهێنێتە ئاراوە. هەموو ئەم جۆرە گەرەلاوژانە بەرای من مێژووین، چونکە لێرە و لەویٚ و بەنەرمی پەیدا دەبن و لەدواجاردا رێگەخۆشکەرن بۆ هۆشمەندیەکی نویٚ و بیرۆکەو جولەیەك ، تەنانەت بۆ شۆرشێکی نوێش ، یاوەکو زۆر جاران دەسەلاتێکی تایبەتی سیاسی و فیکری دەخەنە گومانەوە و قوون گەرمی ئەو ئایدۆلۆژیە و بالادەستیەی دەخەنە بەردەم پرسیاری سەختی لەوەوپێش نەکراو. بەمانای، هێلە جیاکەرەوەکان و هێلەجیاوازەکان کەمن لەم گوتارەمدا بە (هێلە گەرمەکان) ناویان دەبەم، هێلی جیاکارەوە و گەرمن لەنێوان توندوتیژیەکی بیٚ سەروبەری بەرژەوەندخوازی گروپەیەکی سیاسی لەکاتی هەلبژاردندا یاخود بۆ مەبەستێك پێی هەلدەستێت و لەنێوان ئەو گەرەلاوژانەی لەقولایی زامێکی دێرینە و کێشەیەکی قولی سیاسی و کۆمەلایەتیەوە دەتەقنەوە. بەجۆرێکی دیکە دەتوانم بلێم، هێلە گەرمەکانیش ئەو هێلە سوورانەن کەسەرەتا بە کالی دەکێشرێن و لەدوایشدا دەبنە هێلی جیاکەرەوەی (نەوەکان) و (بیروراکان) لەیەکتری ، هێلە گەرمەکان ئەدەبیاتێکی تازەی کولتوریی هەنووکەیی مرۆڤەکانن لە بەردەم کێشە گرنگە مرۆییەکانیان، بوونێکی تازەی ئیندڤیدوالی (کەسی وتایبەت) نوێن لە فۆرمی گردبوونەوەیەکی هاوبەشی کۆمەلێدا، لە پێناو بەرهەمهێنانی پرۆدۆکت و بەرهەمێکی نوێی کولتوری وسیاسی کۆمەلگە، هێلە گەرمەکان سەرەتای هۆشمەندیەکی نوێی و فریش و تازەن و خۆیان لەبەردەم ئەزمونەکانیاندا هەلاوێردە و جیاکار و کێشەبەند و ئەزمونەگەر دەکەنەوە، تازەبوونەوەیەکەی جەستەی کۆمەلگەن لەبەردەم گەردوونێکی دیکە، کەلەگەلٚ کەش وهەوای نوێیی گلۆبالٚ و جیهانگیری سەردەمدا بگونجێت. هێلەگەرمەکان ئەو سنورانە جیادەکەنەوە، کە دەسەلاتی چەسپیوو و پیر بەری دەکەوێت و بیرورا چەسپاوەکان و مۆرالی باو و کۆنزەرڤاتیف دەخاتە بەردەم ئەگەری لەق بوون و پێداچوونەوە.

٤

ئەوەی ئەم (هێلە گەرمانە) دەکێشێت، گەرەلاوژەکانن، کۆمەلەیەکن، گردبوونەوەیەکی نارەزایخوازیانەی مرۆڤەکانن کەکێشەیەکی کۆمەلایەتی و سیاسی وئابووری ومێژوویی کۆیاندەکاتەوە، ئەو کێشانەن لەژێر پێستی کۆمەلگەدا هەلدەتۆقن و لێرە و لەویٚ جەستەی کۆمەلگە دەخەنە بەردەم نەخۆشی و تێکچوونی رۆتینی رۆژانەژیانی، ئەگەر هاتوو سوستێمی کۆمەلایەتی ودلامی گونجاوی نەبێت و ئەقلانیگەریانە فریای خۆی نەکەوێت ، ئەوا هێلە گەرمەکان کە خولقێنەری

(گەڕەلاوژەکان) و مەرجی سەختی (مێژوویی بوونی ) ئەو گەڕەلاوژەکانن ، کۆمەڵگە و دەسەڵات بەتایبەت، دەخەنە بەردەم گومان و توندوتیژییەوە.

ئەوەی لە (گەڕەلاوژەکانی فەرەنسا) دا خۆی کۆرپەیی کرد، تەنها سوتاندنی هەزارەها ئۆتۆمبێل نەبوو ، تەنها زەرەدی میلۆنەها ئۆیرۆ نەبوو، بەڵکو دەمامك لابردن بوو لەسەر کێشەی ڕاسیست و ڕەگەزپەرستی و کۆچبەری کە ڕەگەکانی دەگەڕێتەوە بۆ زەمەنی کۆلۆنیال، نەك هەرئەوەندە بەڵکو لەڕووی فیکریشەوە دەتوانرێت باس لە درێژە پێدانی کۆلۆنیال و ئەقلیەتی کۆلۆنیالی بکرێت لە فەرەنسادا، دەتوانرێت کێشەکە وەکو (دۆمینیك ڤیدال ) لە مانگەنامەی (لۆمۆند) نوسیویەتی : ئەم ڕووداوانە ئەو شەوق و ڕۆشنایەی نەدەبوو، ئەگەر هاتوو ئەم خاڵە سوتێنەرە کۆمەلایەتیانە ، پێکدادانی سێ قەیران نەبوونایە و بەریەکتری نەکەوتنایە: قەیرانی کۆمەلایەتی، قەیرانی نوێنەرایەتی سیاسی و قەیرانی پۆست کۆلۆنیالی .. ئەم سێ قەیرانەی دۆمینیك ڤیدال باسی لێوەکردووە، سێ خاڵی گرنگی مێژووی و سیاسی و کۆمەلایەتین و پشتەوێنەی گەڕەلاوژەکانی ئەم دوایەی فەرەنسان .

Le Monde diplomatique. Dezmber ٢٠٠٥.
Deutsche Ausgabe.

دیارە زۆر لە نوێنەری ئەو ناوچە جیاوازانەی پاریس باسیان لەم قەیرانانە کردووە، ڕەخنەیان لە حکومەتە یەك بەدوایەك هاتووەکانی فەرەنسا گرتووە ، بەوەی هێشتا بەچاوی میللەتی ژێر دەستەوە سەیری مەغریبی وجەزائیری و ئەفریقایی نێو فەرەنسا دەکەن، لەگەڵ ئەوەی کە دوونەوە لەم وڵاتەدا تێپەڕ بوون و بەرەگەزنامە فەرەنسین، کەچی هێشتا لە گەڕەکە تایبەتەکانی پاریس، لەسەر شێوازی گیتۆ و لە (گیتۆکاندا) دەژین!. حکومەت و بەڕێوبەرایەتیە حکومیەکان بەچاوی هاولاتی ژمارە دوو سەیریان دەکەن و مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەن. ئەم ئەقلیەتە کۆلـۆنیالیە زیاتر لەنەوەی دووهەمی کۆچبەراندا زیاتر ڕۆدەچێت و چیدی نەوەی دووهەم نایەوێت وەکو کۆچبەرێکی هاتوو مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت ، ئەو لە پاریس لەدایکبووە، منداڵی بەسەر بردووە و دەیەوێت مافەکانی خۆی دوور لەزەمەنی کۆلۆنیال پراکتیزەبکات، دەیەوێت کۆتایی بهێنێت بەو زەمەنە. ئەمانە و زۆر کێشەی دیکە بەدرێژایی چل ساڵ زیاتر دەبێت کەڵەکە بووە و ئیدی لەڕووداوێکی بچوکی پێکدادانی پۆلیس و چەند گەنجێکدا، کێشەکە تەقیەوە ، کار گەشتە ئەو ڕادەیەی ئێواران لە وبەشانەی پاریس قەدەغەی هاتوچۆ و هاتنە دەرەوە ڕابگەیەنێت، حکومەت هانا بەرێتە بەر سوپا ... گەڕەلاوژەکان ئێستا کۆتاییان هاتووە ، بەلام قەتماغەی ئەو برینەیان هەڵدایەوە کەکۆلۆنیال و زەمەنی داگیرکردن و سیاسەتی پۆست کۆلۆنیال و پاشماوەکانی، لەرێگەی چەند پارتێکی سیاسی و بەڕێوبەرایەتیەوە مومارەسەی دەکرا ، بووە هۆی بەریەکەوتن و کێشە وململانێی و گەڕەلاوژە .

بەدیویکی دیکەدا ئەم گەڕەلاوژانە، ئەو کێشەبەندیە گرنگەی هێنایە سەر ئاستی گفتوگۆ ،بەوەی، بۆچی ئەم مێژووە دوورودرێژە لە شۆڕشی پیشەسازیەوە بیگرە تاوەکو شۆڕشی فەرەنسی و پرنسیپەکانی ڕۆشنگەری و پاشان مۆدێرنە، نەیتوانیوە چەمکی تۆلەرانس (لێبوردن) و (پێکەوەژیان) لە هۆشمەندی کۆیی ئەوروپایدا جێگیربکات؟. بۆچی هێشتا زەمەنی کۆلۆنیال و (ڕەگەزپەرستی شاراوە و ناڕاستەوخۆ) هێشتا پشتەوێنەیەکی ناشرینی زۆر مومارەسەی بیروکراتیانەی سەرجەم ئەوروپان لەبەرامبەر (ئەوی دیکەی بێگانە)، کاریگەری ئەم مێژووە دوورودرێژانەی (ڕۆشنگەری) بۆچی تەنها لەخولگەیەکی ئەوروپایی یاخود ناسیونالی ئەوروپایی مومارەسەدەکرێت و لەدەرەوەی ئەم نێوەندانەدا هەموو ئەوانی دیکە بەر سیاسەتی فەرامۆش کردن دەکەون؟!. ئەم ئەقلیەتە چۆن درێژە بەخۆی دەدات و خاڵەقورسەکانی بەردەوامبوونی لەکوێدان و لەهەمان کاتیشدا کەلێنەکانی بیروڕاکان و ڕۆشنبیران بەگشتی لەکوێدان و کاریگەریان لەسەر کۆمەڵگە لەچ شوێنێکدا لاوازە و درزتێبووە، هۆکارەکانی چین و درزتێبوونەکان تاوەکو کوێ درێژ دەبنەوە؟!... ئەمە و زۆر لەبیرکردنەوەی دیکە گەڕەلاوژەکانی ئەم دوایەی فەرەنسا هاورژاندی و لەسەر ئاستی کولتوری سیاسەتیش پرسیاری دیکە سەرهەڵدەدات و بەردەوامی هەیە...

کەواتە بەڕێزان ئایا دەکرێت ئەم جۆرە (گەڕەلاوژانە) ئاوەها بەئاسانی تێپەڕبێت؟، دەکرێت ئێمە بڵێین کەئەوە (هێڵەگەرمەکان) ی پێش و دوای گەڕەلاوژەکانن ئەم مێژووگەرایە و پێچەگۆڕانانە زامن دەکەن و بەردەوامی پێدەدەن.. لێرەوە و لەم تێزەوە دەتوانین ئاوڕێك لەخاڵێکی دیکە بدەینەوە و ناکرێت بەسەریدا تێپەڕین . ئەویش ڕۆڵی (نەوە نوێیەکانە) لە ئاست هەڵایساندنی (گەڕەلاوژەمێژوییەکاندا ) ، لەم تێزەوە جارێکی دیکە دەگەڕێینەوە بۆ سەر نەوەکان و کێشەکانیان..

٥

نەوکان کێن؟!، ئەو پرسیارە هەمیشە دەمانخاتە بەردەم کێشەبەندیەکی هیومانیەوە، بەوەی ئێمە زیاتر لەنەوەکاندا چوارچێوەیەکی بوونگەرایی بۆخۆمان دیاری دەکەین، چوارچێوەیەك بۆ ژیان و شوناسێك من لەوی نەوەیەکی دیکە جیابکاتەوە، نەوەکان چوارچێوەیەك دەدۆزنەوە بۆ ئەوەی تێدا دەرکەون، پەنجەرەیەك تێدا بتوانن خۆیانی تێدا دەربخەن و بڵێن: ئاها..ئەوە ئێمەین، نەوەیەکین خاوەن زەمەن و ڕەنگی خۆمانین، بەجیاوازی ژینی تایبەتمان، ئێمە لەم چوارچێوەیەدا خۆمان پێناسەدەکەین و دەتوانین ڕەنگێك بدەین بەخۆمان، مێژوویەکی تایبەتمان هەبێت لەم کۆمەڵگەیەدا کەئاسەوار و جێگە پەنجەی ئێمە بە ڕووداو و دروستبوونەوە و ڕوخانەکانەوە دیار بێت، هەموو زەمەنەکان وەکو یەك نین و ئێمە پاڵەوانی زەمەنیکی تایبەتین، یاخود دەبین بەپاڵەوانی زەمەنی خۆمان، زەمەنێك کە زەمەنی ئێمەیە دەم

وچاوێکی دیارین لەمێژوویەکی تایبەتدا.. نەوەکان ئەو چوارچێوە شوناسیەن کە هێڵێکی گەرم ڕادەکێشن و سەرەتای گەڕەلاوژەیەکن لەمێژووی کۆمەڵگەدا، ئەو گەڕەلاوژانە ئاوەها بەئاسانی بەژیانی کۆمەڵگەدا تێپەڕ نابن و زۆرجارانیش پێچێکی گەورەن لە مێژووی جیهاندا..

لەم وەسفە ڕۆمانتیکەیەی سەرەوە ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت، کەشوناس ونەوەکان و پێناسەیان لەچوارچێوەیەك و زەمەنێکی مێژوویی تایبەتدا، نەوەکان دەخاتە بەردەم پێناسەی جیاوازەوە، بەلاّم ئەوەی کەدەبێتە هەقیقەتێك ئەوەیە، کەئێمە خۆمان لەبەردەم نەوەیەکدا دەبینینەوە پەردەکانی خۆی بەتەنافی ژیانی کۆمەڵگەدا هەڵواسیوە و لەوێوەڕا شەڕی بوونگەرایی خۆی دەکات. نەوەی جەنگ ، نەوەی شەستەکان، نەوەی حەفتاکان، نەوەی دوای ڕاپەڕین، نەوەی ڕوانگە ، نەوە مارکسیستەکان، نەوەکانی شۆڕش و نەوەکانی بونگەرایی، سوریالزم و نەوەی شۆڕشی فەڕەنسی و هتد ... ئیدی لەهەموو کون و کەلەبەرکانی لێکدانەوەو ڕاڤەکردنەوە گوێ بیستی کێشەی نەوەکان و ناولێنانەکانیان دەبین، بەشێوەیەك کەنەوەکان بەشێکی زۆری ئەدەبیاتی دنیای ئێمەیان داگیرکردووە. لەگەڵ جیاوازی پێناسەکان و ڕەخنەگرتنەکاندا، هەموو لەسەر ئەوە پێکدێن کەنەوەکان گردبوونەوەیەکی مرۆیین لە چوارچێوەیەکی تایبەتدا کەشوناسێکی تایبەتمەند دەدەن بەخۆیان ولەچوارچێوەیەکدا مێژوویەکی تایبەت بە خۆیان بینادەکەن..

لەئەدەبدا کێشەی نەوەکان لەتام و بۆنی زەمەنەی گێڕانەوەی چیرۆکەکانیان بەرجەستە بووە، ڕۆحی نەوەکان لە هونەرەکانی گێڕانەوەی وەك (هونەری ڕۆمان) دا زیاتر خۆی بەرجەستە دەکات، بۆنمونە هاینریخ بۆڵ لەئەدەبی ئەڵمانیدا جوانترین نمونەی کێشە سایکۆلۆژی و کۆمەلاّیەتی وشێوەژیانی نەوەی جەنگ لەنوسینەکانیدا بەرجەستەدەکات، گونتەرگراس لەسەرێکی دیکەوە باس لەنەوەیەکی دیکەی نێو ڕووداوەکانی جەنگ دەکات، ئەو نەوەی بەشداری جەنگی نەکردووە ، بەلاّم لە نێو کەش وهەوای جەنگدا ژیاوە و ئاسەوارەکانی هەڵگرتووە، کێشەی نەوەکان و پاشماوەکانی ڕاسیستیەت و پەیوەندیەکانی نێوان نەوەی دوای جەنگ بە کێشەکانی جەنگ و کاریگەریەکانیەوە،بەشکی زۆری جوگرافیای ئەدەبی گونتەرگراسە. لە ڕۆمانی (بیروڕایەکی ڕەشبین) باس لە گەڕانەوەی مردووەکانی پۆلۆنیاو ئەڵمانیا دەکات بۆ گۆڕەسروشتیەکانی خۆیان!!، ئەو ئەڵمانە پەرەوازانەی بەهیوابوون چ نەبێت قەبرێکیان لەئەڵمانیدا هەبێت، چ ئەو پۆلۆنیانەی بەهیوا بوون بستەخاکێکیان لە پۆلۆنیای نیشتمان ببێت بەقەبریان. لەڕۆمانی (بیروڕایەکی ڕەشبین) دا گونتەر گراس باس لەوە دەکات، کەچۆن ناسیونال سۆسیالزمی ئەڵمانی (نازیزم) ، کێشەی گەورەی بۆ نەوەکانی دوای جەنگ بەجێهێشتووە، بەجۆرێك کەژیانی پریڤات و کەسی لە نێوان ئافرەتێکی پۆلۆنی و پرۆفیسۆرێکی ئەڵمان لەبەردەم چەندەها کێشەی مێژوویی و

یەکلایکردنەوە و  تاڵیدا خۆی دەبینێتەوە، ئەوە بیرکردنەوەی  نەوەی دوای جەنگە کە گراس باسی لێوەدەکات ، ئەوە جەنگ نیە وەك بابەت، بەڵکو گەڕانەوەی ژیانەوەی ئاساییە بۆ مردووەکان. مردووەکان مافی ئەوەیان هەیە بەسروشتی سەربنێنەوە ، هەر وەك لە زاری فیگوری ڕۆمانەکەوە باس لە مافی (مافی گەڕانەوەی  مردووەکان بۆ نیشتمان.) دەکات.*

..(Grass. Unkenrufe. S.٣٨)

لەنێوان هاینرخ بۆل و گونتەرگراسدا کێشەی دوونەوە و دوو زەمەنی جیاواز دەستپێدەکات و لەزۆر خاڵدا یەکردەگرنەوە، بەلاَم ئەوەندەی هاینریخ بۆلّ کێشەی ئازارەکانی جەنگ و ووردەکارەیەکانی  ژیانی ئەو نەوەیە دەگێڕێتەوە و دەیخاتە بەر کێشەبەندی گێڕانەوەی ڕیالستانەوە،ئەوەندەی جەنگ لەلای  هاینریخ بۆلّ وەك ووردەکاری چەوساندنەوەی سەربازەکان، کەبەزۆرەملێ* لەبەرەکاندا خەون دەبینن و برسی دەبن و بەدیل دەگیرێن و کەمئەندام دەبن و لەکاتی گەڕانەوەشیاندا بەرامبەر خێزانێکی هەڵوەشاو برسێتی و تێکشکاندنی سایکۆلۆژی دەبنەوە، هێڵی سەرەکی گێڕانەوەکانی ئەوەن.  ئەوەندە گونتەر گراس گرنگی نادات بەخودی ئەو فیگورە ، ئەو سەربازە تێکشاوە و ئەو جەنگەخۆی لەکاتی هەڵگیرسانیدا، بەڵکو کێشەکانی دوای جەنگ و کاکردن لەڕابوردوودا و کێشەکانی نەوەی دوای جەنگە لە بەرامبەر پاشماوەکانی نازیەت و نەوەکانی جەنگ و پیرەکانی ناسیونال سۆسیالزم،ئەمانە بەجیاواز لە هاینریخ بۆلّ هێڵی سەرکی کاری هونەری گێڕانەوە و فیکری ڕۆمانەکانی ئەون. ئەگەر بەکورتی لەخزمەت ئەم باسەدا لەکێشەی نەوەکان بڕوانین، ئەوا هاینرخ بۆلّ نوێنەری ئەو نەوە جەنگەیە کەبەشدارە و ئازار و یادەوەردیەکانی بەدووی خۆیدا ڕادەکێشێت، ئەوا گراس نوێنەری نەوەیەکی دیکەی دوای جەنگە کەئاسەوارەکانی جەنگی لەلاگرنگتر وەك لە کێشەی جەنگ خۆی ، لەنێوان ئەم دوونەوەیەدا ، نەوەی جەنگ و نەوەی دوای جەنگی ئەڵمانیدا، خاڵی جیاوازی و  یەکدگیری هەیە،بەم شێوەیە لەئەدەبدا نەوەکان بەجوانی تەعبیر لەخۆیان دەکەن و مرۆ دەتوانێت چەندەها نمونەی زیندووی لەم بابەتە، لەئەدەبی کوردی دەرهاویشتە بکات.

دیارە  نابێت ئەوەمان لەبیر بچێت، بوونی چەندەها (هێڵی گەرم) ، کەلەشەستەکانی ئەوروپادا و بەتایبەت لەکۆتایی شەستەکاندا کێشەی ئەم دوونەوەیەی (نەوەی جەنگ ) و (نەوەی دوای جەنگ) ی خستە سەر ئاستێکی پێکدادانی سیاسی و ئیدی گەڕەلاوژەکان لەنێوان ئەم دوونەوەیە گەیشتە پێچێکی تیژ کەبووە هۆی سەرەتای گەڕەلاوژەکان ، لە(هێڵەگەرمەکانەوە) جیاوازیەکانی ئەم دوونەوەیە تیژ و تیژتر دەبۆوە ،هێڵە گەرمەکانیش ئەو جیاوازی شێوەژیان و بیروڕاو جیهانبینیانە بوون کەئەم نەوەیەی لەوی دیکەی جیادەکردەوە، بەجۆرێك کەئیدی نەوەکان لەگردبوونەوەیاندا، بتوانن (فۆرمێکی بیروڕا) بۆخۆیان تێزەبەندی بکەن، کەلەدوایدا

زۆر بیریارو ڕۆشنبیری گرنگی جیهانیان لەخۆیان کۆکردەوە، شەڕی نێوان فیکری تەنها لەنێوان کوڕو باوکەکان نەبوو، بەڵکو گواسترایەوە بۆ بەدگومانی لە خودی بوونی سوستێمی سیاسی وپەروردەیی و کۆمەلایەتی ، کەنەك تەنها کێشەی لەسەر ئاستی خوێندکارانی زانکۆ تەقاندەوە بەداواکردنی ڕیفۆرم بەڵکو پرسیار بوو لە خودی ڕۆحی سەردەم خۆی ، بەباشی دەزانم بۆ ئەوەی خوێنەری ئازیزم بخەمە بەردەم وێنەیەکی ڕوون و ئاشکراوە و لە کرۆکی بابەتە نێزیك ببمەوە، لەبەشێکی داهاتوودا ، چەند خاڵێکی گرنگی شۆڕشۆچکە و گەڕەلاوژەکانی ساڵی ١٩٦٨ لە فەرەنساو بەتایبەتیش لە ئەڵمانیادا بهاروژێنین.

٦

کرۆنۆلۆژی شۆڕشۆچکەی مای ١٩٦٨ لەفەرەنسادا باشترین نمونەمان پێشکەش دەکات لەسەر سەرەتای گەڕەلاوژەکان و دۆزینەوەی خاڵە قورسەکانی کێشەکان. کەسەختبوونیان لە بەریەکەوتنەکاندا خۆی دەبینێتەوە، دەبێت ئەوەش بڵێین کەهێڵەگەرمەکانی نێوان دوونەوەی جیاواز ڕۆژ لەدوای ڕۆژ و ساڵ لەدوای ساڵ کێشەی نوێی کەڵەکە دەکردە سەریەك ، بەجۆرێك کەئیدی جیاوازیەکان گەیشتە ئاستێك کەچیتر مارشی ناسیونالیستی حکومەتی ژەنرەاڵ دیگۆل و پاراستنی نەتەوەی فەرەنسی لەهەرەشەکانی دەرەوە، کاریگەری نەبوو بۆ سەر ئەوەی داهاتوو، نەك لەبەر ئەوەی ئەوەی شەستەکان سەدەی ڕابوردوو کوڕانێکی لامسەلایی بوون ، هەر وەك چۆن ئاوەها لەلایەن کۆنزەرڤاتیفەکان (کۆنەپارێز) و ناسیونالیستە پیرەکانەوە وەسف دەکران. نەخێر ، بەڵکو ئەمان نەوەیەکی نوێ بوون بە مۆتیڤێکی نوێ و ژیانێکی نوێیەوە دەیانەویست هەموو ئاسەوارەکانی جەنگ لە نێو ئەقڵی باوی سیاسی و کۆمەلایەتی ئەو سەردەمە دەرکێش بکەن. درێژە پێدانی ئەو کۆنەخوازیە چیتر لەگەڵ خەونەکانی ئەواندا نەدەگونجا، ئەوروپای داوی جەنگ ، ئەوروپایەك بوو ڕاخاودرابوو بەخەون بەدواڕۆژەوە، خەونی دواڕۆژیش لەگەڵ درێژبوونەوەی دەسەلاتی دیگۆلیەکان و ژەنراڵەکانی ناسیونالیست و کۆنەپارێزەکانی فەرەنسادا دەبووە کابوسێکی ناخۆش و هەناسەتوندیەکی ئازادی، چیتر ئەو سوستێمە سیاسی و ئیداریە نەیدەتوانی لەگەڵ ئەو سێبەرە وکەش و هەوا کۆمەلایەتیە بگونجێنێت کە نەوەی نوێ خەونی پێوە دەبینی، هۆشمەندیەکی دیکە جێگەی هۆشمەندی بەرگری و گوتاری نەتەوەیی و ناسیونالی دەگرتەوە، هۆشمەندیەك بە دواکاریی ڕیفۆرمی بنچینەیی لە بوارەکانی پەروەردە و سیاسەتی خوێندنی باڵا و زیاتر فراونکردنی پەیوەندیەکانی نێرو مێ لە کۆلێژ و بەشەناوخۆییەکاندا سەریهەڵدەدا. زانکۆ تەقلیدیەکان کەهێشتا لە بالاخانە کۆنینەکانیاندا مابوونەوە، بەو بەڕێوبردنە و مامەڵە تەقلیدیە کۆنەپارێزە لەگەڵ

خوێندکاراندا، جێگەی ناڕەزایی خوێندکاران بوون، کەخەونی نوێی مۆدێرنیزەکردنی کۆمەڵگە بووە خەمێکی گەورەیان، ڕۆژ بەڕۆژ داواکردنی ڕیفۆرم و ناڕەزایی لەسەر شێوزای سوستێمی زانکۆیی پەرەی دەسەند تاوەکو ئەوەبوو لە مانگی مای ١٩٦٨ دا گەڕەلاوژەکان دەستیان پێکرد و لێرە و لەوێ تەشەنەی سەند تاوەکو لە شۆڕشۆچکەی ١٩٦٨ دەموچاوێکی مێژوویی بۆخۆی پێکهێنا، نەك تەنها لەفەڕەنسا بەڵکو هەموو ئەوەی نوێیی لەگەڵ خۆیدا هێنایە نێو شەڕ و ئیدیا و کێشمەکێشمەکانیەوە ، کەلەدوایدا بەیەکێك لە درزتێکەوتنە گرنگەکانی مێژوویی ئەوروپایی و جیهانیش دەژمێرێت، بەوەی ئەوروپای جارێکی دیکە هێنایە سەر پێداچوونەوە و نوێبوونەوە و مۆدێرنیزەکردنی کۆمەڵگەکانی خۆیان لەهەموو بوارەکاندا.

هەروەکو ئاماژەمان پێدا کە (هێڵە گەرمەکان) سەرەتای ئەو دیاریکردنی ئەو هێڵە جیکاریانە بوون لەنێوان دوونەوەدا، لەنێوان دوو ئیدیا و جیهانبینیدا ، بەشێوەیەك کەیەکێکیان لەفۆرمی دەسەڵاتدا خۆی بەرجەستەکردبوو، ئەوی دیکەیان کەنەوەی (منداڵەکان) بوون لەفۆرمی جوڵانەوەی خوێندکاری و فیکری و بلاوکراوە و سیمینار و گۆڤار و ڕۆژنامەی تایبەت بەخۆیان دەسەڵاتی باوکەکانیان خستە بەردەم پرسیاری پڕ گومانەوە، بەڵام ئازیزانم لەکوێ (هێڵی گەرم) کێشرا لەوێندەری پێکدادان دەستپێدەکات . گەڕەلاوژەکان سەرەتای دەرکەوتنی هۆشمەندیەکی کۆمەڵایەتین کە نۆرم و بەها و مۆراڵ و ئەخلاقی کۆمەڵایەتی و ئیدیای باوی کۆمەڵایەیتی دەخەنە بەردەم پاکەتێك لە نۆرم و بەهای تازەی جیاواز و پێناسەی نوێ و هەوڵدانێکە بۆئەوەی شوناسێکی نوێ بدەن بەخۆیان. گەڕەلاوژەکان فۆرمێکی نوێی نەوە و بیروڕانوێیەکانن لە گەردوونێکی تووڕە و دەرماگیردا.

کرۆنۆلۆژی شۆڕشۆچکەی ١٩٦٨ بەم شێوەیەی خوارەوە بوو :

* مای ١٩٦٨: دوای ئەوەی خۆپیشاندانێکی خوێندکارانی زانکۆی سۆربۆن قەدەغەکرا ، خوێندکاران هەستان بەگەڕەلاوژە و زانکۆیان بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ داگیر کرد ، تاوەکو پۆلیس ناچاربوو بێتە ناو زانکۆوە و زیاتر لە دووسەد خوێندکار بەندکران، ئێوارەکەی لە گەڕەکی (لاتین) کەزۆربەی دانیشتوانی خوێندکارانی زانکۆ بوون گەڕەلاوژە دەستی پێکرد، بەگشتی شەش سەد کەس بەندکران.

* سەندیکاکانی کرێکاران و رێکخراوە جەماوەریەکان و پیشەییەکان هاوکاری خۆیان و پشتگیریان لە دواکاریەکانی خوێندکاران نیشاندا، خوێندکاران دوای ڕیفۆرمی ڕادیکاڵیان دەکرد لەزانکۆکاندا، لە شێوازی وانە گووتنەوە وە بیگرە تاوەکو پرۆگرام و زیاتر فراوانکردنی پەیوەندیەکانی نێر و مێ، بۆنمونە داوای تێکەڵکردنی بەشەناوخۆییەکانی خوێندکارانیان دەکرد و دوای زیاتر فراونکردنی پەیوەندیە سێکسواڵیەکانیان دەکرد لەسەر بنچینەیەکی مۆدێرن نەك کۆنەخواز..

* نەقابەکان دوای کرێی زیاد و باشکردنی باری گوزەران و جۆری بیمەکانی بیکاری و کۆمەلایەتی و تەندروستیان دەکرد ، لەهەموو لایەکەوە گەڕەلاوژەکان دەستپێیکردبوو، چیدی زەمەنی باوی رۆژانە ژیان نەدەجولا، زەمەن زەمەنی جولاوی گەڕەلاوژەکان بوون کەفۆرمی داواکاری و فۆرمولەکردنە و شێوەبازکردنەوەی کۆمەڵگەیان لەخۆ گرتبوو..

* ١٣ ی مای ١٩٦٨: زیاتر لە یەك ملیۆن کەس بەشداری خۆپیشاندانێکی گەورەیان کرد، دوو ڕووداوی گرنگ لەو نێوەندەدا زیاتر گەڕەلاوژەکانی دەکرد بە مانگرتن و دواکاری فۆرمولە کراو و گوتارێکی تایبەتی پێدەبەخشی و شەرعیەتی سیاسی پێیەخشی، یەکەمیان ئەوە بوو، کە سەرەك وەزیرانی حکومەتی فەرەنسا( Pompidou ) باسی لەئازادکردنی بەندکراوەکان کرد، دووهەمیان بەشداریکردنی نەقابەکان و کرێکاران بەتایبەتی لە خۆپیشاندانەکەدا، بەمەش مەسەلەکە لە گەڕەلاوژەیەکی نەوەیەکی نوێی خوێن گەرمەوە گوزرایەوە بۆ نێو بوارێکی فراوانتر و گەورەتر ، ئەویش دواکاریەکانی چین و توێژەکانی کۆمەڵ بوو بۆ مۆدێرنیزە و چاکسازی باری ژیان.

* مەتریز و پێکدادان و ئۆتۆمبێل سوتاندن زۆربەی ناوچەکانی پاریسی گرتبۆوە، (ژەنراڵ چارلس دیگۆل) پلانی ئەوەی دادەنا بە سوپا ئەو خۆپیشاندانانە خامۆش بکاتەوە.

* لەهەموو دیوار و سوچ و پەنای شاری پاریس دروشمی جۆراوجۆر هەڵواسرابوو. لەهەموو کون وکەلەبەرێکدا بەیاننامە بلاودەکرایەوە، هەموو بەگشتی داوای ریفۆرمی بنەرەتیان دەکرد، سوستێمی بەرێوەبردنی کۆمەڵگەیان بەگەندەڵی و کۆنەپارێز و نەگونجاو لەگەڵ رۆحی سەردەم لەقەڵەمدەدرا. زیادکردنی کرێ و چاکسازی بنەرەتی لەسوستێمی خوێندن و فراوانکردنی پەرەوایزەکانی ئازادی تەوەرەی ئەو هەموو گفتوگۆ و مێزگردانە بوون کەخوێندکارانی زانکۆ و رۆشنبیران و نوێنەری نەقابەکان سازیان دەدا.

* دروشمی وەکو (چاکسازی وریفۆرم) و (رێکخراوە پیشەیە رەسمیەکان قەحبەخانەن) (فانتازی بۆگرتنە دەسەلات دەبێتە واقیع) و (ئێمە جیهانمان دەوێت. هەر ئێستاش دەمانەوێت) ئەمە و چەندەها دروشمی دیکە کەناوەرۆکەکانی کۆتایی هێنان بوو بە دەسەلاتخوازی پیرەکانی جەنگ. دەسەلاتی پیرەکان بەگشتی. دەبێت ئەوەش بلێین کەشەری ڤێتنام و زۆرانبازی نێوان دەوڵەتە گەورەکان لەسەر دابەشکردنی دەسەلاتی خۆیان لە کیشوەرەکاندا. بەتایبەت لەنێوان هەردوو براوەی سەرەکی جەنگی جیهانی دووهەم، ئەمریکا و سۆڤیەت، سەرەتای دابەشبوونی کەش و هەوای کۆمەڵگەکانی رۆژئاوا بوو بەسیاسەتێکی جەنگخوازانە و درێژە پێدانی یاساکانی (باری نائاسایی) بۆ زیاتر کۆنترۆلکردنی کۆمەڵگە و ئازادیە کەسیەکان. ئەم بارە نائاساییە لەهەموو لایەکی دنیادا، لە ئەمریکا و لە ئەڵمانیاشدا، خوێندکارانی هێنایە سەرجادە.

* چەمکی (شەری شەقامەکان) و (پەرلەمانی شەقامەکان) دەهاتە نێو ئەدەبیاتی سیاسی و فیکریەوە، دەبێت ئەوەش بلێین کاریگەری هونەری موزیکی (رۆك) کاریگەریەکی تایبەت بوو، دیسکۆکان شێوازی نوێیی سەماکردنیان پێشکەشدەکرد ، کەزیاتر لە رووپی دەرخستنی پێستی رووت و سێکسوالیەتەوە خۆی رێرەوخواز کردبوو ، لەئەمریکادا دروشمی (دڵداری لەجیاتی جەنگ) لەسەر هەموو زارێك بوو. گۆرانیبێژ و موزیکەیکی رۆکی وەك (رۆلین ستۆنگ) گۆرانیەکی بەناوی ( شەرکەری شەقام ) "Street Fightin Man" بەرهەمهێنا، زۆری نەبرد حکومەتی ئەمریکایی ئەوسا ئەو گۆرانیەی بایکۆت کرد و سانسۆری خستە سەر بەوەی لە ئێزگەکاندا

لێبدرێت، لەبەرامبەر ئەوەدا، ملیۆنەها کاسێت وقەوان فرۆشران، موزیك و هونەری رۆك کاریگەریەکی گەورەیان هەبوو لەسەر دروشمەکان، لەهەمانکاتیشدا گەرەلاوژەکانیان لە کەش و هەوایەکی هونەریدا فۆرموله دەکردەوە، دەربڕین بوو لە توڕەیی نەوە نوێیەکان لەبەرامبەر (پیرەکانی جەنگ). لە چاوپێکەتنێکی رۆژنەمانەوانیدا گۆرانبێژ وموزیکەیەکی وەك ( Frank Zappa ) لەگەڵ گۆڤاری( Konkret ,, کونکرێت) گووتی : پێویستە ئێمە جێ بە پیرەکان لەق بکەین و بچینە شوێنی ئەوان ... ئەم ڕستەیە بە ڕستەیەکی سەرەتانی دەژمێردێت، بەشێوەیەکی زۆر سادە دەربڕینی کەشو هەوای گەرەلاوژە و شۆرۆشچکەی ١٩٦٨ بوو.

سەرچاوە : Jörg von SZ DISKOTHEK - ١٩٦٨ www.titel-forum.deBilavsky,

* حکومەتی دیگۆڵ لەناچاریدا هەڵبژاردنی ڕاگەیاند، ڕاستە کۆنزەرڤاتیفەکان لەم هەڵبژاردنەشدا کورسی زۆریان بەدەست هێنا، بەڵام حکومەت ناچار بوو زۆر ڕیفۆرم بەئەنجامبگەیەنێت، لەژێر ئەو پەستانەی جولانەوەی خوێندکارانی ١٩٦٨ دا لەهەموو بوارەکاندا، کۆمەڵگە کرانەوەی بەخۆیەوە بینی، جوڵە و ئازادیەکان گەیشتنە ئاستێکی دیکە و دیموکراسیەت لە ئەوروپادا خوێن گەرمیەکی دیکەی پێبەخشرا، لەهەمان کاتیشدا زۆر بیریاری گەورەی بەتایبەت (بنەماگەرەکان)ی وەك فۆکۆ و شترواس وبارت و دۆلۆز و بۆردیارو و زۆری دیکەی وەك ئادۆرنۆ و هێربێرت مارکۆز و هابرماز و سارتەر و سەرانی قوتابخانەی فرانکفۆرت بەشداری ڕەخنەگرانە و شیکارانەی ئەو جولانەوەیان کرد، بزوتنەوەی ڕەخنەیی ئەوان کاریگەریەکی گەورەی هەبوو بۆ بەخشینی ڕەهەندێکی دیکە بە بزوتنەوەکە، دیارە پرسیاری نێوان تیۆرە و پراکتیك، خەون و واقیع ، ئایدۆلۆژیا و یۆتۆبیای ڕۆمانسیانە، چەپ و دوژمنکاری ، کرانەوە و سێکسوالیەت و دەسەلاتخوازی، دەولەت و کۆمەڵگا، کۆمەڵگەی گەندەخۆرو شتومەکی و مرۆڤی تاك ڕەهەند و زۆر پرسیاری دیکە جێگەی هاروژانی قوتابخانەی فرانکفۆرت بوون، لەهەمان کاتیشدا فەیلەسوفەکانی فەرەنسا لە سارتەرەوە بیگرە تاوەکو بۆردیار پرسیاری داگیرکردن و کۆلۆنیال و دژە ڕەگەزی و کۆنزەرڤاتیف و کرانەوە و ترادیسیۆن و پەیوەندیەکانیان خستەوە بەر پێداچوونەوە و وتوێژ..

بۆئەوەی بەشێکی دیکەی ئەم پانۆراما خێرایە تەواو بکەین ، کەلەخزمەتی باسەکەماندا دەیهاروژێنین ، بە پێویستی دەزانم کورتەیەکی پێناسەیی شۆڕشۆچکەی ١٩٦٨ لەئەڵمانیادا بخەینە ڕوو، بەو سیفەتەی ئەڵمانیای دوای نازیەت و جەنگ هێشتا لەنێو ئاسەوارەکانی جەنگدا دەژیا، ئەوەی باوکەکان و کورەکان ، ئەزۆرانبازیەکی تیژبەردا بوون. ١٩٦٨ لە فەرنسادا جارێکی دیکە هەموو کێشە هەڵپەسێردراوەکانی تەقاندەوە، دەبێت ئەوەش بڵێین کەچەپ و بزوتنەوەی چەپی خەیاڵی کاریگەر بە چەمکی پارتیزانی و شەڕی جادە و ئەنتی فاشیزمی خەیاڵی لەنێو خوێندکارانی زانکۆدا هێکی پان و پۆڕی بۆخۆی فەراهەمکردبوو، بوونی چەند ئەکتیڤیستی وەك ڕودی دوتچکە Rudi Dutschke ) لەئەڵمانیا و (کۆن بێندیت Cohn-Bendit ) لە فەرەنسا زیاتر ڕەهەندێکی (نەوەخوازی) بەخشی بەجوڵانەوەکە، پەیوەندی پتەوی ئیدۆلۆژی وسیاسی لەنێوانیاندا و لەهەمان کاتیشدا پەیوەندی کاریگەری نێوان هەموو گەڕەلاوژە و شۆڕۆچکەکانی ١٩٦٨ لەبزوتنەوەی دژی جەنگی ڤێتنام و ڕەش پێستی ورەگەزپەرستی لە ئەمەریکادا بەشێکی دیکەی کاریگەریەکانی ئەو جوڵانەوەیە بوو. موزیکی ڕۆك و مۆدەی قژ درێژی و نیشاندانی جەستەی ڕووتی و پانتۆڵی جینز لەجیاتی قاتی کۆنەخوازانە و دەرکردنی چەندەها گۆڤاری سێکسی و ئازاد کەباس لە ئازادی جەستە دەکات و نیشاندانی چەند فۆتۆیەك کە پۆرنۆگراف نین بەقەد هێندەی سێکسوالی ئازادن و سێکس پابەند دەکەنەوە بە ئاشتیخوازیەوە وەك چەکێك دژی جەنگەکانی دوای شەڕی جیهانی دووهەم و کەش وهەوای نەخۆشانەی جەنگی سارد ، ئەو کەشو هەوا هاوتەریبانە بوون کەگەڕەلاوژەکانیان لەنێو کەشو هەوایەکی بزوێنەردا ئۆرگانیزەدەکرد..

لەئەڵمانیادا بزوتنەوەی خوێندکاران لەڕووی ناوەڕۆکەوە بەهەمان کرۆنۆلۆژی لێکچوودا تێپەڕ دەبوو ، بەڵام زیاتر کولتوری چەپی خەیاڵی بەسەردا زاڵبوو، بزوتنەوەی وەك (ئاپۆڕAPO ) کەکورتکراوەی (ئۆپۆزیسیۆنی دەرەوەی پەرلەمان) بوو ، لەگەڵ گروپەکانی دیکەی خوێندکاران و کرێکاران جوڵێنەری گەڕەلاوژەکان بوون، (ڕودی دوتچکە)ی ڕابەری بزوتنەوەی چەپی خوێندکاران لەلایەن ڕاسترەوێکی توندرەو (باخمان) تەقەی لێکراو بەسەختی بریندار بوو. بریندار بوونی دوتچکە بووە هۆی هەڵایساندنی توندوتیژی لەنێوان خوێندکاران و پۆلیسدا، ئۆتۆمبێل سوتاندن و مۆلۆتۆف هاویشتن و(توندوتیژی دژی شت و مەك ) ، گەیشتە ئاستێکی ترسناك، دۆتچکە تاوەکو ١٩٧٩ ژیا و لەدەرئەنجامی ئەو ئەو هەوڵی تیرۆرە کۆچی دوایی کرد. باخمانی ڕاستەڕەو لەزینداندا خۆی کوشت ، بەم شێوەیە دوای تەقەکردن لە دوتچکە، لەبەرلین و دەوروبەری شەڕو پێکدان لەنێوان خوێندکاران و پۆلیس دەستیپێکرد و ١٩٦٨ بەم دەروازە سەختە دەستی پێکرد. لەهەموو شوێنێك خوێندکاران و ئەندامانی (ئاپۆ )

باسیان له (پارتیزانی شارەکان) دەکرد، باسیان له توندوتیژی دەکرد وەك هۆکارێك بۆ گەیشتن بەئامانجەکان ، باس له درزتێبوونی سوستێمی باوی ئیداری وسیاسی ئەو ساکه دەکرا، کۆبوونەو بیروڕای جیاواز و توندو تیژی سیفەتی دیاری گەڕەلاوژانه بوو، کێشەی چەپ و توندوتیژی چەپڕەوی چەندەها تێزی لەخۆ گرتبوو کەجێگەی گفتوگۆبوون، بەم شێوەیه تەقەکردن له دۆتچکه و برینداربوونی، ئەو هەموو کێشانەی هێنایه کایەوە کەسەردەمانێك بوو لەدوای جەنگەوە کەڵکه بوو بوون، زانکۆکان و ژووری پرۆفیسۆرەکانیش بەر داگیرکردنی خوێندکارانی توره کەوتن، تەنانەت خوێندکاران بیرۆی فەیلەسوفی خۆشەویستیان (تیۆدۆر ئادۆرنۆ ) داگیر کرد ، ئادۆرنۆ لەنامەیەکیدا بۆ (مارکۆز) کەله ١٤ ی فێبروارلای ١٩٦٩ دا نوسیویەتی :

[ ئازیزم هێربێرت ، ئێمه مەجبوربووین تەلفۆن بکەین بۆ پۆلیس، بەلام مەسەلەکه وا بلاوکرایەوە هەر وەك ئەوەی ئێمه توندیژیمان بەکارهێنابێت نەك خوێندکاران، زۆر پڕوپاگەندە و قسەلۆکیان بلاوکردەوە و زۆربەی ئەو هەوالانه بەچەندەها ڕەنگ وبۆ لێرە و لەوێ بلاوکرانەوەتەو و لنگەوقوچ کراوە ، بێگومان ئەم جۆرە هەواڵه لنگەو قوچانەت پێگەیشتووە..]

ڕاینهارد مۆر : ماسیەکی تێر . گۆڤاری شپیگل ٢٠/ ١٩٩٨.

*Reinhard Mohr , Der satte Fisch. DER SPIEGEL* ٢٠/١٩٩٨

ئادۆرنۆ مەجبوور بوو بانگی پۆلیس بکات و لەلایەن زۆر له خوێندکارانی خوێنگەرمی تەوباوی ئادۆرنۆش بەپیاوی حکومەت ناوزەدکرا، لەلایەکی دیکەوە تێزەکانی ئادۆرنۆ و قوتابخانەی فرانکفۆرت ئیلهام بەخش و پشتەوێنەی ئەو بزوتنەوەیه بوو، دەخوێندرایەوە و گفتوگۆیان لەسەر دەکرا. لەگەڵ ئەوەشدا گرنگی ئەو شۆرشۆچکەیه لەلای یەکێکی وەکو (ئادۆرنۆ) لەو درز تێبوونەدا خۆی دەبینیەوە کەخوێندکاران له دژی سوستمێکی (دیموکراتی له فۆرمدا) ئەنجامیاندا و ئەو سوستێمەیان خسته بەردەم پرسیاری سەختەوە، گەڕەلاوژەکانی ئەوان ئەو پرسیاری دێموکراسی و مۆدێرنیزەکردنی کۆمەڵگەی جارێکی دیکه فۆرموله کردەوە، چەمکی (دیموکراسیەکی فۆرمال) مانای ئەو دیموکراتیه دەگرێتەوە له شێوە و دەرکەوتندا بوونی هەیه، بەمانایەکی دیکه دیموکراسیەتێکی بێ ناوەڕۆك و جەوهەرە و ڕۆژ بەڕۆژ مرۆڤی دەخسته بەردەم کێشەی (گەندەخۆری) و کاریگەری بێبەزەیی کۆمپانیاکانەوە، بە(کۆمپانیزەکردنی کۆمەڵگە) زۆر کێشەی کۆمەلایەتی و سیاسی قوڵی هێنابووە گۆڕێ، دیموکراسیەت بەرەو دیموکراسیەتێکی فۆرمال و ڕووکەش خۆی ڕێڕەوخواز کردبوو. خوێندکاران هەڕەشەیەکی هەقیقی بوون له بەرامبەر سوستمێکی سیاسی کە سیاسەتی (دیموکراسیەتی فۆرمال) ی پراکتیزەدەکرد، دەسەلات لەمەزندەی ئەوەدا بوو ،بەو نۆرم وبەها باوانەی دوای جەنگەوە دەتوانێت کۆمەڵگه بەڕێوەبەرێت. ئیدی لەم کەشو هەوا

قەیرانەویەدا، چەمکەکانی وەك ئازادی و ڕیالستی وئەقلآنیەت و زانین و ڕەخنە و کۆمەڵگای پیشەسازی و مرۆڤی تاکرەهەند و مرۆڤی گەندەخۆر و شمەکخوازی و ئیگۆئیزمی (خۆپەرستی) ئەو چەمکانە بوون بەدرێژایی ساڵانی دوای جەنگی جیهانی دووهەم ، تیزی ڕەخنەی فەلسەفی و سیاسی رۆشنبیرانی چالاکی ئەڵمان بوو. دەرهاویشتەکانی سوستێمی کاپیتالیستی و کێشەی بەها و نۆرمە تازەکان و لیبرالیەت و عوسابیەتی کەرتبوونی ئەڵمانیا بەدووبەشی رۆژهەلات و رۆژئاواو کێشەی نەودکانی پێشوو و لێپسراوێتیان بەرامبەر هەڵبژاردنی ناسیونال سۆسیالزم و ڕەدووکەوتنی هیتلەر و ملکەچیان بۆ تێزەکانی ڕەگەز و پاکتاوکردنی جولەکە و ئاسەوارەکانی لەسەر ئەڵمانیان و باجەکانی جەنگ و داگیرکردن ، ئەمانە هەمووی ئەو پرسیارە هەڵواسراوانە بوون لەپەراوێزی ١٩٦٨ دا جارێکی دیکە گفتوگۆیان لێدەکراو (هێڵەگەرمەکانیان) ڕادەکێشا بۆ مۆدێرنیزەکردنی کۆمەڵگە و فراوانکردنی بوارەکانی ئازادی و دیموکراسی.

ئەمە لەکاتێکدا بوو، کەجیاوازی بیروڕا هەبوو لەنێوان سەرانی فەلسەفی قوتابخانەی فرانکفۆرت کەخۆی لەخۆیدا پشتە وێنەی تێزی ئەو جولآنەوەیە بوون ، بۆنمونە ( لەکاتێکدا ژەنرال دیگۆل لەتاو خوێندکاران و شەرکەرانی شەقامەکانی پاریس هەلآت بۆ ناوچەی بادن بادنی ئەڵمانیا ، هەر لەوکاتەدا (هێربێرت مارکۆز ) لەبەردەم چوارهەزار خوێندکاردا باسێکی بەنێونیشانی (مێژوو و بالآبوون و گۆڕانکاری کۆمەلآیەتی ) پێشکەشکرد و باسی لە لەدایکبوونی (مرۆڤی نوێ ) دەکرد ..

Reinhard Mohr , Der satte Fisch. DER SPIEGEL ٢٠/١٩٩٨

لەلایەکی دیکەوە هابرماز لەنوسینێکیدا بەناوی (شەش تێز دەربارەی تاکیك و ئامانجەکان وشیکردنەوەی هەڵوێستی لاوانی ئۆپۆزیسیۆن) دا خوێندکاران ئاگاداردەکاتەوە لە (شۆرشێکی تەوباوی و خەیاڵی ) و داوایان لێدەکات کە جیاوازی بکەن لەنێوان تیۆرە و دنیای واقیعدا ، لەنێوان خەون و هەقیقەتدا. داوای لێکردن کە پشت ببەستن بە میدیای نوێ و کاریگەریان هەبێت لەسەر ڕۆشنبیرانی ئەکتیڤ و توێژە کاریگەرەکانی کۆمەڵگە. بەمانایەکی دیکە هابرماز ڕەخنەی لەرۆمانسیەتی شۆرشگێرانەی توندوتیژ دەگرت و داوای زیاتر ئەقلآنیزەکردنی و فۆرمولەکردن و بیرخوازیکردنی داواکاریەکانی دەکرد،، لەرێگەی بەردەوامیەکی ئەقلآنیانەی ڕەخنەگرانەوە، داوی دۆزینەوەی ڕەهەندە مێژووینە گرنگەکان دەکرد. ئەم تێزانە لەلایەین لایەنگرانی ئاپۆ APO و چەپەکانەوە چەندەها گفتوگۆ و وەلآمدانەوەی ڕەخنەگرانەی لەخۆ گرتبوو.

لەوانەیە جوانترین لێکدانەوە لەمەڕ شۆڕشۆچکەی ١٩٦٨ لەم چەند دێرەی کلآوس لێگەڤی چڕ بێتەوە کەدەڵێت : خوێندکاران ویستیان بەرگی پڕۆلیتاریایەکی بالآیی و

ئاڤانگراد ببپۆشن ، کرێکارنیش خەونیان بە سۆسیالیستی و سۆسیالیزەبوونی کۆمەڵگەوە دەبینی، ئەم بەرواره ١٩٦٨ پێناسەی قوناغێکی گواستنەوەی هەڵس و کەوت و ژیانە بۆ نێو کۆمەڵگەی پۆست مۆدێرن و پۆست پیشەسازی ...

سەرچاوە : کلاوس لیگەڤی : ١٩٦٨ مێژوویەکە بۆخۆی ، گۆڤاری سیاسی و مێژووی هاوچەرخ .

Claus Leggewie, ١٩٦٨ ist Geschichte. Aus Politik und Zeitgeschichte (B ٢٢-٢٣/٢٠٠١

**هەروەها بڕوانە**

http://www.dhm.de

لەم کورتە باسەی شۆشۆچکەی ١٩٦٨ وە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە بەھەوانتە گرتنی ھەموو ئەم جۆرە گەڕەلاوژانە ، ھەڵەی فیکری وسیاسی لێدەکەوێتەوە، لەھەمان کاتیشدا تێبینی ئەوەمان کرد کەشۆڕشۆچکەکان خاوەنی بنەما و تێگەیشتنی خۆیانن بۆ جیھان، بەتایبەت کاتێك لە ڕیزەکانی خوێندکارانی زانکۆوە سەرھەڵبدەن و خۆیان لەشێوەی نارەزایی و خۆپیشاندا فۆرمولەبکەن. بەدیویکی دیکەدا ھەموو خۆپیشاندان و مانگرتنێك ھێزی بەردەوامبوونی نابێت ، گەر ھاتوو لەسەر بنچینیەکی پتەوی تیۆری و فیکری نەوەستابێت و خاوەنی جیھانبینیەکی ڕوون و ئاشکرا نەبێت لەمەڕ داواکاریەکانی .

بۆچی من باس لە گەڕەلاوژەکانی فەڕەنسا دەکەم و بۆچی دەبێت ئەوە گرێبدەمەوە بە گەڕەلاوژەکانی ئەوسەری دنیا کە لەشاری ( کەلار ) ڕوویدا و خەڵکانێکی زۆری تێدا بەندکران و دەسەڵاتیش پەنای بردە بەر پۆلیس و توندوتیژی بۆ کوژانەوەی ئەو مانگرتنانە!!.. دیارە مەبەست لێرەدا بەخشینی ھیچ ڕەھەندێکی ئینتەرناسیونالانە نیە بە خۆپیشاندانەکانی کەلار و ئاکرێ ، بەڵام ھەر وەك لەسەرەتای باسەکەدا ئاماژەم پێدا کە ھەندێك زەمەنی ناوەکی و کردەی گردبوونەوەی مرۆیی لەدنیادا ھەن، لێکچوون لەڕووی جوڵانەوە و ئاراستەکانیانەوە. بەمانایەکی دیکە، لەڕووی بەراوردکاریەوە زۆر خاڵی یەکدیگریان ھەیە لەگەڵ یەکدیدا.. خوپیشاندەرانی گەڕەکە ھەژارەکانی پاریس ، خۆیان بە ھەڵگری میراتی ١٩٦٨ تێدەگەیشت، زۆریان باسیان لەوە دەکرد کە ئەمە ھۆشیاریەکی نوێیە و دەبێت زیاتر بەردەوامی پێبدرێت. لەگەڵیشیدا مۆسیقای (ڕەپ ) ھاوتەریب لەلایەن کۆمەڵێك گۆرانبێژو موزیکەوە ھەوڵدانێك بوو بەخشینی ڕەھەندێکی دیکە بە گەڕەلاوژەکان، دیارە بەخشینی ڕەھەندێکی ئیسلامیش وەك شوناسێکی خوازراو بە کۆچبەرە عەرەبە جەزائیری و مەغرییەکان، لایەنێکی دیکەی سروشتی ئەم گەڕەلاوژانە بوون، کەئەمەش خۆی لەخۆیدا دژاندن و (دژ ەخودی) فۆرمی ئەو گەڕەلاوژانەبوون، بەڵام ئەمانە ھەمووی گەڕەلاوژەیەك بوو لەفۆرمدا !!.

لێرەدا من دەڵێم (فۆرم) یاخود (دەرکەوتن و دیار) و باس لە (جەوھەر ) یان (ناوەڕۆك) ناکەم. ئەوەی کەدەردەکەوێت ئەوە نیە کەتەعبیرە لە جەوھەر ، لەوانەیە زۆر جار لەفۆرمی مەسەلەکانەوە بگەینە جەوھەرێکی نوستوو و شاراوە و ھەستپێنەکراو، ھەر وەك چۆن لە دەروونشیکاریدا مرۆڤەکان لە فۆرمەکانەوە دەستپێدەکەن و لەدواجاردا فۆرمەکان ئەو قۆناغی گواستنەوەیەن بۆ نێو جەوھەرێك و ناوەڕۆکێکی دەرکپێنەکراو. ئەم ھاوکێشەیە بەشێوەیەکی ڕێژەیی بەسەر گردبوونەوە کۆمەڵایەتیەکانیشدا دابەشدەبێت، دەکرێت بڵێین کە گەڕەلاوژەکان ئەو فۆرمانەن کە

هێشتا جەوهەری خۆیان نەدۆزیوەتەوە. دۆزینەوەی جەوهەری کێشەکان و فۆرمولەکردنی کردەیەکی ئالۆزی مەعریفیە و زۆر ئەزمونی خۆی هەیە کە پێدا تێدەپەڕێت، لێرەوە دۆزینەوەی جەوهەر لەڕیزی گەڕەلاوژکاراندا، خۆی لەخۆیدا قۆناغێکی گرنگە بۆ دۆزینەوەی خود و شوناسێکی تەواو، کەخۆی لە داواکاریەکان و هەنگاوەکانی داهاتوودا دادەڕێژێت. ئەوەی کە ناوی دەنێن (ئەزمون) لەزۆر فۆرمی جیاوازدا خۆی دەبینێتەوە، یەکێك لەو فۆرمی دەربڕینانە ئەو جۆرە گەڕەلاوژانەن کە لە پێچیکی ڕووداوەکاندا دەتەقنەوە، هەندێکیشیان ئەو بیروراو ڕەخنە و تەنانەت گلەیی و گازاندانەن کەلەم لاو لەولا دەکرێن و هیچ جۆرە ڕێکخەریەکی زنجیرەیی بیروبۆچوون بەخۆیەوە نابینێت، بەلام لەهەمان کاتیشدا تەعبیرە لەکێشەیەکی هەبوو. بەشێکی دیکە لەو فۆرمانە دەرهاویشتەی (جەوهەرێکی نوستوون) ، ئەو گوتارو دۆکۆمێنتە نوسراو گفتوگۆ تیژانەن لە ژیانی کراوەی کۆمەڵگەدا و لەچوارچێوەی دەزگا کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیریەکاندا مومارەسە دەکرێن. بالاترین فۆرمیش گوتاری ڕەخنەگرانەی جیدی و ڕاستەقینەیە کە شیکردنەوە و ڕاڤەکردن بەخۆیەوە دەبینێت ، ئەمەش بەشێك لە دەستەبژێری (نوخبە ، ئیلیتە) ڕۆشنبیری و سیاسی پێیهەڵدەستن، یاوەکو ئەوان لە ئەنجامی ڕووداوەکانەوە ئەو دەرئەنجامانە ڕۆشندەکەنەوە.

هەروەك چۆن لەدیاریکردنی هەندێك هێڵی گشتیی پێناسەیی شۆڕۆشچکەی ١٩٦٨ دا ئاماژەمان بە سەرانی بزووتنەوەکە وەك (ڕودی دوتچکە Rudi Dutschke و کۆن بێندیت Cohn-Bendit ) و فەیلەسوف و بیریارانی قوتابخانەی تیۆرەی ڕەخنەگری فرانکفۆرت دا، بەجیاوازی بیروڕایانەوە، ڕوویدا.. ئەمانە هەموو فۆرمەکانن کە هەندێکیان دەشێت پێش بکەون و هەندێکیشیان دەکرێت لەدوایدا بێنە سەرشانۆ، دەکرێت گەڕەلاوژەکان زۆر کێشەی نوستووی و چەپێندراوی نێو هەناوی کۆمەڵگە بهاروژێنێت ، کەتاوەکو ساتەوەختی گەڕەلاوژەکان ئەو گرنگیەی پێنەدراوە، بەلام ئەو ناوەڕۆکی کێشانە لەڕێگەی گەڕەلاوژەکانەوە دەبنە خاوەنی جەوهەری دیاری خۆیان و فۆرمی کێشەیەکی ئاشکرا وەردەگرن، کە پێویستبوونی مامەڵەیەکی نوێی گونجاو لەگەڵیدا ، هوشیاریەکی سیاسی و کۆمەلایەتی و فیکری نوێی دەهێنێتە ئاراوە..بەڕلام هەر کاتێك گفتوگۆیی گونجاو و پردی گفتوگۆیی گونجاو نەدۆزرایەوە ، ئەوا دەسەلات توشی کێشەی جەوهەری دەبێت، دەسەلات دوو چارەسەری هەیە، یان ئەوەتا دەبێت هەوڵبدات بگاتە ئاستی ئەو هۆشمەندیە نوێیەی کەداواکاریەکان خستویانەتە ڕوو ، یاوەکو بەپێچەوانەی ئەوە، سوورە لەسەر بەکارهێنانی میتۆدی تەقلیدی توندوتیژی و ڕێگە چارەسەری ئەمنی و یاریەکانی سیاسەت و هەڵبژاردن و گۆڕینی فۆرمی دەسەلات نەك جەوهەری. کەئەمەش کێشەی حکومەتەکەی دیگۆل بوو، لەگەڵ بردنەوەی لەهەڵبژاردنەدا نەیتوانی هێڵی سیاسی دیگۆلی بالادەست بکات و کاریگەری بپارێزێت. گەر بپەڕینەوە ئەو بەری کێشەکە و بچینە نێو خودی پێکهاتەی سایکۆلۆژی

و بیروبۆچوونی خۆپیشاندەران یان چاکتر بڵێم ( گەڕەلاوژکاران) وە، بەر فینۆمینێك دەکەوین کە یەکدگیری نیە، بەقەد هێندەی پەرش و بڵاوە، یەکبوو نین بەلام لە فۆرمی نارەزاییدا کۆبۆنەتەوە، بەمانایەکی دیکە، ئێمە لەبەردەم کۆمکەڵێك مرۆڤی جیاوازداین لەڕووی پێکهاتەی ئیندڤیدوال و تاکرەوی کەسێتی خۆیانەوە، بەلام ئەوەی گردیان دەکاتەوە، ئەو پرۆسێسی گەڕەلاوژەیە کە هەناسەدانێکی سایکۆلۆژیە لە شێوەی توندوتیژی دژی شت و مەك و ڕێگەگرتن لەژیانی ئاساییدا خۆی دەنوێنێت، بەوەی وەك کێشەیەکی بوونگەرایی دەیانەوێت بڵێن : ئەوا ئێمەش هەین ، بەخۆمان و کێشەکانمانەوە. ئەمە سەرەتاییترین جۆری گەڕەلاوژەیە کە زۆرجار ئاوەها بەناڕێکی دەست پێدەکات و لەگەڵ بەردەوامیدا جەوهەری خۆی دەدۆزێتەو و دەبێتە بیروڕا و داواکاری و بەرنامەی کارکردن ، کەئەمەش شێوازی بالایە و گەڕەلاوژە دەبێتە قوناغی گواستنەوە بۆ گۆڕانکاری دۆزینەوەی جەوهەری کێشەکان. ئەمانە هەمووی کاراکتەری هۆشمەندی دەوێت، گەر پێکهاتەی هوشیار و ڕەخنەگر کاری خۆی تێدا نەکات ئەوا گەڕەلاوژەکان بەیەکەم بەکارهێنانی توندوتیژی دەوڵەتی کۆتاییان پێدێت و تەمەنیان کورت دەبێت.

لە ئەڵمانیادایەکێکی وەکو (دوتچکە) و زۆری دیکەی لەڕابەرانی بزوتنەوەکە یەکسەر خاڵی جیاکاری خۆیان کێشا لەنێوان خۆیان وەك بزوتنەوەیەکی چەپی داواکار و خاوەن گفتوگۆی ئەقلانی و شێوازەکانی بلاوکردنەوەی هاوچەرخ ، لەگەڵ ڕێکخراوێکی وەك (RAF) ، کەسوپای سووری کۆمەنیستی ڕێڕەو دژ بەکاپیتاڵ بوو ، توندوتیژی ئۆرگانیزەکراوی وەك کوشتن و سوتاندنی ڕەواخوازدەکرد لەپێناو بەدیهێنانی ئامانجەکان. هۆشمەندی ئەوەی ١٩٦٨ لەوەدابوو کە وەرەقەکانیان تێکەڵ نەکرد و هەڵوێستێکی ڕوون و ئاشکرایان هەبوو لەمەڕ شوێنای خۆیان و ئەوانی دیکەدا و گەڕەلاوژەکانیان گواستەوە بۆ قوناغی ڕیفۆرم و ناچارکردنی گوتاری سیاسی بۆ-خۆگونجاندن لەگەڵ کەش و هەوای نوێی کۆمەلایەتی بزوتنەوەکە. گرنگی ئەوان لەوەدا بوو کە کێشەی سیاسی نوێیان خستە بەردەم کولتوری سیاسی . کولتوری سیاسی دوای شۆشۆچکەی ١٩٦٨ زاخاودرا بە چەمکەکانی وەك ئازادی و دیموکراسی و ڕیفۆرم و کارکردن لە ڕابوردووی جەنگ و ئاسەوارە دەروونی کۆمەلایەتی و پەروەردەییەکانی و سوستێمی کۆمەلایەتی و زەمانەتەکانی تەندروستی وکریێ.. لەدواجاردا دەتوانین بڵێین شۆڕۆچکەی ١٩٦٨ ئامانجەکانی زیاتر مۆدێرنیزەکردنی کۆمەڵگە بوو ، فراونکردنی پەیوەندیە سێکسواڵی و کۆمەلایەتیەکان بوو، لەقاندنی پێگەی جەنگاوەرەکانی جەنگ بوو کەلەیەکێکی وەکو (ژەنراڵ دیگۆڵدا) جەستەیی دەبوو. ئەوان دەیانگووت : چیدی جەنگاوەرەکان ناتوانن سەرکەوتنەکان بەئێمە بفرۆشنەوە ، چیتر بەنێوی نیشتمان ونەتەوە و نۆرمە کۆنەکان ناتوانن نەوەی ئێمەش بە ڕەنگەکانی خۆتان و

بەکلێشەکانی خۆتان سنورداربکەن... لەهەردوو بارەکەدا ئێمە لەبەردەم فۆرمی گەڕەلاوژەی نەوەکانین کە جەوهەری خۆیان دەدۆزنەوە...

٩

نەوەی کەدەمەوێت هەڵوێستەی لەسەر بکەم شەش تێزی یورگن هابرمازە لەمەڕ شۆڕشۆچکەی ١٩٦٨ ، گرنگترینیشیان کەلەخزمەتی ئەم باسەدا دەیخەنە بەر تیشکی گفتوگۆ ، چەمکی (شۆڕشێکی ڕووکەش ) یاخود (شۆڕشێکی شێوەخوازراو)ە. یورگن هابرماز و سەرانی قوتابخانەی فرانکفۆرت هەروا بەبێدەنگی لە پەراوێزی ڕووداوەکاندا تەماشاکارێکی بێ لایەن نەبوون، ئەمانە تەنها ئەو پرۆفیسۆرانە نەبوون کەکاریان لەخولگەی هۆڵی خوێندن و بیرۆکانیاندا بسوڕێتەوە، یاخود کۆمەڵێك مامۆستای زانکۆ بن تەنها لەسنوری زانکۆ و ڕۆتینی لیکۆڵینەوە ئەکادیمیەکاندا کاریان هەڵسوڕێت. ئەمان لەگەڵ ئەوەی خۆیان مامۆستای زانکۆ بوون و وانەیان دەگووتەوە و بزوتنەوەکە لە زۆربەی گەڕەلاوژەکانیدا هۆڵی خوێندن و تەنانەت بیرۆی مامۆستاکانیشیان داگیر دەکرد و فەوزایان دەنایەوە. لەگەڵ ئەمانەشدا بیروڕای مامۆستایانی زانکۆ و پرۆفیسۆرانی قوتابخانەی فرانکفۆرت جیاواز بوو، لەزۆربەی ڕای هاوکارەکانیان، ئەوان ئەم گەڕەلاوژانەیان لەچوارچێوەیەکی دیکەی مێژوویی و کۆمەلایەتی و فەلسەفیدا دەخوێندەوە. دیارە هەر وەك ئاماژەشمان پێدا کە گرنگی ئەم بزوتنەوەیە لەوەدا بوو، کە لەهەموو لایەکەوە خوێندنەوەی جیدی لەخۆ گرتبوو، ڕووداو نەبوو لەدوایدا کۆبوونەوە و سیمینارو ڕەخنەگرتن و کۆنترۆڤێرسە (مل ملانێی) فیکری و ڕۆشنبیری بەدوودا نەنەیەت، هەموو ئەکسیۆن وچالاکیەك پابەند بوو بە هەڵسەنگاندن و سیمینار و بیرو بۆچوونی جیاواز، ئەمەش وای کرد کە ئەو هێڵە گەرمانەی لەنێوان نەوەکان و بیروبۆچوونی نەوەکان و دەسەلات و خوێندکاران ڕاکێشرابوو، بەردەوامیەکی ڕیفۆرمی هەبێت، تەنانەت دوای خامۆشبوونەوەی گەڕەلاوژەکان، ساتی خامۆشبوونەوە یەکسان نەبوو بەساتەوەختی ڕاگەیاندنی جولانەوەکە، بەڵکو لەدوای خۆی چەندەها ئاسەواری فیکری و تیۆری لەدووی خۆی جێهێشت ، کەتاوەکو ئێستا جێگەی گفتوگۆ و نوسینی جۆراوجۆرن.بەگەڕانەوە بۆ تێزەکانی هابرماز کە دیدێکی ڕەخنەگرانە بوو لەبزوتنەوەکە، هابرماز شەش تێزی گرنگی لە نوسینێکیدالەژێر ناونیشانی Sechs Thesen über Taktik, Ziele und Situationsanalysen der oppositionellen Jugend (شەش تێز دەربارەی تاکیك و ئامانجەکان وشیگردنەوەی هەلوێستی لاوانی ئۆپۆزیسیۆن) پێشکەشکرد، یەکێك لە تێزە سەرنجڕاکێشەکانی ئەم گوتارەی هابرماز ئەوەبوو ، کە ئامانجی بزوتنەوەکە بەڕامیاریزەدەکردنی (پۆلیتەزەکردنی / بەسیاسەتکردنی ) ژیانی کراوەی کۆمەڵگە

بووه، ئەمەش بەڕای هابرماز ئەوەندەی پەیوەندی بە پرسی (ڕەوایەتی بنەماکانی سوستێمی کۆمەڵایەتی ) وە هەیە ، کەزیاتر هەوڵدەدات لەڕێگەی (پریڤاتیزەکردن و بەتایبەتکردنی بوارەکانی ژیان و سەرلێشواندن) دڵسۆزی بۆ هاوڵاتیان لەبەرامبەر دەوڵەت و دەسەڵات زامن بکات. ئەمەش بەڕای هابرماز ،خۆی لەخۆیدا (هیچ ڕێرەوخوازیەك بۆ فۆرم و نۆرم و بەهاکانی بەختەوەری و پێکەوەژیان پێشکەش ناکات)، بەمانای، هەموو تایبەتکردنەکانی کۆمەڵگە و سوستێمی بازاڕی ئازاد و کاپیتالیستی و پریڤاتیزەکردنی زۆربەی بوارەکانی ئابووری کەبەرکەماڵیەتی پارە و جۆرێك لەخۆشگوزەرانی ڕێژەیی وەبەر دێنێنن، بەڵام لەهەمانکاتیشدا غیابی فۆرم و بەهاکانی پێکەوەژیان و بەختەوەری کۆمەڵایەتین، ئەمە هۆکارێکی ئەو کاردانەوە گەرەلاوژەییانە بوون ..

تیژێکی دیکە ئەوە بوو، کە بزوتنەوەکە زیاتر لەسەر بنەمایەکی سیاسیـزەدەکردن (پۆلیتەزەکردن) و فانتازی سیاسی و تەکنیکی هێنراو ڤیرتوێل (وێنەکراو) سەریهەڵدا!. کاریگەری بزوتنەوەی دژە جەنگی ڤێتنام و فۆرمەکانی شەڕی پارتیزانی شارەکانی و کولتوری چی گیڤارا و شۆڕشی ڕۆشنبیری ماوی لەچین و جامەدانەی فەلەسەتینی وەك سومبۆل بۆ هاوپشتی و سولێداریێتی لەگەڵ بزوتنەوەکانی جیهانی سێهەم، فۆرمەکانی گاڵتەکردن و ئیرۆنیەت بە سوستێمی باو و تورەکردنی دەسەڵات، ئەو وێنە خوازراوانە بوون کەبزوتنەوەکە دەیەویست لەسەر زەویەکی دیکە و شارێکی دیکەی جیاواز و بارودۆخێکی جیاواز پراکتیزەی بکات. هابرماز ئەمەی بە تێکەڵکردنێکی هەڵەکاری نێوان (سۆمبۆل و ژیانی ڕیالستی ) لەقەڵەمدا، کەئەمەش مانای خواستنی سومبۆلەکانی شوڕش و تاکتیکێك بوون کەلەگەڵ زەوری ڕیالستی وژیاندا ناگونجێن، ئەمە ڕەگەزێکە و بەشێکە لە وێنەی (شوڕشێکی شێوەخوازی و رووکەشی )، نەك شوڕش و بزوتنەوەیەکی ڕیالستی.جگەلەوەی تێکەڵکردنی کاردانەوەی پۆلییسی دەوڵەت لەبەرامبەر خوپیشاندان و زیانەکانی خۆپیشاندەران بەشوێنەگشتیەکانیان وەك (ئۆتۆمبێل سوتاندن و سوتاندنی بازاڕەگەورەکان و هتد..) ، لەلایەن خوێندکارانەوە بە(فاشیەتی دەوڵەتی ) لە قەڵەمدرا!!. بەمەرجێك ئەو توندوتیژیە دەوڵەتیە زیاتر پرسیاری پۆلیسی بوو نەك پرسێکی فاشیانە!. جیاکاری نەکردن و تێنەگەیشتن لە جیاوازی کردن لەنێوان ئەم دوو کاردانەوەیە، خوێندکارانی بەرەو وەهمی ئەوە راکێش کردبوو کەئەوان بەرامبەر فاشیەتی جیهانی خەبات دەکەن و ترۆپکی ئەو وەهمە لە پێکهێنانی (ڕێکخراوی سوپای سور RAF) ناسراو بە (بادر ــ ماینهۆف ) خۆی جەستەیی کرد، هەر وەك چۆن لەئەدەبیاتیاندا گەرەلاوژەکانی ١٩٦٨ بە سەرەتای بزوتنەوەی شەری جادە و پارتیزانی شارەکان وەسف دەکەن، بەمەرجێك هەلومەرج و پێکهاتەی دەوڵەت و کۆمەڵگەی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا، دوور بوو لەو جۆرە

کاردانانەوەی کە پێویستی بەو خەباتی چەکدارانەی و توندوتیژی بێت کە لە پۆلیڤیاو ڤێتنامدا هەبوو.

بنەماکانی بزوتنەوەکە لەتێزەکانی ڕەخنەیەکانی یۆرگن هابرمازدا لەبەر مەترسی تەوباویەت و فەوزایەکی پڕ وەهمدا خۆی دەبینەوە.(شۆڕشی ڕووکەش) بەپێی ئەو تێزانە زیاتر لەسەر بنەمای ئەبستراکت و موجەرد دامەزراوە نەك لەسەر زەوی مل ملانیەکی تیۆرەبۆکێشراو و خاوەن ستراتیژی ڕیالستی کە زەمانەتی بەردەوامی پێبەخشێت... دیارە ئەم تێزانە هەموو لەخزمەت ئەوەدا بوو کە ئەم بزوتنەوەیە لەسەر هێڵی ڕیالستی خۆی هەنگاو بنێت. هابرماز و زۆربەی فەیلەسوفەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت بەچاوی ڕەخنەی کۆمەلایتیانەوە بزوتنەوەکەیان هەڵسەنگاند، ڕاستە ئەمە زۆر لە چەپەکانی نیگەران کرد، بەلام لەهەمانکاتیشدا توانی بزوتنەوەکەبپارێزێت لە ڕۆچوون بۆ نێو فەوزاو وەهمی چەپگەرایی تەوباویانە. دەبێت ئەوەش بڵێین کە یەکێکی وەك هابرماز لەسەرەتادا بزوتنەوەکەی لەژێر ناوی (چەپی فاشی) پێناسە کرد، بەلام لەدوایدا بەتایبەت دوای ئەوەی پۆلیسی ئەڵمانی لە مانگرتنێکی خوێندکاران لەدژی سەردانی شای ئێران (موحەمەد ڕەزا پەهلەوی) خوێنداکارێکی زانکۆیان (بێنۆ ئونەزۆرگ Benno Ohnesorg) کوشت، و دوای تیژبوونەوەی ڕووداوەکان هابرماز ڕەخنەی لەو پێناسەیی خۆی گرت و بەهەڵەکاریەکی خۆی لەقەڵەمدا، ئەمەش ڕۆحی ئەو تیۆرە ڕەخنەییە بوو کە هابرماز لە بزوتنەوەکەدا دەیویست بیخاتە ڕوو لەپێناو زیاتر ئەقلانیکردنی ئامانج و تاکیك و فۆرمەکانی جولانەوەکە..

بۆ زیاتر زانیاری:

Habermas :Frank Schubert, Andreas Gohr-
und die RAF.

Was heißt kritische :Heide Berndt -
Theorie der Gesellschaft heute? keine
Laudatio auf den kritischen Theoretiker
Jürgen Habermas.

ئێمە باسمان لەدوو مەسەلەی گرنگ کرد، یەکێکیان چەمکی نەوەکان و پابەندمان کرد بە چوارچێوەیەکی زەمەنی ناوەکی و دەرەکی و جەستەیی مێژوویی و فیکری نەوەیەك، وبەدیاریکراوی قسان بکەم، پابەندمان کرد بەچەمکی شوناسەو تایتلی نەوەیەك لەنەوەکان و گوتمان دەشێت بیروڕایەکی سیاسی یاوەکو ڕێڕەوی فەلسەفی ببێت مۆرکی نەوەیەك، بۆ نموونە هابرماز بە نەوەی دووهەمی قوتابخانەی فرانکفۆرت لەقەڵمدەدرێت، هەروەها شتێك بە ووردی باسمان لەبزوتنەوەی ١٩٦٨ کرد لەفەرەنسا و لەئەڵمانیادا، باسمان لە فۆرم کرد و گوتمان کەفۆرمەکان لەزۆر کردەی کۆمەلایەتیدا ڕێگەباریك و پێچاوپێچەکانی جەوهەرێکی نوستوون و گەیشتن بە ناوەڕۆك و جەوهەر ، گەیشتنە بە جیهانبینیەکان. گەر فۆرمەکان وەك شێوە وەرگرین (گشتاڵت ) لە پرۆسەی سایکۆلۆژی دەرکپێکردنی شتەکاندا ڕاڤەبکەین، دەتوانین بڵێین، کە دەرکردنی فۆرمەکان و شێوەکان ڕێگەی ڕاستەقینەن بۆ گەیشتن بە ناوەڕۆکی شتەکان، ڕێگەیەکن بۆ بینین و تێگەیشتن لەبابەت و کێشەکان. لەدیدێکی فەلسەفی وفیکریەوە دەتوانین گەیشتنە بە جەوهەری هەقیقەت، بە بوونێکی نوستووی دەرکپێنەکراو. بەدیویێکی دیکەدا فۆرمەکان تەعبیرن لەو جەوهەرە نوستوانەی کەهێشتا هۆشمەندی بەروونی و دیاریکراوی دەرکی پێنەکردووە و تێپەڕ بوونی بەئەزمونی خۆی کەلەهەندێك کاتدا لە (کردەی پەرچەکردارە توندو تیژەکاندا) خۆی بەرجەستە دەکات، ئەزمونێکن، ئەگەر کردەی هوشیاری و باگراوندێکی ڕۆشنبیری هاوتەریب لەگەڵ پرۆسەی ئەزمونەکاندا چەند نێزێکی تیۆری لەگەڵیدا خۆی درێژ نەکاتەوە ، ئەوا گەرەلاوژەکان لە گەڵ پرسیاری ئەمنی دەوڵەتیدا و بەکارهێنانی هۆکارەکانی ئاسایشی گشتی کۆمەڵگە خامۆش دەبێتەوە!. لەلایەکی دیکەوە هاوتەریب بوونی بیروڕاو جیهانبینی و دژە بیروڕاو تێزی جۆراوجۆر، دەبێتە بەشێك لەپرۆسەی بەمێژووبوونی گەرەلاوژەکان، گەرەلاوژەش لەفۆرمێکی دیکەدا کاردەکات، خامۆش دەبێت وەك کردەیەکی دیارو جولاو ، بەلام دەبنە لێکدانەوە و ڕاڤە و بیروڕای دژبەیەك، لەوەش گرنگتر ئەوەیە، کەش و هەوای نوێ دەهێنێتە کایەوە، تێدا بیروڕای نوێ و ڕیفۆرمی نوێی و کردەی نوێ بەرهەم دێنێت، نەوەکان دەخاتە بەردەم پرسیاری مێژوویی خۆیانەوە..

(شۆڕشێکی ڕووکەش) یاخود (شێوە شۆڕش) بەسوود وەگرتن لە تێزەکانی هابرماز، دەکرێت بکرێت بەتەوەرەیەکی کراوە و زۆر تێزی ڕەخنەگرانە هەڵبگرێت، دەشێت پێناسە و خۆپێناسەی دیکە هەڵبگرێت، وەك میتۆدێکی شیکاری زۆر دیاردەی گرنگی کۆمەڵگەی کوردی و جوڵانەوەکانی بخەینە بەر تیرۆژە تیشکی ڕاڤە و گفتوگۆ. من پێموایە، (بێگومان بەسوود وەرگرتن لە هابرماز)، کە شۆڕشی ڕووکەش ئەو شۆڕش و

شۆڕشۆچکە و جولاّنەوانەن کە تەنها لە فۆرمدا دەسوڕێنەوە و ناگەنە هەقیەقەت و جەوهەری مەسەلەکان. یاخود ئەو شۆڕشانەن کە فۆرمەکان دەگۆڕن، شێوەیەك لەدەسەلاّت دەگۆڕن بە دەسەلاّتێکی دیکە، بەلاّم هیچ گۆڕانێکی ناوەکی و جەوهەری ڕوونادات، یاخود دەتوانرێت ئاوەهاش لە پڕۆسەی ڕیفۆرمەکان تێبگەین، کەلێرە و لەوێ گروپە و کوتلە حیزبیەکان بانگەشەی بۆ دەکەن، گەر نەتوانن گۆرانی جەوهەری بەئەنجام بگەیەنن ، ئەوا جگەلە دووبارە دابەشکردنەوەی دەسەلاّت نەبێت هیچی دیکە نابێت .. بەدیویکی دیکەدا دەتوانم بلّیم کە فۆرمەکان لەم بارانەی باسم لێوەکردن ناگەنە ئاستی (فۆرمێکی بالاّ) کە تێدا بیروڕاکان چەکەر بکەن و پێبگەن و جیهانبینیەکان ببنە تێزی سیاسی و فیکری و کۆمەلاّیەتی . بەپێچەوانەی ئەمەوە کاتێك فۆرمەکان دەبنە کولتورێك بۆ سیاسەت و بزواتەکان، ئەوا جیهانبینیەکان و پێناسەکان ئاشکراتر و ڕوونتر داواکاری و ئامانج و تاکیکەکانیان دیاری دەکەن.

شۆڕشێکی ڕووکەش دەکرێت وەك تێکەلّکردنێکی نێوان (سۆمبۆل و واقیع) و خەیالّ و جیهان پێناسەبکرێت، ئەوەشی لەنێو وەهمەکانی ئەم شۆڕشە ڕووکەشانەدا هەلّدەسوڕێن ، ئەو شۆڕشگێرانەن کە بە (شۆڕشگێری ڕۆمانسی ) ناویان دەبەم. پێمووایە هەموو یەکێك لە ئێمە لەقۆناغێکی تەمەنیدا (شۆڕشگێڕێکی ڕۆمانسی ) بووە، بەلاّم ئەمە قۆناغێکی سەرسامبوونە و قۆناغی داهاتوو دەبێت (قۆناغی خوێندنەوە) بێت، قۆناغی تێگەیشتن و جیهانبینی و ڕەخنەی زانستی بێت. ئەوەی تێکەلّکردنی نێوان سۆمبۆل و واقع بووە لەکۆمەلّگەی ئێمەدا، بەشێکی زۆری سالاّنی حەفتاکان و هەشتاکان و تاوەکو نەوەدەکانی ئێمەی داگیرکردبوو، دیارە حزبی کوردی تاوەکو پڕوپاگەندەکانی ئەمڕۆی هەلّبژاردن، لەکاتی پێویستیدا ئەو فیگورە (شۆڕشگێڕی ڕۆمانسی ) یە وەئاگادێنێتەوە و کاری لەسەر دەکات، بینیمان چۆن حزبی کوردی (بێژەرە حەماسیەکان ) لەوسەری دنیاوە بانگهێشت دەکات بۆ ئەوەی لەکاتی هەلّبژاردندا ئەو فیگورە ( شۆڕشگێڕە ڕۆمانسیە) زیندووبکەنەوە ، ئەوەی گوێی لەو تێکستە حەماسیە بووایە هەستی دەکرد کەشەڕێك هەلّگیرساوە و و ئالاّی سەرکەوتن بەسەر هەموو پانتایی جوگرافیای زەوی دوژمندا هەلّکراوە، بەلاّم لەواقیعدا گەڕانەوەی سەردەمی پێشمەرگەیەکە، کەدەمێك لەمۆزەخانەکانی بیروکراتیەت و گەندەلّیدالەبیرکراون. دەکرێت بلّێین داینەمۆی پابەستبوونی جەماوەر بە دەسەلاّتی کوردیەوە، بەشێکی زۆری دەگەڕێتەوە بۆ جولاّندنەوە ئەو هێزە سۆمبۆلیە خەیالّیەیە کە لەنەستی ئێمەدا درێژبوونەوەی هەیە. ئیدی تەوقەیەکی جۆرج بۆش و گوتەیەکی دەربارەی کورد وەك بڕیارێك تەفسیر دەکرێت نەك وەك موجامەلەیەکی دبلۆماسی،دەرکەوتنی سەرکردەیەك لەسەر جادەی کۆشکی سپی و قسەکردنی لەبەردەم کۆشکی سپی بۆتەنها یەك کامێرای تەلفیزۆنێکی لۆکالّی حزبی، دەبێتە خۆراکی میدیا و تاوەکو ئێستاش لەپڕوپاگەندەی لیستی دووحزبە دەسەلاّتدارەکەی کوردستاندا زیندووکردنەوەی ئەو (شۆڕشگێڕە

ڕۆمانسیە) ڕۆڵێکی سێنترالی دەبینێت. بەڵام دەبێت ئەوەش بڵێین سیاسەتی تەنها جولانەوەی ئەو (ڕۆمانسیەتە شۆڕگێڕانەیە) و وێنەخوازیە، ووردە ووردە لەبەردەم واقعی تالی قەیرانی دیموکراسی و ناعەدالەتی کۆمەڵایەتی و گەندەڵی سەرانسەری ئیداریدا، ڕەونەقی خۆی وندەکات.

تێکەڵکردنی نێوان (سۆمبوڵ و ژیان) و (خەون و ژیان) ڕەگەزێکی بنچینەیی پێکهاتەی بیرکردنەوەی (شۆڕشگێری ڕۆمانسی)ین. بەداخەوە شۆڕشی ئێمە بەشێکی زۆری لەوخولگەیەدا سوڕاوەتەوە میکانیزمی کارکردن ئەوەندەی لەسەر (جۆش و خرۆشی شۆڕشگێری) بووە، ئەوەندە لەسەر بنەماکانی ستراتیژی دوورودرێژ و بەرنامەی کۆمەڵایەتی نەبووە. دەتوانم بڵێم ئێستا پاشماوەی ئەو شۆڕشگێرە ڕۆمانسیانە کەدنیای سۆمبوڵ و دنیای واقیع و ڕیالستی تێکەڵ دەکەن. تاوەکو ئێستا لەکولتوری چەپی دنیادا ماوەتەوە.

هابرماز خوێنەکارانی ئاگادار کردەوە لەتێکەڵکردنی (سۆمبوڵ و واقیع)، هەروەها ئاگاداری کردنەوە لە کردەی (وێنەخوازی) و (وێنەبیرکردنەوەیی). لەشەش تێزەکەیدا باسی لە (کاراکتەرێکی قرتەیی یاریخواز) کردووە، بەمانای کاراکتەرێکی یاریخواز بەوێنەکانەوە. بۆ ئەوەی خوێنەر لەم ڕستە گرنگەی هابرماز نێزیك بخەمەوە، دەتوانم باس لە نموونەی ئەو چەپانە بکەین کەتاوەکو ئێستا لە ئەڵمانیا و ئەورووپا خەون بە شەڕی پارتیزانی ناو شارەکانەوە دەبینن. شەڕی شەقامەکان لەلای ئەوان مۆدێلێکی سەرەکییە بۆ تێکشکاندنی کاپیتالزم. لەگەڵ ئێستا مۆدەیەکی تەواوی جل وبەرگ و ژیان و مۆسیقا و شێوازی گەمەکردنی خۆیانن بەمانای ستایلێکی تایبەتی بەخۆیان. وێنەیەکی خۆیان هەیە کەکاراکتەری خۆیانی لەسەر بنیادەنێن لەئەورووپادا خاوەنی قاوەخانە و بار و دیسکۆ و مۆدەی جلی تایبەتی و ئاراستەکانی لەو قالبی مۆدەیەدا ماونەتەوە و جارجارە لە خۆپیشاندانی دژ بەگلۆبالیزم دەردەکەون و کاری توندوتیژی لە ئەنجام دەدەن. بەڵام ئەمانە وەك پاشماوەیەکی کەشو هەوای ١٩٦٨ و کولتوری چەپ ماونەتەوە و ئەمڕۆ نەبوونەتە مەترسیەك لەسەر دەوڵەت. هەمان شێوەش گەر ئێمە سەیری چەپی کوردی بکەین و گوێیان لێبگرین تەنها بەرهەمهێنەوەی ئەو تێزانەن کە لە ١٩١٧ وە بەبەتۆری ماونەتەوە. لەهەمانکاتیشدا وێنەکانی شۆڕشی سۆڤیەتی هێشتا بەرهەمهێنی ئەو چەپەیە کە یەکێکی وەك لینین بە (چەپڕەوی منداڵانەی) لەقەڵەمداوە. ئەمانەش وێنە لە بزووتنەوە دێرینەکانی کۆمەنیستی قەرزدەکەن. کەخۆیان لەقەیران و هەڵوەشاندنەوەدان. بەشێوەیەك، کەچیتی خوێندنەوەیەك نەبێت بۆ ئەزموونەکانی بزواتی چەپ و نشوستی چەپ و کولتوری تایبەت بەخۆی. بەپێچەوانەی ئەمەوە چەپێکی دیکە هەیە هەوڵدەدات جارێکی دیکە شوێنای خۆی لەدنیاو ڕووداوەکان دیاری بکاتەوە، ڕەخنەلەخۆی بگرێت و خۆی ڕێك بخاتەوە و خۆی لەو ڕۆمانسیەتە شۆڕشگێڕیە قوتاربکات بۆ دنیای ڕیالستی و

زۆرانبازیەکانی، دنیا لەپێش وێنە و سۆمبۆلەکانەوە ببینێت. ئەوەی ئەمڕۆ سەرنجێکی دوا هەڵبژاردنی ئەڵمانیا بدات، دەبینێت کە (چەپی ئەڵمانی) بەبەشداریکردنی لەهەڵبژاردندا و سەرکەوتنی و بەدەستهێنانی چەندەها کورسی لە پەرلەماندا، نمونەیەکی دیکەی چەپێ بەجیاواز لەو فۆرمە تەوباوایەی کەهەبیوو. ئێستاش لەدوا کۆنفرانسیاندا هەوڵی بیناکردنەوەی کلێشەیەکی کۆمەڵایەتی و سیاسیێ بۆ چەپ کەلەگەڵ ڕۆحی سەردەمدا بگونجێت. لەگەڵ یاسای باج و یاری هەڵبژاردن و دەستوردا گەمەی خۆی بکات. چیدی ئەم چەپە (وێنەخواز / ڤرتوێل) نیە بەقەد هێندەی خودێکی بێرکەرەوەیە لەجیهان.

هەروەها لەنێو ڕیزی ئیسلامیەکاندا ئەو (موجاهیدە ڕۆمانسیانە) دەبینێن، کەدەیانەوێت دنیای پۆست مۆدێرن بەحوکمی کلاشینکۆف و جیهادی تەقلیدی بهێنتە ژێر کۆنترۆڵەوە، ئیدی شەڕواڵی ئەفغانی و ڕیشی درێژ و حیجابی فوندەمێنتاڵ و خواستنی وێنەکانی ئەفغانستان، ستایل و وێنەزەدی و وێنەخوازی ئەو گروپانەن... بەم شێوەیە ژیان لەنێو وێنەکاندا، لەنێو سۆمبۆلەکاندا و دەرنەچوون لەبازنەی ئەو سۆمبۆلانە، ئەو (کاراکتەرە ڤیرتوێلە یارکارەیە) کە هابرماز لەبزوتنەوەی ١٩٦٨ دا باسی لێوە کردووە..

مانەوە لەنێو فۆرمدا و قەتیس بوون لەنێو فۆرمێکی تایبەتدا و کاراکتەری وێنەخوازی و شۆڕشگێڕی ڕۆمانسیانە ، ئەو مەترسیانەن کە گەڕەلاوژە کان لەیەك فۆرمدا قەتیسدەکات و بەکوژانەوەی گەڕەلاوژەکان، تەمەنیان کۆتایی پێدێت. ئەم مەترسیانە دەشێت هەمیشە لەبەرچاوبگیرێت لەکاتی پێکهاتنی (گروپەی فشار) یاخود (خۆپیشاندان) یاوەکو (پەرلەمانەکانی سەرجادە). بەمانایەکی دیکە کەوتنە نێو ئەو چاڵانەوە، تەمەن کورتکردنی ئەو بزاواتانەیە و دەیخاتە نێو کۆلانێکی تەسکەوە کە بەڕازیکردنێکی نیوەچڵی یاخود بە بەرپەرچدانەوەیەکی دەزگاکانی پۆلیسی دەوڵەتی کۆتایی پێدێت..بەشێوەیەکی دیکە بڵێم دەرچوون لە فۆرمی نارەزایی و گەڕەلاوژە و خۆپیشاندان بۆ نێو فۆرمێکی دیکە کە جەوهەر ئامێز بێت ، ڕەنگدانەوەی جەوهەرێکی تایبەت و جیهانبینی بێت و بەرنامەڕێژ بێت، ئەوا گەڕەلاوژەکان دەبنە پێچی مێژوویی نەوەکان و سەرەتای لەفکردنی هەموو پرسینبە مۆراڵی و زمانەوانی و ئەخلاقیەکانی کۆمەڵگەیە و پێکهێنەری کەش و هەوایەکی نوێیە بۆ مۆدێرنیزەکردن و دیموکراسیزەکردنی کۆمەڵگە.

لە(شۆڕشی ڕووکەشدا) هەموو کردەکان لە بازنەی فۆرم و ڕووبەری دیاردەکاندا دەوستێتەوە، هەموو هەوڵدانەکانیش گیرسانەوەیەکە بە ڕووبەری واقعیکی هەبوو، کەشۆڕش یاوەکو خۆپیشاندان و یاوەکو بزوتنەوەکە لەجەوهەردا گۆڕانی بەسەردا نەهێناوە. نمونەی ئەزمونی کوردی لەگەڵ بەعسیزم و کولتوری بەعسدا نمونەیەکی زیندووە، قەیرانی نێوان هاوکێشەی شۆڕشی کوردی و کولتوری بەعس هێشتا بابەتێکی

ئێستاکییە، بابەتی چەندەها لێکۆڵینەوە و تیژی ڕەخنەیی بەپێزە ، ئەوەی سەیری واقیعی کوردی ئێستاکیّ بکات و خوێندنەوەیەکیووردی هەبێت بۆ کولتوری بەعس ، دووری ئەو قەیرانەی بۆ ئاشکرا دەبێت کەلەنێوان شۆڕش و بەعسیزمدا درێژ بوونەوەی هەیە. (شۆڕشی ڕووکەشی ) کوردی نەیتوانیوە کولتوری بەعس لە ژیانی ڕۆژانە و مومارەسەی ئیداریدا ڕیشەکێش بکات ، نەك هەر ئەوە بەڵکو خۆی بەشەرمنیەوە درێژ بوونەوەی ئەو کولتورەیە..

## ١١

ئاوڕدانەویەك لە مانگرتنەکانی ١٩٨٢ ی خوێندکارانی زانکۆ و قوتابیانی ئامادەیی وناوەندیەکان* ،ئەزمونێکی تایبەتمان پێشکەشدەکات لەمەڕ بەریەکەوتنی نێوان خەون و واقیع ، یاخود سۆمبۆل و ژیان، لەنێوان ئەم دووانەییەدا ، چەندەها فیگوری (شۆڕشگێری ڕۆمانسی) بەرهەمهاتن و لەهەمانکاتیشدا لەنێو زیندانەکاندا وندەبوون و لەناودەبران.. لەهەشتاودوودا، بەڕێزان، سوستێمی خوێندن لەعەرەبیکردنەوە بیگرە تاوەکو بەزۆرکردنە بە (تەلایع و فتوە و جەیش شەعبی ) و مەشقی سەربازی و سەرەتاتکێی حزبیە بەعسیەکان بۆ نێو قوتابخانە و ئامادەییەکان و تۆقاندن و چالاکردنی (ئیتحاد تەلەبە) و بەبەعسیکردن، ئەو فاکتەرانە بوون کەلەپشت ئەو مانگرتنانەوە وەستابوون، لەپڕێکدا لەسەرانسەری کوردستاندا مانگرتنەکان پەرەیان سەند و ئیدی سەرەتا کورسی پۆلەکان و تەختەڕەش دەشکێنراو پەنجەرە هارەی لێدەهات ، پاشان وێنەی سەدام دا دەگیراو هەمووان ڕاماندەکردە سەرجادە و هاوارمان دەکرد (بڕوخیّ بەعسی فاشی ، بەخۆی و تولە و جاشی ) و (چیتان دەوێت کوردەکان ..ئازادی بۆ کوردستان و تۆپ تۆپ تەیارە ..دەرمان ناکات لەم شارە) ئەمە و چەندەها دروشمی قەبەی دیکە، کەزۆربەی بۆئێمەی قوتابی نادیار و ناتەبابوون، ئێمە لەشاری خۆمان بووین و تۆپیشیان نەنابوو پێمانەوە، نەماندەزانی فاشیەت چیە و ڕقیشمان لەجاش بوو!!، ئیدی لەنێو ئەو هەموو نادیارەدا ، لەهەستکردنێکەوە بەچەوسانەوە هەڵدەڕژاینە سەرجادەکان، تۆپەڵەیەك بووین لە تورە بوون نەك تەنها لە بەعس، لەڕاستیدا ئێمە نەماندەزانی چیماندەوێت، نەك هەر ئێمە لەو زەمەنەدا نەماندەزانی، بەڵکو سەرکردایەتی شۆڕشی کوردیش بەتەواوەتی نەیاندەزانی چی دەوێت ،(سەیری بەشی دووهەمی بیرەوەریەکانی نەوشیران موستەفا بکە لەمەڕ گفتوگۆی نێوان حکومەتی سەدام و شۆڕش ). بەهەر حاڵ ئێمە لەنێو کۆمەڵێك وێنەی خوازراوی دەرەوەی ژیانی خۆمانەوە هەڵدەسوڕاین و ئەوەی کە ئێمەی هاندەدا ئەو بێژەرە حەماسیانە بوون لە شاخەوە هاواریان دەرکرد،لەلایەکی دیکەوە

ئەم مانگرتنانە هێزێکی چەپێندراوی سێکسواڵیانەش هانیدەدا، خۆشترین کاپیتاڵیش لەم مانگرتنە خوێناویانەدا ئەو تێکەڵبوونەوەی کوڕ و کچانە بوو، کەمانگرتن بووە شایەکی خوێناوی و دەرچوون لە نەریتە چەپێندراوەکانی کۆمەڵگە، هەروەها خۆی لەخۆیدا دەرچوون بوو لە کەش وهەوای خنکێنەری سوستێمی پەروردە و مامۆستا تەقلیدی و چاکەت کۆنەکانی موعزە و نەسیحەت !! ، لەهەمانکاتیشدا هەستکردن بەچەوساندنەوە و زوڵمی بەعس ئەو نیشانەیە بوو کەدەبووایە بیپێکین ، زۆری نەدەخایەند بەخوێنرژان و گرتن و تەقە و هەرا و ڕاکەڕاکە کۆتایی پێدەهات... لە ١٩٨٢ دا ئێمەی قوتابیان هەمووان پەست بووین لە سوستێمی پەروەردە، پەست بووین لەهەژاری ، پەست بووین لە چەپاندن و نەریتەکان، پەست بووین لە بێ کارەبایی و بێ ئاویی..هتد، بەڵام ئەمانە هەمووی لەمیکانزمی بەرگری دژی داگیرکەری بەعسیدا خۆی گرمۆڵەکردبۆوە ، بەعس ئەو عەلاگە جلە بوو کە پەستیە کۆمەڵایەتی وسێکسواڵیەکانی خۆمان پێداهەڵدەواسی، کەسمان باسمان لەوە نەدەکرد کە قوتابخانەکانمان عەلادینە شکاوی تێدا نیە، ئاودەستەکان تاوەکو ڕادەی بۆگەنی پیس بوون، تێکەڵبوونی نێوان کیژان و کوڕان قەغەبوو، پڕۆگرامی خوێندن و سوستێمی نمرە دابەشکردن و ئاوتۆریتێتی (دەسەڵاتگەری ) مامۆستا گەیشتبووە ئاستێکی دیکتاتۆری ترسناك، زللەلێدان و شەق هاویشتن و تێهەڵدان و دەرکردن لە قوتابخانە پیشەی ئەو مامۆستایانەش بوون کە خۆیان لەهەمووان زیاتر بەکوردپەروەر تێدەگەیشت، سەیر لەوەدابوو جەهەنەم لەسەر لەپی دەستمان بوو ، کەچی ئێمە لەدەرەوەی قوتابخانەدا بەردمان تێدەگرت.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی وێنەخەیاڵخوازیەکانی کە ئێزگەکان دەیانبەخشی بەئێمە، وێنەی قارەمان و پاڵەوانی نیشتمان و شێرەکوڕ و هەڵۆکان و نەرەکانیان ، ئەمانە هەمووی (کاراکتەرێکی ڤیرتوێلی یارکەری)، بەتەعبیری هابرماز ، پێدەبەخشین. ئیدی جادەکانمان لێدەبووە بەرەکانی شەڕ و پێکدادان ، ئێمەی شۆڕشگێڕی ڕۆمانسی شەڕمان بۆ کوردایەتیەك دەکرد کەنەماندەزانی چیە و چۆنە و بەتەواوەتیش نەماندەزانی چیماندەوێت.. دیارە ئەم مانگرتنە (ڕووکەشیانە) تەنها بە مانگرتن مانەوە و لەوانەشە کاریگەریان هەبووبێت بۆ سەر دەسەڵاتی بەعس، بەڵام کاریگەریەکی کورت و کەمخایەن و بێ پاشماوەی قوڵ بوو.

تەواوکردنی ئەم ئەزمونە لە ١٩٨٤ دا بوو، کەخوێندکارانی زانکۆی سەلاحەدین بڕیاریاندا لەدژی بە(جەیشی شەعبی ) کردن و میلیتاریزەکردنی ژیانی زانکۆ مان بگرن،ئەوان وێنەی شۆڕشێکی ڕاستەقینە و خاوەن ستراتیژیان لە هزردا بوو، وێنەیەك بۆ شۆڕش کەتەنها لە ئەدەبیاتی نوسراوی کولتوری سیاسی ئەو زەمەنە و کەش و هەوای ئەو سەردەمەدا لەزۆر شوێنی دنیادا بوونی هەبوو ، بەڵام لەلای ئێمە تێکەڵەیەکی سەیری ئایدۆلۆژی و سیاسی بوو، لەسەر زەوی واقیعیش فاکتەری خێڵ و

تەحالوفاتی ناوچەکە لە پشت هەموو هێزەکانەوە یاریان بەقەدەری شۆڕش دەکرد ، شۆڕشێکی قەدەریی بوو وەك لەوەی ئیرادەرگەریانە بێت.. بەلام ئەو هاوکێشەیە لەهزری خوێندکاراندا نەبوو، خوێندنەوەیەك نەبوو ، بەقەد هێندەی (وێنەیەکی ڤرتوێلی ) کە (کاراکتەرێکی فانتازی ئامێزی یاریکار) ی پێدەبەخشین ، لەو بازنەی شێوە بیرکردنەوەیەکەدا، خوێندکارانی زانکۆ بڕیاریاندا بەشداری تاقیکردنەوەکانی کۆتایی سالْ نەکەن. دیارە دەبێت ئەوەش بلێین ، کەلەنێو ڕیزەکانی خوێندکارانی ئەو زەمەنەدا هوشیاریەکی بالا بوونی هەبوو، بەلام بەشێکی زۆری خوێندکاران لەو (ڕۆمانسیە شۆڕشگێڕانە) بوون ، کەتەنها لە فۆرمێکی هەژەیـــدا (حەماس) قەتیس بوون بوون، تاکە تێز کەبالا دەست بوو ، تێزی ئیدۆلۆژی مارکسی لینینیەتێکی دۆگمایی بوو، پابەست بوو بەو ئەدەبیاتەی کە لەلایەکەوە (کۆمەلەی ڕەنجدەرانی کوردستان) و لەلایەکی دیکەوە ( حزبی شیوعی ئێراقی ) بەرهەمی هێنابوو، ئەمانەش ئەو تێکستانە بوون لەتوێژالی ماتریالزمی دیالەکتیك و زۆرانبازی چینەکان و ئەلقە ڕۆشنبیریە ئیدۆلۆژیەکانی نێو حزب نەبێت ، هیچی دیکە نەبوو.. لەژێر کاریگەری ئەو وێنانە مانگرتنەکان بەڕێوە دەچوو. خوێندکاران بەهەردوو جۆرەکەیەوە، (شۆڕشگێڕە ڕۆمانسیەکان) کە لە مارکسیتەکان پێك هاتبوون و جۆری دووهەم (وێنەخوازەکانی پێشمەرگە و جەنگاوەری پارتیزان ) کەلەوانە پێکهاتبوون وێنەکانی قارەمانێتی زالْ بوون بەسەریاندا، زۆر زوو تووشی نوشستی و شۆکی گەورە هاتن ، کاتێك نوێنەرکانیان چوون بۆ (سورداش) و زۆر بەئاسانی پێیانگووتن: ئێمە ئێستا لەگەلْ حکومەتدا لە دانوستاندایین و بچن جەیش شەعبیەکەتان بکەن.. ئەم ڕەتکردنەوەیە ئەو وێنانەی بەتەواوەتی شێواند کە مانگرتنەکان خۆیان لەسەر بیناکردبوو.

خراپترین موسیبەت بۆ (شۆڕشگێڕی ڕۆمانسی)، شکاندنی ئەو بالاخانە شوشەییە کە (وێنە و سۆمبۆلەکان) لە کۆنەست، یاوەکو لەنەستی تاکەکەسیدا بینای کردووە. ئیدی ئەم مانگرتنانە بە خامۆش بوونەوەیەکی ئێجگاری کۆتایی پێهات، لەدوای ئەوە ئیدی تاوەکو سەردەمی دوای ڕاپەڕین مانگرتنی ئاوەها ڕووینەدایەوە...

دیارە نەك تاوەکو ئێستا خوێندنەوەی سۆسیۆلۆژی و فیکری بۆ ئەو دیاردە کۆمەلایەتی وسیاسیە نەکراوە، بەلکو تەنانەت لەنێو ئەدەبیاتی حزبیشدا خوێندنەوەی سیاسی بۆ نەکراوە. من پێموایە ئەم مانگرتنانە لەڕووی کولتوری سیاسیەوە، فۆرمێکی ڕەتکردنەوەی بەعس بوون لەگەڕانیدا بەدوای میتۆدێکی دیکەی بەرگریدا، بەجیا لە شەڕی چەکداری !!، گەر هاتبا ئەو مانگرتنانە خاوەنی تیۆرە و تێزی خۆیان بوونایە، ئەوا دەیتوانی ڕووبەرێکی فراونی بگرێتە خۆ و تەنها لەنێو توێژی قوتابیاندا سوری نەدەخوارد و ئاوەهاش بەئاسانی لەلایەن حزبی کوردیەوە کۆنترۆلْ نەدەکرا. ئەمە جگەلەوەی میتۆدێکی دیکەی دادەهێنا کەتاوەکو ئەو زەمەنە بەکورد نامۆ بوون ، ئەویش میتۆدی ئیفلیجکردنی ژیانی حکومی بیروکرات و دیکتاتۆر

بوو، لەرێگەی خۆپیشاندان و دوکان داخستن، کەئەمەش شان بەشانی مانگرتنەکانی هەشتاو دوو بۆ پشتگیری لە قوتابیان وخوێندکاران کاسبکاران ئەنجامیاندا، ئەمە ئەزمونێکی گرنگ بوو لەدوورکەوتنەوەی میتۆدی شەڕی چەکدارانە و داهێنانی میتۆدی شەڕێکی دیکە بوو کە تێدا چەك ڕۆڵی گرنگی گەورەی نەدەبینی، ئەمەش ترسێکی گەورە بوو لەلێسەندنەوەی سەرکردایەتی لەجەنگاوەران و سەکردایەتی تەقلیدی، بەمانایەکی دیکە، لەدەستدانی کۆونترۆڵ بوو لە گۆڕەپانێکدا زیاتر فیکری سیاسی ڕۆڵی خۆی تێدا دەبینی نەك تەحالوفاتی خێڵەکی. خەم ساردی یاخود تێنەگەیشتن یاوەکو دەست ئەنقەستی بوو؟!، مانگرتنەکانی خوێندکارانی بەرەو تولە ڕێگا پێچاوپێچەکانی شاخ بردەوە، ئەو تولەڕێگایانەی ڕێگر بوون لەبەردەم کولتوری (شار) و (بەشاریـبوون) و لەبەرامبەریدا (هێزی خێڵ) زیاتر بالادەست کرد ، کولتوری خێڵیشی تاوەکو ڕۆژی ئەمڕۆ درێژ کردەوە. لەرووییەکی دیکەوە، ئەم ئەزمونە یەکەمین درز بوو لەنێوان شۆڕشگێڕەکانی شاخ و خوێندکارانی زانکۆدا، لەنێوان وێنەخوازراوەکان و دەم و چاوی ڕاستەقینەی شۆڕش، لەنێوان ڕەمز و دنیای ڕیالدا ، لەنێوان ڕۆمانسیەتی شۆڕشگێڕی و شۆڕش خۆیدا ، کەپڕی بوو لەتەحالوفات لەگەڵ دەزگا ئەمنی و عەسکەریەکانی دراوسێ و ناوچەکە. ئەوهاوکێشەیە خەونەکانی نەوەیەکی خەوبینەری شۆڕشگێڕی تێکشکاند، ئیدی لەو ڕۆژەوە بەدوا هیچ مانگرتنێك ڕوویئەدا تاوەکو مێژووی تازەی ئەم چەند ساڵەی دوایی.. ئەم درزە درێژەی مێژووی هەبوو تاوەکو لەزەمەنێکی دیکەدا، خوێندکارانی نەوەیەکی دیکە بەرامبەر شۆڕش بوونەوە، بەلام ئەمجارە چیدی شۆڕشگێڕەکان پێشمەرگە نەمابوون، بەڵکو کۆمەڵێك بیروکرات بوون لەودیوو بیرۆکانیانەوە و لەنێو ئۆتۆمبێلە کەشخە و کۆشکەکانیانەوە دەمارە زیندووەکانی کۆمەڵگەیان کۆنترۆڵ کردبوو، ئەمە جگەلەوەی هەندێکیشیان لەنێو چیرۆکە دزێوەکانی شەڕی ناوخۆ و دەرکەوتنی فایلەکانیاندا ئاشکرا بوون ، هەندێکیشیان بوون بەئەستێرە گەشەی گەندەڵی ئیداری. جارێکی دیکە خوێندکارانی زانکۆ هاتنەوە بەردەم دەسەلات و ئەو درزە دێرینە جارێکی دیکە دەسەلاتی شۆڕش و خوێندکارانی لێکتر دووردەختستەوە... ئەم درزە بەپێواریەوە درێژ بۆوە، تاوەکو ئەوکاتەی خوێندکارانی زانکۆی سلێمانی لەدژی زانکۆی ئایندە مانیان گرت و زانکۆکەیان خستەبەر پرسیاری قورسی ئاوەها کە بەداخستنی کۆتایی پێهات. بەلام بەداخەوە لەدەرگای پشتەوەی زانکۆی سلێمانیەوە خوێندکارانی ئایندە کرانەوە ژوورەوە، ئیدی ئەم مانگرتنە بەڕای من لەگەڵ گرنگی مێژوویی خۆی و نوێنەرایەتی نەوەیەکی نوێ، دەتوانم بە (مانگرتنێکی ڕووکەش) پێناسەی بکەم، فاکتەری گۆڕین تێدا لەسەر ئاستی سفر بوو، ئەوەی گۆڕانکاری تێداکرا تەنها گۆڕان بوو لەفۆرم و شێوەدا، هیچ گۆڕانێکی جەوهەری ڕووینەدا، دیووی دووهەمیشی فاکتەری (سوبێکتیڤ / زاتی / خودگەرایی) هۆشمەندی خوێندکاران بوو، کە هۆشمەندیەکی ڕووکەشی بوو، توێژاڵێك بوو لە مامەڵەی

سیاسیانە نەك جیهانبینییەك و دنیابینیەكی دیكە بۆ زانكۆ و كۆمەڵگە و ژیان. ئەوان باسیان لەداخستنی زانكۆیەكی ئەهلی دەكرد و بازیان بەسەر ئەو هەموو گەندەڵیە دەدا كە زانكۆكانی سلێمانی و هەولێر پێوەی دەناڵێنین، هەر لە پرۆگرامی خوێندنەوە بیگرە تاوەكو مومارەسەی توندوتیژی ئیداری و هەڕەشە لەخوێندكار، تاوەكو دەگاتە لوتژەنینی ڕاستەوخۆی حزبی كوردی لە ژیانی زانكۆیی . ئەمە سەرەڕای ئەم هەموو قبوڵ خاسەی كەلەكولتوری بەعسەوە بە خەستی پیادەكراوە ، تاوەكو ئەو هەموو ماجستێرو دكتۆرایەی كەجەنگاوەران وەریان گرتبوو!!. ئەمانە هەمووی فۆرمولە نەكرابوو، هەژەیبیەك بوو (حەماس) ، تورەبوونێك بوو، زۆر زوو بەچەند ڕازیكردنێكی بچوك دامركایەوە. سەیر لەوەدایە تاوەكو ئەمرۆ هیچ یەكێك لەو دیاردە جەوهەریانە چارەسەر نەكراوە، لەگەڵ ئەوەی بەردەوام بۆڵە بۆڵ هەیە !!. نەك ڕەخنە. گەر ڕەخنەش هەبێت، ئەوا ڕەخنەی كورت و ڕستەی كورتی دابەشبووە بەسەر چاك و خراپ و ڕەش و سپی ، نەك ڕەخنەی شیكاری و دۆكۆمێنتاتسیۆن و ئەرشیفكردنی گەندەڵی واقیعی ترسناكی نێو زانكۆ، كەدەكرێت بەناو و لیستی ئەوانەی بەساختە وەرگیراون و ئەوانەی تەنها لەتاقیكردنەوەكاندا پەیدا دەبن و ئەوانەشی حزب بۆوەرگرتنی بروانامە دەیانێرێت و دەیانكات بە زانكۆدا بەئەنجام بگەیەنرێت، یاخود ئەو هەموو ماڵپەرە بەلاشە هەیە چوار ماڵپەڕی خۆكردمان نەبینی پشتگیری پرۆسەی ئەرشیف بكات، خوێندكاران تەنها بۆڵەیان دێت تاوەكو ئەمرۆ و دوا چالاكیش ڕێگەگرتن بوو لە هاتوچۆكۆدنی ئۆتۆمبێل ، وەك نارەزایی لەمەر باری بەشەناوخۆیەكان!. ئیدی بەم شێوە پچر پچر و نائۆرگانیزەیە، تەنها گەڕەلاوژەیەكە خۆی دووبارە دەكاتەوە و تەنها لەیەك فۆرمی تایبەتدا دەمێنێتەوە، كەدەتوانم بڵێم مێشولەیەك نافرێنێت لە شوێنی خۆی.

بەداخەوە مەترسی ئەوە هەیە كە فۆرمەكانی گەڕەلاوژە ببن بەمۆركی چالاكیەكانی نەوەی نوێیی كوردی و خوێندكارو ڕۆشنبیری لاوی كوردی. ئەمە مەترسیەكە لەبەردەم نەوەی نوێدا خۆی قوتدەكاتەوە، بەشێوەیەك كەژیان تەنها لەنێو فۆرمەكاندا قەتیس بخوات و نەوەیەك داماڵێت لە جەوهەری سیاسی و پرسی بونگەرایی خۆی .

ئەمرۆ شۆڕشگێڕەكان بوون بە بیروكراتە حكومیەكان و خوێندكارانی نەوەی نوێش دێنە سەرجادە وشەقامەكان و دژی گەندەڵی دەوستنەوە.. لەنێوان ئەم دوو مێژووە بیست ساڵ هەیە، مەبەستم ئەوەیە كە مانگرتنی خوێندكاران لەكوردستاندا مێژوویەكی دوورو درێژ و نائۆرگانیزەی هەیە، بێ مێژوو نیە و كاری مناڵەوركە نیە. وەكو هەندێك لێپسراوانی حكومی پێناسەیانكردبوو، بەڵكو لەگەڵ هەموو كەلێنەكانیدا نابێت ئەوە لەبیربكەین ، كەلەنێوان شۆڕشگێڕەكانی دوێنی و بیروكراتە حكومیەكانی ئەمرۆ و خوێندكاراندا، مێژوویەكی گەورە لە ( بەدگومانی ) لەنێوانیاندا درێژ دەبێتەوە، لەبەر ئەوە خەمی دەسەلاتی لۆكالی كوردی هەمیشە پاوانكردنی ئەو كایەیە بووە بە چیرۆك و

ئەفسانەكانى خۆى، ئەمە زياتر لەهوروژمى ليپسراوندا دەبينراكە لەشێوەى بوونيان بەخوێندكارى زانكۆ و بەقبولْ خاسەوە، پاوانى كەش و هەواى زانكۆيان كرد. بەلام بەدگومانى نەك كالْ نەبۆتەوە بەلْكو گەيشتۆتە ئاستى بەرهەمهێنانى (توندوتيژى) لەنێوان ئەم دوو جەمسەردا .

## ١٢

هێشتا شوناسێك هەيە كەنەوەكان لە گەڕەلاوژە و مانگرتنەكانياندا بەدوويدا دەگەڕێن، داواكارى هەيە كە گونجاوە لەگەلْ سەردەمى خۆيان، دەربڕينە لە شوناسى ئەوان وەك نەوەيەك، لەهەمانكاتيشدا هێزێك هەيە ، چ ئەگەر حكومەتى ئێراقى ئەوساكە بوو بێت وەك دەسەلات، ياخود دەسەلاتى بيرۆكراتى ئێستا بێت، ڕێگرە لەبەردەميان وەك نەوەيەكى پێگەيشتوو. تاوێك بەهەرزە و تاوێك بەگێرەشێوێن ناويان دبەن. بەلام ئەمانە هيچى لەم هەقيقەتە ناگۆڕێت كەئێمە لەبەردەم نەوەيەكداين هەستيارە بەرامبەر شۆڤێنيەت و ناعەدالەتى كۆمەلايەتى و گەندەلى ئيدارى و داواى چارەسەرى كێشەكانى دەكات. لەبەرامبەر ئەم نەوەيەدا دەسەلاتێك هەيە سامانى كۆمەلْگە و هەموو كوردستان بەهەدەر دەبات . توێژێك لە خێلى سياسى و مقەڕاتى حزبى جێگەى دەولەت و حكومەت و دەزگاكانى كۆمەلْگەى مەدەنى مۆنۆپۆل كردووە و لەژێر ناوى جياجيادا درێژە بەكەش و هەواى مقەڕاتى حزبى و سەگردە ميليشياكان دەدات، كەئێستا لەبەرگى وەزيرى حكومى و ليپسراوى دەزگاحكوميەكاندا خۆيان گۆڕيوە..

ئێمە باسمان لە (شۆڕشى ڕووكەش) كرد و گووتمان شۆڕشى ڕووكەش تەنها گۆڕينى فۆرمال و شێوەى دياردەكانە و نايەوێت گۆڕانكارى جەوهەرى بەئەنجام بگەيەنێت، تەنها ڕوتوشكردنى دەموچاوێكە و دانانى ماسكێكى نوێيە بۆ دەم وچاوێكى لەيەكچوو، لەهەمانكاتيشدا (شێوەژيان Scheinleben ) جەمسەرێكى ديكەى هاوكێشەى ژيانە لەنێو فۆرمەكانى ژيان نەك ژيان خۆى بەپڕاوپڕى، ژيانێك دوورە لەناوەڕۆكى ژيان خۆى، ژيانێك تەنها لەژێر ناولێناندا بوونى هەيە.

بۆ ئەوەى زياتر چەمكى (ژيانى ڕووكەش) ياخود (شێوە ژيان ) ڕوون بكەمەوە، دەتوانم بلێم چێژەكان لەكۆمەلْگەى سەرمايەداريدا لەڕێگەى شێوازەكانى (گەندەخۆرى ) كەناليزە دەكرێت، ڕوونتر قسان بكەم، دەلێم چێژە ڕاستەقينەكان لە ماترياليى بوونى ژياندا خۆى بەرجەستە دەكات، جۆرێكە لە خووى خراپ كە ڕيكلامى كۆمپانياوكەنالەكانى تەلفيزۆن پڕوپاگەندەى بۆ دەكەن، ئيدى لە جياتى ژيان بەو شێوە ڕاستەقينەيەى كەهەيە كەلەفۆرمەكانى پەيوەنديە هيومانيەكانى نێوان مرۆڤەكانى نێو كۆمەلْگە خۆى دەبينێتەوە، پەيوەنديەكى ديكە پێكدێت كەزياتر

دەستکردە و بەرهەمهێنراوی ژیانی تازەی سەرمایەدارییە. مرۆڤەکان پابەست بە پڕۆدۆکتەکانی کۆمپانیاکان، کۆمپانیاکانیش زیاتر لەڕێگەی سەرنجراکێشی و ڕێگەئاسانی بۆ کڕین خەڵکی وابەستەی ئەو شت ومەکانە دەکەن، چێژ زیاتر لە کڕین و زیاتر کڕین و زیاتر بەدەستهێنانی شت ومەکدا خۆی دەبینییێتەوە، پەیوەندی نێوان مرۆڤ و مرۆڤیش زیاتر ئەبستراك و دوور و بێ مانا و ڕووکەش دەبێت. مرۆڤ لە سوستێمی کاپیتالیستیدا ئەوەندە وابەستەی شت ومەکە ، بەجۆرێك کەناتوانێت ژیان بەبێ شت و مەك مەزندەبکات، دیارە بەشێکی زۆری ئەو شت و مەکانە زیادەن و پێویست نین ، بەقەد ئەوەندەی مەست بوونە بە کڕین کە من لێرەدا بە( خوماری گەندەخۆری ) ناوی دەبەم، مەبەستیشم لەگەندەخۆری ، کڕینی شت مەکێکە کەزیاتر دەچێتە قاڵبی کەمالیات و لۆکسۆسەوە، بۆنمونە لەوانەیە مۆبایل لەهەموو کاتێکدا پێویست نەبێت، مۆبایل بۆ یەکێکە کارێکی گرنگی هەیە و دەشێت قسەی کورت و چڕی پێ بکەیت، گەر مرۆ هەشیبێت دەبێت بزانێت کە هۆشمەندیەك هەیە بۆ بەکارهێنانی مۆبایل،بەمانای ڕستەی کورت و چڕ و بەکارهێنانی لەکاتی پێویستدا، ئایا هەموو کەس ئەوە دەکات؟!!، بێگومان نەخێر، یاخود گرنگ ئەوەیە تەلفۆنی پێ بکەیت و ئیدی پێویست ناکات لەگەڵ هەر مۆدێلێکی تازەدا خوێیا و کەڵکەڵەی ئەوە خومارمان بکات کەهەر دەبێت ئەو مۆدێلە تازەیە بەدەست بهێنین. ئەمە نمونەیەکی بچوکی (خوماری گەندەخۆریە) کە لەکۆمەڵگەی کاپیتالیستدا کەش و هەوای کۆمەڵایەتی داگیر کردووە. مەترسی فیگوری ( خوماری گەندەخۆر) ئەوەیە کە مرۆڤێکە موجەڕەدە لە پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان، تاکرەوێکی گەندەخۆرە ،لەجیاتی ئەوەی تاکرەوکی بیرکەرەوەبێت، داماڵراوە لەژیانی کۆمەڵایەتی . لەژێر کاریگەری بیرمەندانی وەك (مارکۆز و هۆرکهایمەر و ئادۆرنۆ ) و قوتابانەی ڕەخنەیی فرانکفۆرت، بزوتنەوەی ١٩٦٨ دژی (ژیانی ڕووکەش) یاوەکو (شێوە ژیان) چالاکیان نواند، لە کۆنفرەسێکی تایبەت بە کۆمپانیاکانی ڕیکلامە لە شتوتگراد کەلە مای ١٩٦٤ دا دەستپێیکرد، چەند کەسێك لە گروپەك بەنێوی (بەرگری چالاك) کەلەنێویاندا (ڕودی دوتچکە) بەشداربوو ، بەیاننامەیەکیان بەنێو هۆڵەکەدا بلاوکردەوە و ویستیان ڕێوڕەسمی کۆنگرەکە بشوێنن، کەلەدوایدا لەلایەن پۆلیسەوە دەستگیرکران و غەرامەی پارەیان کردن.. ئەو بەیاننامەیە لەدژی ڕیکلامەی کۆمپانیاکان بوو، دژی ئەو (گەندەخۆریە) بوو کەمرۆڤی سانای کۆمەڵگەی پێ هەڵدەخەڵەتێنرا و زیاتر خوماری دەکرد بە شت ومەك کڕینەوە نەك ژیانی ڕاستەقینەی خۆی، دەبێت لەپێناو تێرکردنی ئەو خوماریەی زیاتر کاربکات، لەپێناو ئەوەی مۆدێلێکی دیکەی تازەی ئۆتۆمبێل و تەلفۆن و تەلفیزۆنی هەبێت، بۆ ئەوەی ئەو قەرزانەبداتەوە کەبەردەوام بەسووی بەرز دەیدرێتێ، دەبێت تاوەکو مردن قیستی ئەم کۆمپانیاو ئەوی دیکەبداتەوە. مەترسی پێکهاتەیەکی سایکۆلۆژی کەزۆر جار بە (مرۆڤی تاکرەهەند) ناودەبرێت. مرۆڤێك کۆیلەی شت و مەکە

و زۆر بەئاسانی هەڵدەسوڕێت و یاری پێدەکرێت، لەو بەیاننامەیەی گروپەکەی ڕودی دوتچکە و هاوەڵەکانیدا هاتبوو: خەمی ئێوە ئەوەیە کەمرۆڤەکان زیاتر کاربکەن بۆ ئەوەی زیاتر گەندەخۆر بن، بەجۆرێك کە گەندەخۆری و کارکردن پێکەوە گرێدراوە...
Ulrich, Chaussy: Die drei Leben des Rudi Dutschke. H. Luchterhand Verlag ١٩٨٣, S٤٥.

بەرهەمهێنانی ئەو مرۆڤەی پڕۆدیکتی ڕیکلامەی تەلفیزۆنەکانە، مەترسیەك بوو لەدوای جەنگی جیهانی دووهەمەوە بیرمەندانی قوتابخانەی فرانکفۆرت وەك مەترسیەك دەیانبینی، مەترسی کۆمەڵگەیەك کە بەناوی (کۆمەڵگەی بەرخواردە Konsumgesellschatf) ناوزەدیان کرد، دیارە ئەمە بابەتێکی گرنگە و دەشێت وەك بابەتێکی سەربەخۆ باسی لێوەبکرێت، ئەوەی لێرەدا بۆ ئێمە گرنگە چەمکی (شێوەژیانە) کە مرۆڤێك بەرهەم دێنێت، بە ڕووکەشی ژیاندا خۆی هەڵبواسێت و لەدواجاردا هەموو کاردانەوەکانیشی دوور بێت لە بەردەوامی وچیرە درێژی، بە ڕازیکردنی کەم و کورتخایەن خامۆش بێتەوە، مرۆڤێکە دوورە لەهەموو جەوهەرە هیومانیەکان کەمرۆڤ والێبکات هەستبکات لەچەقی جیهاندایە نەك لەشوێنێکی دیاریکراو، مرۆڤێك شێوە ژیان بەرهەمی دێنێت کەدەیەوێت بگات و بگات ، بەهەر نرخێك بێت و لەسەر شانی هەریەکێك بێت، ئەوەی لەدەرەوەی ئەو ڕوودەدەن گرنگ نیە و پەیوەندیدار نیە پێوەی!، گرنگ نیە گەر ئەو کرێکاربێت لەکۆمپانیایەك یاخود فەرمانبەر گەر هەزار کارمەند دەربکرێن، ئەو ناجوڵێت و هۆشمەندی ئەوەی نیە کە سبەی نۆبەی ئەو دێت، لەبەر ئەوە بەڕێزان سەیر نەبێت لاتان، کەلەئەڵمانیای ئەم ساڵانەی دوایی بەهەزارەها کرێکار و فەرمانبەر دەرکردان بەبێئەوەی هاوەڵەکانیان ئاوڕێکیان لێبدەنەوە، گونتەرگراس لەچاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەنوسیدا گووتی : کرێکارانی سەدەی هەژدە و نۆزدە هوشیارتربوون لە کرێکارانی ساڵانی دووهەزار!!...

(شێوە ژیان) مەترسیەکە لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ئەمریکانیزم وەك ستایلێکی ژیان و شێوازێکی ژیان زیاتر پەرەدەستێنێ کە کۆمەڵگاکان لە کۆمەڵگای مرۆییەوە دەبنە بازاڕی گەورە بەمانایەکی دیکە (بەبازاڕیکردنی کۆمەڵگە) و داماڵینی لە مانا جەوهەریەکانی ..

لەکوردستانی ئێمەدا (شێوەژیان) لە پێکهاتەی بەنێو دووبارە بیناکردنەوەدا خۆیی ئاوێنەیی دەکاتەوە، کە بەشێکی زۆری شێوەخوازیەکی ژیانە بەهەموو دووریەکانیەوە: ئیدی شێوەخوازیەکی شار و ژیانی شاریە، شێوەخوازی دیموکراسیە، شێوەخوازی پرۆسەکانی هەڵبژاردن، شێوەخوازی ژیانی مۆدێرنەیە. ئێمە بەشێوە و ڕووکەش لە (کۆمەڵگەیەکی مەدەنی و سیڤیلین) بەڵام لەڕاستیدا خێڵ و مقەراتی حزبی بەڕێوەمان دەبەن!!، ئێمە ڕۆژنامەمان هەیە بەڵام گەر ئازادی نوسینیش هەبێت ئەوا خوێنەرێکی جیدی دەگمەنە و کاریگەریەکانی لە بازنەیەکی تەسکی پڕوپاگەندەیدایە!!، دادگاو

دادمان هەیە، بەلام سوستمێك نیە بۆ سەربەخۆیی دەسەلاتی داداوەر، خێل و شەریعەت لە شت دادوەرەوە حوکم دەکەن!، ئێمە مۆدێرنین لە ژیانی کۆمەلایەتیماندا کەچی پرۆگرامی خوێندن و یاسا و رێساکان و کەش و هەوای قوتابخانەکانمان و تەنانەت زانکۆ کانیشمان وەك مزگەوتێکی دەماکدار وەهان!، ئێمە باس لەئازادی مرۆڤی کورد دەکەین ،کەچی سوستێمی فەرمانگە و قوتابخانە لەسەر چەپاندن دامەزراوە!!، ئێمە باس لە گلۆبالیزم دەکەین کەچی ئاومان نیە خۆمانی پێ بشۆین و گەر خوێندکارانی زانکۆ مانبگرن لەبەر نەبوونی ئاو، پێیاندەلێن : ئاخر ئێوە کەم خۆتان بشۆن!!.حزبی کوردی بەسەدەها خولی ئینتەرنێت دەکاتەوە کەچی لەگەڕەکی ئەودیوو مقەڕی حزبەوە کارەبا نیە و کێشەی ئاوەکی ودیموکراسی و گەندەلی سیاسی و ئیداری لەئاستێکی ترسانکدایە!! ...ئێمە لەشاردا دەژین بەلام شار گوندێکی گەورەی خێلەدەسەلاتدارەکانە، بەکورتی وبەکوردی هەموو ژیانی ئێمە لەنێو بازنەکانی رووکەشی و شێوەخوازیدا دەسورێتەوە.

لەم کەلێنانەوە لەدژی ئەم (ژیانە رووکەشیە) خۆپیشاندانی کەلار گەشەی سەند و لەگەلێشیدا ئاکرێ و ئێستاش بەردەوام لێرە و لەوێ مانگرتنی خوێندکارانی بەشە ناوخۆیەکان و فەرمانبەران و مامۆستیان توێژەکانی دیکە لەم لاو لەولا بەشەرمنیەوە دەستی پێکردووە، دیارە هێشتا ئەمانە فۆرمی خۆپیشاندان و نارەزایی بۆلەبۆلکارن و هیچیان نەبوونەتە بەرنامەی کار، هیچیان نەبوونەتە (گروپەی فشار) ی بەردەوام، کە لەئەلقەوە تاوەکو یای مروای دوای مەسەلەکان بکەون و دوای چارەسەری کێشەکان بکەون، لەداواکاری زیاتر هیچی دیکەنین، هیچی پرسیار نین لە شەرعیەتی دەسەلات و شێوەی بەرێوەبردنی کۆمەلگە و بەتالان بردنی سامانی نەتەوەیی کوردستان. هیچیان پرسیار نین لەخودی کێشەکان، لەجەوهەری مەسەلەکان، هیچی پرسیار نین لەمەر رەوایەتی سوستێمی بەرێوەبردن وپەروەردە لە کوردستاندا ..بەلام لەگەل ئەمانەشدا ناتوانین بلێین کە ئەم خۆپیشاندان و گەرەلاوژانە گرنگی مێژوویان نیە و لە(خودێکی بێ ئاگا) وە ئەنجامدراون، نەخێر ، خودێکی هوشیارە بە کێشەکانی ، لەفۆرمی ئەزموندایە و ئەبۆتە کاری جەوهەری و بەردەوامیەکی تیۆری و زەمەنی پێگەیشتنی خۆیان پێویستە. گەرەلاوژەکان خاوەنی ئاماژەگەریی خۆیان، بەلام هێشتا لە(فۆرمێکی بالا)دا خۆیان دانەرشتووە، هێشتا کەش و هەوایەك هەیە کەحزبی کوردی رێگرە لەبەردەمیداو خەریکی شێواندنێتی، بۆ نمونە بەکارهێنانی میتۆدی گەرەلاوژە بۆ لێدانی حزبێکی سیاسی دیکە، هەر وەك ئەوەی چۆن بینیمان گەرەلاوژەکاران بە ئۆرگانیزەکراوی مقەراتی (یەکگرتووی ئیسلامیان ) لەمانگی دێسمبەری ٢٠٠٥ دا داخست و ناوچەکانیان لێ پاکژکردنەوە. ئەمە تێکەلکردنێکی وەرەقەکانە و بەکارهێنانی میتۆدێکە کەلەنارەزاییانی کەلار و ئاکرێ و خۆپیشاندەرانی زانکۆی سلێمانی بەکاریان هێنا، بەمانایەکی دیکە، رەدل و بەدەلکردنی میتۆدەکان و رەواخوازیان دەخاتە بەردەم

هەمان پرسیارەوە بەوەی: گەر لەئاگریّ جەماوەری تورە بەنزیخانە بسوتێنیت لەبەر هۆی گرانی و ترسی بیکاربوونی شۆفێرەکان، ئەدی بۆچی لەدهۆك و ناوچەکانی دیکە کەدژ بەمقەڕاتی حزبێك ئاژاوەبنێنەوە، ئەوەمان پیّ قووت نەچێت ؟!!. بەکارهێنانی کەش و هەوای ئۆپۆزیسیۆنی خوێندکاران و خۆپیشاندەرانی دژ بەدەسەلاتی کوردی و بەتایبەت بەکارهێنانی لەپێش هەڵبژاردندا بۆ ئامانجەکانی حزبی کوردی، بەشێکە لەو یاریەی کەدەسەلات وەك میتۆدێك سوودی لێوەردەگرێت..لەبەر ئەم هۆیانە دەسەلات دەتوانێت زیرەکانەتر لە خۆپیشاندەرانی دژ بەخۆی، میتۆدەکان لەوان قەرزبکات ، دەسەلات خاوەنی لوتێکی هەستیارترە لە بەهەند وەرگرتنی ئۆپۆزیسیۆنەکانی، وەك لە ئۆپۆزیسیۆن خۆی .. ئەمانە و زۆری دیکە لەخولگەی پرسیاری جەوهەریدا بوونیان هەیە و هۆشمەندیەکی نوێی پێویستە کەتوانای هەبێت خۆی لەگەڕەلاوژەی نەوەکاندا خۆی فۆرمولەبکاتەوە و لە گەڕەلاوژەوە ببن بەرنامەی کار و کەش وهەوای نویّ ببەخشن بە کۆمەڵگە.

یەکێك لەئامانجی ئەم گوتارە پەرپێدانی ئەو تیۆرە رەخنەییە کە گەڕەلاوژەکان بپارێزێت لە مانەوەیان لە فۆرمی گەڕەلاوژە و خۆپیشاندان، بەڵکو بوونیانە بە(گروپەی فشاری بەردەوام) کەئامانجی لێدانی کوێرانەی دەسەلاتی حزبی کوردی نیە، بەپێچەوانەوە ئامانجی پەرپێدانی دۆزی رەخنەگرتنە لەپێناو زیاتر بەئەقلانیکردنی ژیانی مرۆڤی کوردی و پەرەپێدانی کولتورێکە بۆ سیاسەت و دەرچوون لەبازنەی (شێوە ژیان) بەهەموو دووریەکانیەوە

١٣

یەکێك لە راڤەکردنەکانی ئەم دوایەی پۆلیسی فەرەنسی ئەوەبوو، ترسی حکومەتی فەرەنسی لەم گەڕەلاوژەیەی دوایی پاریس تارادەیەك ترسێکی زێدەڕۆ بوو. پۆلیسی فەرەنسی رای وابوو، راستە هۆکاری کۆمەلایەتی و کێشەی کۆچبەر و نەوەکان بوونی هەیە و دەبێت بە جیدی ئاوڕی لێبدرێتەوە، بەلام ئەمە مانای مەترسی بەردەوامبوونی گەڕەلاوژە نیە، لەبەر هۆیەکی زۆر ئاسان ئەویش ، ئەوەیە کەتاوەکو ئێستا پۆلیس خۆی لەبەردەم کەسانی رابەرێتی و تیۆریکاری (تیۆرەکار) بۆ دەستنیشان نەکراوە کە لەپشت ئەم گەڕەلاوژانەوە رابەرایتی بکەن و تیۆەر و راڤەکار بن بۆ گروپەکان، ئەمەش بەرای پۆلیس ئەو گەڕەلاوژانە تەنها لەچوارچێوەی گەڕەلاوژە و فۆرمی گەڕەلاوژەدا پێناسەدەکات کە توانای خۆئۆرگانیزەکردنی نیە!!، کەنەك مەترسی ، بەڵکو توانای خودناسینی کێشە جەوهەریەکانی خۆی نیە، هۆکاری سەرەکیشی غیابی بونیادێکی یەکگرتوویی خاوەن گوتارێکی تایبەتە..

لەڕابووردشدا ئەو ڕاستیە ئاشکرایە کە نەوەی ١٩٦٨ نەیتوانی بەڕاستەوخۆیی دەسەڵاتی سیاسی بگۆڕێت، بەڵام توانی ژیانی نەوەیەك ئازایانە بکات بەشوناسی خۆی،و کەش و هەوایەکی نوێی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئاوەهای هێنایەگۆڕێ، بەجۆرێك لەهەڵبژاردنەکانی داهاتووی ئەورپادا. ئازادی سێکس و کرانەوەی کۆمەڵایەتی و زەمانەتی کۆمەڵایەتی و دژی میلیتاریزەبوون، ببێت بە دروشمی ئەو پارتانەی کەدەیانەویست لە هەڵبژاردندا سەرکەوتن بەدەست بهێنن. نەك هەر ئەوەندە. بەڵکو توانیان لەڕێگەی گەڕەلاوژەکانیانەوە، هەموو دنیای مۆدێرنە بخەنە بەردەمی پرسیاری گومان و نوێ بوونەوە..

من پێمووایەنەوەی نوێیی کوردی دوای چوارده ساڵ زیاتر دوای ڕاپەڕین ، کەش و هەوای نەوەی بۆ خەملیوە کە لە گەڕەلاوژەوە و بۆڵە بۆڵەوە، ژیانی خۆی بگوازێتەوە بۆ نێو رووبەرێکی ئازادانەتر و ئاسوودەتر، کاتی ئەوە هاتووە (هێڵەگەرمەکانی ) خۆیان ڕابکشێن و شوناسێك ببەخشن بەخۆیان، کاتی ئەوە خەملیوە کە منداڵەکانی شۆڕش داوا لەشۆڕش نەکەن، بەڵکو گومان لەخودی شۆڕش بکەن، بەدگومان بن لە هەموو کۆنزەڤانیڤیەت و کۆنەخوازی گوتاری سیاسی و کۆمەڵایەتی هەبوو ،بەدگومان بن لە هەموو موقەدساتێکی پڕوپاگەندەبۆکراو..

تەواو

سەرچاوەکانی ئەم باسە :


١) Günter Grass: Unkenrufe. Büchergliede Steidl Verlag. ١٩٩٢.

٢) Ulrich, Chaussy: Die drei Leben des Rudi Dutschke. H. Luchterhand Verlag ١٩٨٣.

٣) www.rafinfo.de Frank Schubert, : Andreas Gohr: Habermas und die RAF, ٢٧. Januar ٢٠٠١.

٤) www.studien-von-zeitfragen.net Heide Berndt :: Was heißt kritische Theorie der Gesellschaft heute? keine Laudatio auf den kritischen Theoretiker Jürgen Habermas.

٥) www.titel-forum.de: SZ DISKOTHEK - ١٩٦٨ von Jörg von Bilavsky.

٦) Claus Leggewie, ١٩٦٨ ist Geschichte. Aus Politik und Zeitgeschichte (B ٢٢-٢٣/٢٠٠٢.

٧) Wolfgang Krauschaar/ Jürgen Hrmann: Die Aura der Gewalt. Lettre International ٥٢ Deutsche ausgabe ٢٠٠١

٨) http://www.dhm.de/lemo/html/١٩٦٨/

٩) Eduardo Galeano: Das Buch der Umarmungen. Hammer Verlag ١٩٩١.

١٠) Dominique Vidal: Eine französische Unruhe. Le Monde diplomatique, Dezmber ٢٠٠٥, Deutsche Ausgabe.


فۆتۆ : هابرماز بۆ خوێندکاران دەدوێت

فۆتۆ ٢ دوتچکە لە فێبرواری ١٩٦٨ لە بەرلینی رۆژئاوا بۆ خوێندکارانی زانکۆ دەدوێت.

## بەڵێ و نەخێرە سەختەکانی ڕۆشنبیر

١

یەکێك لەو دەست درێژیانە کە دژە بیرکردنەوەیەکی فرە لایەنی و هەمە ڕوانینە ئەودیە کەلە هەموو سوچێکی ئەم جیهانەوە لێت دەپرسن تۆ لەگەڵ ئەم شەڕەدایت یان دژی ئەم شەڕەیت؟ئیدی تۆ لەژێر جەبری ئەو حەقیقەتە تالانەی بەردەمت خۆت لەبەردەم سەخیف ترین وەلام و هەوێستە دەبینیتەوە کە زۆرجار سەرکەوتوو نابیت لە ڕوونکردنەوەی شوێنای خۆت لەم شەڕەدا بێگومان ئەگەر بتوانیت بەرووی بڕیاردانی خۆتەوە شوێنایەك زەمینەیەك بۆ بەڵێ ونەخێرەکان بدۆزیتەوە ئەم شەڕە تەنها بڕینێکی عێراقی ( عێراقی –کوردی ) یانە هەڵنەداوەتەوە بەڵکو خۆی چەندەها مەسەلەی دیکەش دەهاورژێنن چەندەها مەسەلە لەمەڕ موتەزای وەك ( دیموکراسیەتی جیهان ) و( جیهانی مۆدرێن ) و ئایدۆلۆژیای کۆمۆنیستی و بیرو ڕای ئیسلامیستەکان و چەندەها هەستی پەنگ خواردووی ناسیۆنالستی جۆراوجۆر کەلەم جەنگەدا لە چەندەها ڕێگای جیاوازو تولە ڕێگای باریك لە چەند شوێنێکەوە دەچنەوە سەر شوێنا یان ( پۆزۆسیۆن ) ی ڕەش و سپی شەڕو ئاشتی جەنگ و دژە جەنگ دیکتاتۆر پشتگیرکار و دژە دیکتاتۆر لەم قرەبالغیەدا خۆیان پشتگیر دەکەن بەسەر دوو هەڵوێستەدا بەڵێ و نەخێرەکان لێپرسراویتێکی گەورەیە و بەهەمان پێوانەش تەنگەشەو تەنزگەی هەڵوێست وەرگرتنی مرۆڤە هۆشمەندەکان و ڕۆشنبیرانیش قوڵتر دەکاتەوە هەموو یەکێك چاوەڕێی ئەوەمان لێدەکات بە بەبەڵێ یاوەکو نەخێر وەلامی بدەینەوە هەموو یەکێك دەیەوێت بە بەڵێ ونەخێردکانی ئێمەی کوردو عێراقی هەڵوێستەیەك و جیهان بینیەکی سیاسی یان ئیدۆلۆژی پشتئەستور بکات گرنگ ئەوەیە ئەم جەنگە بۆ هەموو لایەك دووژمنێك دەخولقێنێت بۆ ئەوەی بەرامبەری بوەستین دووژمنێك دەمێکە چاوەڕوان نین بۆ ئەوەی بیرو ڕاکانمان لە خەواڵویی وە ئاگا بێنێتەوە .

بۆ ئیسلامیستەکان ئەم جەنگە وەك دۆزینەوەی شانە هەنگ وایە لەشاخێکی ڕووتەنەدا بۆ ئەوانەی سەدام حوسێن بەرەیەك داگیردەکات کە شەڕی ئەوان زیاتر مەشروعدار دەکات ،

بەرەیەکی دیکە دەکاتەوە بۆیان بۆ ئەوەی زیاتر بتوانن بۆ خەڵکی بسەلمێنن کە ئیسلام و ( شەهامەتی ئیسلامی ) لە مەترسیدایە، بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە دابەشکردنی دنیا بەسەر شەڕی ئاینەکان، ئیسلام و مورتەد، ئیمان و ئیلحاد و غەیرە دینەکان دنیا هەڵدەسوڕێنن، هەموو دابەشکردنەکانی دیکە بەبەڵگەی ئەم شەڕە ،بێمانایی خۆیان دەسەلمێنن. لەبەر ئەوە سەیر نیە کە ئیسلامیستەکان لە پێش هەموو کەسێکەوە هەلهەلەی نەخێر بۆ ئەم جەنگە لێدەدەن و گرەویشیان بۆ جەنگ وئەگەری بوونی جەنگیش بەدیویکی دیکەدا شەڕێکی دیکەی مەعنەویە و پتەوکردنی پایەیەکی دیکەی ئەو نەخشەی زۆرانبازی نێوان کوفرو ئیلحادەیە، کەدەمێکە خۆیان لەسەر دامەزراندووە وکاری لەسەر دەکەن. گەر عێراقی و کوردێك بڵێت: ئەم شەڕە دواشەڕ دەبێت و چ نەبێت کۆتایی بەسەدەیەك تاریکایی و شکاندنی ئەو بەندیخانە گەورەیە کە نێوی عێراقیسەدام حوسێن و بەعسە، ( گەر لەلایەن شەیتانەوە بێت ). ئەوا تۆ ئۆتۆماتیکی دەچیە بەرەی ئەمریکی یەوەو بێگومانیش مورتەدێکی نەفرەت لێکراویشیت. نەخێریشت بۆ ئەو شەڕە ئۆتۆماتیکی دەخاتە نێو بەرەی سەدام و ئەو ئیسلامیانەی دژ بەئەمریکا لە گۆشەنیگای ئیسلامیستیانەوە دژە بە ئەمریکان، گاڵتەجاریەکی تراژیدیە ئەم بەڵێ و نەخێرە نەعلەتیە کە دیکتاتۆرەکان دەیخوڵقێنن. ئەوەی جێگەی پێکەنینە کە کۆمۆنیست و ئانارشیست و بێئیمان و لە ئەوروپاشدا بەشێك لە پانکەکانی سەرجادە و گروپەی هۆمۆسێکسواڵەکان و ئاشتی خواز و سەوز و شۆڕشگێرەکانی دژ بەگڵۆبالیزە و سۆسیال دیموکراتەکان و تەنانەت چەتەکانیش دژی جەنگ دەوەستنەوە، گەواهی ئەوەش ئەو هەموو خۆپیشاندانە گەورانە بوون دنیای گرتەوە، سەیر لەوەدایە لە هەموو ملیۆنە خەڵکەدا ناتوانیت تەنانەت هەزار عێراقی بدۆزیتەوە ،( بێگومان پیاوانی موخەبارات و بالیۆزخانەکانی عێراقیان لێدەربکە ) ،کەس نابینیت ئەوەی کەبەدەستی سەدام نالاندویەتی، بەشداریەکی بەرچاوی هەبێت، بۆچی لەو چوار ملیۆنە عێراقیەی لە دەرەوەیە، لایەنی کەمی دە هەزاری دەبایە دژە شەڕبن؟! ،ئەوەی دەیبینی ئەوەیە ،یان

٢

ئەوانە بێدەنگن یان گاڵتەیان بەو خۆپیشاندانە دێت.سەیریش لەوەدایە ئەوانە هەموویان خۆپیشاندان بۆ عێراق و کێشەی عێراق دەکەن بەبێ ئەوەی لایەنی کەم لەیەك دروشماندا باس لەو کارەساتانە بکەن ناوچەکەو عێراق بەهۆی سەدامەوە تووشی بووە ،ئەوەی لۆژیك لەبەر دەمی دا بەسەر سوڕماویسەوە دەوەستێ ئەوەیە ،تۆ بڵێی ئەمانە هەموویان گێل بن!! ،یاوەکو بە ئارەزوو خۆیان گێل بکەن؟ ،یاخود ئەمە تێکەڵ بوونی وەرەقەی هەموانەلەسەر مێزی کەراتیەکانی سەدام حوسەین و ڕژێمەکەی!!. لەم حاڵەتەدا ئیسلامی و کافری کوری کافر و هۆمۆسێکسواڵ و پانکی سەرجادە و شۆڕشگێڕەکان لە دوژمنایەتیاندا بۆ ئەمریکا یەکدەگرنەوە،بەلام گاڵتەجاڕیەکە لەوەدایەلە هیچ سەنگەرێکدا یەك ناگرنەوە،جگە لە سەنگەری بەرەکانی سەدام حوسەین نەبێت!!.

بەڵێ و نەخێرەکان لێرەشدا تێکەڵی یەکلاکردنەوەی حسابانەکۆنینەکان دەبنەوە، حساباتی ئێمەی کورد لەگەڵ صەدام و حسابی شیعە و هەموو عێراقیەکیش لەگەڵ صەدام بە حساباتی چەپ و ئیسلامی و کۆمۆنیستەکان.

خاڵکی دیکە ئەوەیە،کەئەم جەنگە جەنگێکە ژووری باش و فراوان بۆ هەموو ناسۆنالیستەکان دەکاتەوە ،مەبەستم بەشێکی توندڕەوی بیری ناسیۆنالیستیە کەنێزیکە لە کەرایەتیەکی بیرکردنەوە ،ئەوانەی کە ناسیۆنالزم لە خودی خۆیدا وەك ئامانجێك دەبینن نەك هۆکارێك بۆ بیناکردنی کۆمەڵگەیەکی ئازاد.بیری ناسیۆنالزمی ئەمانە کە زۆر جار بەشەرم و پێواریەوە خۆی لەقەرەی ڕاسیسزم دەدات و لە هەڵکشان و داکشاندایە لەگەڵیدا.

ناسیۆنالستی عەرەبی سەرەڕای بوونی چەندەها کێشەی نێوەکی نێو خودی خۆی ،ئەم جەنگە بە خە نجەرێکی دیکە دەبینێت کە ئامادەیە جارێکی دیکە لەو برینەی بداتەوە کە هێشتا ساڕێژ نەبووە.برینی دوایی ڕزگار بوون لە کۆلۆنیال و هاتنەسەر حوکمی ڕژێمە پۆست کۆلۆنیالەکانی جەنەڕاڵ و شێخ ودیکتاتۆرە لۆکالیەکانی نێو هەناوی نەتەوەی عەرەبی خۆی، ئەو برینە ناسیۆنالیستەی زیاتر دوای ڕزگار بوون لە

دلگیرکەر، چەوساندنەوەیەکی وەحشی دیکەی هێنایە کایەوە لەسەر شێوەی سەدام و جۆرەکانی ،هێشتا ئەو برینە سارێژ نەبووە کە ئەو ناسیۆنالستانە هەست دەکەن خەنجەرێکی دیکەیان لەلایەن بیگانەی ئەمریکیەوە لێدەدرێت ،لەو سەری دەریاشەوە ئیسرائیلیش چاوەڕێیان دەکات ،ئیدی گەرعیراقی داهاتوو ئەمریکای سیاسەت بێت و لەو سەریشەوە ئیسرائیل ئامێری جەنگی خۆی بخاتە گەڕ،ئیدی ئەوە بەڕای ئەو ناسیۆنالستە عەرەبانە مانای مردنی حەتمی نەتەوەی عەرەبی و بیری نەتەوەیە عەرەبیشە ،ئەمە وایکردووە کە هیچ چارەسەرێك نەمێنێتەوە بەوەی ئەو هەستکردنە بە مەترسی کەلە ڕۆحی‌ناسیۆنالی هەموو عەرەبێکدا هەیە،لەلایەن ناسیۆنالستە عەرەبەکان بهاروژێنرێت و ئەو خەڵکەی پێدەڵێن ( جادەی عەرەبی ) بجوڵێنن بۆ لای خۆیان، بێگومان لەمەشدا ئیسلامی عەرەبی دەچێتە نێو ئەم بەرەیەشەوەو جادەی هەژاری برسی و چەوساوە بە دروشمەکانی خۆیان سەدام دەجوڵێنن.

من لەو بڕوایەدام ئەمە بەشێکی زۆری عەرەب دەگرێتەوە ،بەلام لەو بڕوایەشدام کە عەرەبی عێراقی ناگرێتەوە ، چونکە کورد گووتەنی عەرەبی عێراق باش دەزانێ کە ( مشتەی نێو هەمانەکە )کوشتوویەتی ،عەرەبی عێراقی باش دەزانێ کەئەم سوارچاکە لە کاتێکدا هەموو بەنێو جادەی عەرەدی بەنێوی پاراستن لە قەلای ڕۆژهەلاتی عروبە و نیشتمانتی عەرەبی بۆ خۆی ڕاکێشابوو ،لە کاتێکدا لە میسریەوە بیگرە تاوەکو ئوردنی و سودانی بۆ صەدام هەڵدەپەڕین ،عەرەبی عێراقی دەبوایە باجی ئەو کەرایەتیە بدات و لە جیاتی هەڵپەڕین بچێت لە بەرەکان و خەستەخانەو ( مرکز توزیع الشهدا ءکاندا بەدوای لاشەی سوتاوی مێرد و کوڕو باوك و خزم و کەسوکاریدا بگەڕێ!! ،بۆچی؟،بۆ پاراستن لە دەرگایەك کەتەنها لە مێشکی شۆفینیەکی عەرەبی نەخۆشی وەك صەدامدا بوونی هەبووە،ئەوکاتەش زۆر لە ناسیونالیستەکان تەنانەت بەشێکی زۆری فەلەستینیە چەپەکانیش وایان مەزندە دەکرد کە سەدام عروبە و عەرەبایەتی دەپارێزێ، تاوەکو ئێستاش زۆر لە بیریارە بەتواناکانیشیان کەوتوونەتە نێو چالی ئەو وەهمە ناسیونالستیەوە،

## ٣

بەداخەوە یەکێکی وەك ئادوارد سەعیدیش وا مەزندە دەکات لە گوتارێکیدا کە بەناوی (معلومات مچلله عن العراق) کەلە ٣کانونی یەکەمی ٢٠٠٢ لەسەر لاپەڕەی ئینتەرنێتی ئەمین بلاوی کردۆتەوە ،هەمان تێزی ئەو ناسیۆنالیستە کوێرانە دووبارە دەکاتەوە.ئەم بیریارەی کە هەمووومان ڕێزی لێدەگرین ودەیخوێنینەوە لە ساتێك لە ساتەکانی خۆیدا دەکەوێتە نێو چاڵی ئەو ناسیونالستە کوێرانەی کە چاو لە بوونی غەیەر عەرەب دەنوقێنێ و هەست دەکەن کە ئیدی فیدرالیەت و عێراقی داهاتوو مانای لێدانی جەرگبڕی عەرەبایەتیە ،ئەدوارد سەعید لەو گوتارەیدا کە بۆ هەمووان شۆکێك و داخگرانیەك بوو ، بەو ڕستانەی کەنعان مەکیە پەستە کە باس لە عێراقێکی (غەیرە عەرەبی/ناعەرەبی) دەکات، ئەو فەیلەسوفەی دژی هەمووناپارتید و وەك فەلستینیەك دژی هەموو ڕاستیەکە ،خۆی پێناگیرێ و پەستە بە فیدرالیەت و نەمانی مەرکەزیەتی حکومەتێکی عەرەبی لە عێراقدا، هەر وەك ئەوەی بلێت مانەوەی مەرکەزیەت بەدەست صەدامێکی عەرەب باشترە لە عێراقێکی فیدرالی هەمە ڕەنگی نا عەرەبی!!.دەبینین بەلێ و نەخێرەکان و گرەوەکانی ناسیونالستی عەرەبی لەم جەنگەدا خۆی لەبەردەم چارەسێکی زۆر ناجۆردا دەبینێتەوە، خۆ گەر عەرەبێکی عێراقی وەك کەنعان مەکیە دژی سەدام قسە بکات و باس لەو ملیۆنەها کوژراو دەربەدەرانە بکات، چەند بشیرێنێت ئەوا هەر دەچێتە خانەی پیاوی ئەمریکایی، (هەر وەك چۆن ئەدوارد سەعید بە ئاشکرا بەئەوە تۆمەتباری دەکات) ،گەر نەخێر بۆ ئەم جەنگە هەلبژێرێت ئەوا لە دەست دانی فرسەتێکی گەورەیە کە میللەتێك بە هەموو نەتەوەکانیەوەلە دەست بەندیخانەی ئاسن و کیمیاوی ژۆری ئەشکەنجەدان ڕزگاریان دەبێت!!.ئەم جەنگە بۆ ناسیونالستی عەرەبی تاقیکردنەوەیەکی باشی عەرەبایەتیەکی کوێرانیە.بە نیسبەت ناسیونالیستەئەلەمانی وفەرنسایش ،بەشێوەیەك لە شێوەکان لە پشت بەرژەوەندی خۆیانەوە لە عێراق و نەوتیعێراق و ئەوەی کەناوی دەنێن (بەشکردنی کێکی نەوت) و شەڕیان لەسەر ئەو قەرزانەیەکەکاتی خۆی لە شێوەی چەك و مادەی کیمیاوی و تەنانەت شارەزایی زانستی

پێشکەشی حکومەتی سەدام کراوە ئەوانە ڕوخانی سەدام بەفیڕۆدانی ئەو قەرزە تێدەگەن، بێگومان ئەو خەونە کۆلۆنیالیەکۆنەش کە دەبێت لە هەموودابەش کردنەوەیەکی دیکەی وولاتانی دەرەوەی ئەوروپاشدا ،ئەوانیش بەشیان هەبێت ،لەو دیدە نەتەوەییەوە هەستێك ڕوخانی سەدام بردنەوەی گرەوێکی دیکەی ئەمریکایە ،لە هەمووشیان گرنگتر ئەوەیە خەنجەرێکە لە یەکێتی ئەوروپایی کە ئێستا بە هۆی مەسەلەی عێراقەوە هیچ مانایەکی یەکێتی یەکگرتوویی نەماوە.ئەو یەکێتیەی وایان مەزندە دەکرد بە نەهێشتنی سنورەکان و بوونی یەك دراو ، ئەوروپایەك پێکدێت یەك سیاسەتی دەرەوە و یەك هەڵوێستەی دەبێت. بێگومان ئەم خەونە ئەوروپییە خۆی لەخۆیدا خەونێکی ناسیونالیە لە شێوەی ئەوروپایەکی گەورەدا،بەوەی بە ئەوروپی بوون زیاتر مانای بالأبوونە بەسەر چەمکە نەتەوەیە تەسکە لۆکالیەکان.لەهەمانکاتیشدا خۆی لەخۆیدا گۆڕینی ناسیونالیستیەکی تەسکە بە ناسیونالیستێکی شێوە جیاوازدا کە نێوی ( ئەوروپای گەورە )یە. مانای هەوڵدانە بۆ بالأبوون بەسەر هێزەکانی دەرەوەی ئەوروپا .لەبەکەم هەنگاوی پراکتیکی ئەم ئەوروپا یەکگرتووە ساوایە،هێزەکانی دەرەوەی ئەوروپا یاری خۆیان دەکەن وسیاسیانە پەرتی دەکەن. گەر سەدامیش بڕوخێ و عێراقیش لە ژێر هەر ویسایەتێکی ئینگلیزی یان ئەمریکایی بێت، ئەوا مانای درز بردنی ئەو پرۆسێسە بەئەوروپایکردنەی سەرجەم ئەوروپایە. ئەمانە بەتایبەت کەفەرەنسا خۆی بەهەڵگری کلتورێکی ئەوروپیی دەزانێت . (بێگومان گەر تەنها لەدیدی سیاسەتێکی ناسیونالیستیەوە سەیر بکرێت )،زیاتر سوورە لە بەرگری لە سەدام ڕژێمەکەی و چاوی خۆی دەپۆشێ لە تاوانەکانی و تەنانەت لەکولەکەی تەریشدا باسی ناکەن.سەیرە !!،ئیدی سەدامێکی شۆفێنی دیکتاتۆر دەبێتە گرەوێکی کاریکتۆریانەی زۆرانبازی نێوان ناسیونالە ئەوروپیەکان و لە ساتێکی گاڵتە جاڕی مێژوویدا مانەوەی ئەو ڕژێمە، جۆرێك لە هاوسەنگبونەوەی سیاسەتی ئەوروپاو کلتووری ئەوروپی دژە شەڕو دنیای شەڕانی

ئەمریکایی پڕ پڕمونافەسەی بێبەزەیی کۆمپانیاو نەهەنگەکانی بۆرسە و شێوە ژیانی ئەمریکی. بەڵێ ونەخێرەکان بۆ جەنگ ، بەڵێ و نەخێرە لە دوو شوێنای جیاوازی بەدەر لە کێشە سەرەکیەکە، کەسەدام و تاوانەکانێتی ،تێوەگلانی زۆر چەمك و بیروڕایە لەیەکتری، دوور لەواقعی عێراقی و مانای شەڕو ئاشتی لەو بەندیخانە گەورەیەی نێوی عێراقە..

بە هەموو شی وە زاکانی تەفسیرکردنی ئەم شەڕە و دۆزینەوەی چەندەها دووری ترسناك و کێشەی نووستووی هەمووان تێدا، ئەوەمان بۆ ساغ دەبێتەوە کە گەورەترین تەڵزگەیە،کاتێك بەبەڵێ و نەخێر وەلام بدەینەوە، لەهەمانکاتیشدا توانای ئەوەت نیە خۆت لە پۆزیسیۆنێکی نێوان بەڵێ و نەخێردا بدۆزیتەوە، لە هاوکێشەیەکدا کە تەنها بەڵێ و نەخێری قبوڵە. ئەڵتەرناتیفەکانیش لە بەرامبەر ئەم دووانەیە لاواز و بێکەڵکن.

بەهەمان ئاستیش گەر سەیری گۆڕەپانی سیاسی کوردی بکەین و ئەگەری زۆرانبازیەکی دیکە دەرئەنجامی شەڕ، وەك هێرشی چاوەڕوانکراوی تورکیا بخەینە بەرچاو ،یاوەکو هەڵوێستەوەرگرتن لە ئۆپۆزیسیۆنی عەرەبی لە حکومەتی داهاتوودا. کە ئێستا لاوان و لەسبەیدا پەیمانەکانیان دەکەوێتە بەر تاقیکردنەوە، لێکبدەیتەوە .لە نێو ئەم هەموو فەوزایەداو بەدگومانمان لە خۆگری درێژ خایەنی حزبە هەڵسوڕێنەرەکانی سیایەتی کوردی لەم قۆناغە ناسکەدا سەرهەڵدەداتەوە، بەتایبەت ئەوانەی ئەوەندە مێژوویەکی پاکژو خەمخۆر ن بەدووە نیە کە نەتوانین گومانیان لێنەکەین، گومان هەیە لەوەی،ئەوەی کە دەیێێن بڕوای پێبکەین، چونکە ئەوەی لە ئەنقەرەو بە دەوڵەتەکانی دراوسێ بە نهێنی دەوترێ لەوانەیە شتێکی دیکە بێت لەوەی بە ئاشکراو لەبەر خری بەهاردا دەگوترێ ،هەر وەك چۆن لە ئەزمونی تاڵمان دا زۆر لەو سیاسیەتی دووفاقیەمان بینیوە. لە نێو ئەم هەموو گومان و ترسەی شەڕێکی ئاوەها چیمان بەسەردا دێنێت، بەڵێ ونەخێرەکان لە هەموو ئاستەکاندا ڕۆشنبیر دەخاتە بەردەم مەترسیەکی گەورە ،مەترسی ڕەودوکەوتنی سیاسەتێکی دارژراو.

ئەوەی خۆم وەك کوردێك هەستی پێدەکەم گومانێکی گەورەیە لەم یاریە، ئەوەیە، ئێمە خۆمان لبەردەم ئەگەری ئەزمونێکی شکستەخواردووی وەك یاسرعرەفات و فەلەستینیەکان

ببینینەوە؟، سیناریۆیەکی ئاوەهاش لە ئاسۆگەدا خوی پەخشدەکاتەوە، کەجارێکی دیکە ببینەوە بە فەرمانبەری پلەسێ لە دەزگای دەوڵەتێکی دیکەی عێراقی. لە بەرامبەر پێدانی چەند هەیبەتێکی ڕەمزی و ناولێنانێك، وەك چۆن ئەو هەیبەتیەیان لەژێر ناوی زلی (دەوڵەتی فەلەستین) بەخشی بە فەلەستینیەکان. ئەمانەو چەندەها گومانی دیکە و لە بەرامبەریشدا چەندەها گەشبینی لەشێوەی ئەوەی ئەمە دوا فرسەتە و ئێمەش دەبێت بزانین بەکاری بهێنین و یەکگرتوویی پارتی و یەکێتیش شتێك لەو هیوایە زیندوو دەکاتەوە، بەوەی کە پێدەچێ ئێمەش لە ئەزمونەکانمانەوە فێربووبین!!. بەلام ئەمە لە بەشبوونی و کەرتبوونی شیزۆفرینیایی ڕۆشنبیری کوردی و تەنانەت عێراقیش کەمناکاتەوە، کەلەم حاڵەتەدا جۆرێکە لە عوسابێکی فیکری و بڕیاردان، جۆرێکە لە هەڵبژاردن لە نێوان خراپ و خراپترینیان کە سەدامە، لە نێوان ئەوەی دەتکوژێ و ئەوەی سبەینێ تەنها جنێوت پێدەدا، وەك قسەیەکی عێراقی هەیە کە دەڵێت لە نێوان تاڵ و تاڵتر.

ڕۆشنبیری کوردی ئەو کائینە بچوکە نیە کە توانای بیرکردنەوەی نەبێت، لەبەر ئەوەی چەند سیمینارێکی فەلسەفی لە زانکۆکانی ئەوروپا وەرنەگرتووە!!، ڕۆشنبیری کورد ئەندە لە نێوان تیۆرەکاندایە دە ئەوەندەش پەرتدەبێت لە نێوا یاری ئاوەها چارەنووسی و هەڵوێستەی جەبری ئاوەهادا کە لۆجیك تێدا کارناکات، ڕۆشنبیرێکە لە نێو پارادۆکسە بەسەر سەپێنراوەکاندا دەژی، لە مەنفاو لە نیشتماندا تووشی ئەو جیهانە دابەشبووە توندوتیژانە دەبێتەوە، کەبەناچاری بەسەر سەربازگەکانی شەڕی سیاسیێ توندوتیژدا دابەشبوون. ئەم کائینە وەك ڕۆشنبیرێکی ئەمریکی یان ئەوروپی نیە کە بەشداری مانگرتنێکی کرد دژی شەڕ، بتوانێ بەهێمنی و بەویژدانی ئاسوودەی وەفابوون بۆ پرنسیبەکانی ئاشتی و دژە شەڕ ئێوارە

شەراب بخواتەوە. کە لەگەڵیشیدا بکەوێتە گفتوگۆ پێتدەڵێت : ئاخر شەڕماڵ وێرانی بەدواوەیە!!. ئەم قسەیە چەندە جوان و ئاسانە لە هەمانکاتیشدا ڕەنگەکانی قوڵە لەنێو سەلماندنی تیۆردا، دە ئەوەندە بۆ ڕۆشنبیرێکی کورد قورسە بەئاسانی ئەو ڕستەیە دووبارە بکاتەوە!!. چونکە هەمیشە ئاسانە دەربارەی ئەویدیکە(الاخر)قسان بکەی،ئاسانە هەڵوێستە لەشتێك وەربگری سەد دەر سەد تۆ ناگرێتەوە. لەوانەیە تەنها بیروڕاکان بگرێتەوەو وەفابوون بۆ بیروڕاکان پێوەر بێت. ئەو کاتە ئاسانە : بلێیت من ئاشتیخوازم یان شەڕکارم. بەلام کاتێك دەربارەی شتێك قسان دەکەی کەلەتەوقی سەرتەوە تاوەکو بنی پێت چارەنووستە. ئەوسا هاوکێشەکە قورسترو جیدی ترەو لە مناقەشەیەکی زمانەوانی دەردەچێت و دەچێتە نێو گفتوگۆیەکی دیکەوە. ئەو عەرەبە غەیرە عێراقیە یاوەکو ئەوروپیە وەکو ڕۆشنبیرێکی کورد نیە لە مەنفای ڕۆژئاوایی ، کەبە گومانێکی گەورەترەوە قسەدەکات. ئەو ناتوانێ بە ئاسانی بلێت من دژی شەڕم چونکە ئەو دەزانێ مانەوەی سەدام مانای شەڕێکی ئەبەدی تۆقێنەرە. ناتوانێ ئاوەها بەئاسانیش سەری ڕەزامەندی بۆ شەڕ بلەقێنێ. دەبێت وەکو ئادوارد سەعید دەڵێت ( حکایەتەکە لە سەرەتاوە بگێڕنەوە ). ئەو ڕۆشنبیرە لە نێو ئەم چەپ و ناسیونالی و ئانارشیست و دژە گلۆبالیەکان و ئەوانی دیکەدا هەوڵدەدات چیرۆکی خۆی. چیرۆکی ئەنفال و هەڵەبجە و مێژووی دوور ونیزیك بگرێتەوە. بێئەوەی بەتەواوەتی بتوانێت لە نێوان بەڵێ و نەخێردا خۆی بدۆزێتەوە. ئەو ڕۆشنبیرە گەر بەڕاستی خەمی ڕۆشنبیری هەبێت.وەك بوونەوەرێکی هەبووی بیرکەرەوە لە جیهان.بەمەجبووری خۆی ( لە نێوان ) بەڵێ و نەخێردا دابەش دەکات. بۆ ئەوەش پێویست دەکات چیرۆکەکە بگێڕێتەوە.

گێڕانەوەی ئەو چیرۆکەش خۆی لە خۆیدا چەقبەستندا لە نێوان مۆراڵ و سیاسەتدا. هەستی مرۆیی و ڕیالستیەکی تاڵدا.ئەو چەقبەستنەش لە نێوان بەڵێ و نەخێردا. بەتۆپزی ڕۆشنبیر دەکاتە فیگورێکی کاریکاتێری دیکتاتۆرێك.بەکەرایتیەکانیەوە ئەو هەڵوێستەی بەسەر دا سەپاندووە ،دیکتاتۆرێك ،خۆشی دەمێکە بۆتە کاریکاتۆرێکی خەڵەفاو ، پێش کۆتایی هاتنی زۆر مانا تێکەڵ بەیەکتری دەکات و زۆریش بێمانایی حساباتی ناجۆر لەدووی خۆی جێدێڵێ.........

# ڕیفۆرم ، پرسێکی کراوەی نەوەکان

-ئەوان لە خۆڕسکەوە درۆیان نەدەکرد، بەڵکو لە پڕنسیبەوە .. ..

ئادۆرنۆ (مۆراڵە بچوکەکان)

## ڕیفۆرم و پێناسەیکی کورت

چەندە ڕیفۆرم لەچوارچێوەیەکی زمانەوانی و گوتارئامێزانەوە دەستپێدەکات، ئەوەندەش سەرەتای سەرهەڵدانی قەیرانێکە، سەرچاوەکەی بۆئەوە دەگەڕێتەوە کەبارودۆخێك هەیە ڕۆژ بەڕۆژ کەڵەکە دەبێت و هەڕەشە لە سەرجەم مانەوەی هێزێکی سیاسی و کۆمەلایەتی دەکات. بەدیویکی دیکەدا دەتوانین بڵێین کە ڕیفۆرم (دووبارە پێناسکردنەوەی دنیا) ڕادەگەیەنێت، هەوڵدانێکی ڕاتسیۆنال و ئەقلانیە بۆ تێگەیشتن لەو زەویەی لەسەری ڕاوەستاوین. پێداچوونەوەیەکە بەهەموو ئەو (پڕنسیبە سیاسی و ئەدەبیاتەی ) گروپ و هێزەسیاسی و کۆمەلایەتیەکان ،سالانێکی دوورودرێژە خۆیان لەسەر دامەزراندووە. (ڕیفۆرم) لەگۆشەنیگایەکی دیکەوە ، کارێکی کولتوری دژوارە و بیرکردنەوەیەکی دیکەی جیاوازە، لەوانەیە سەرەتای پێکهاتەی هێزێکی نوێ بێت لەکۆمەڵ و کولتوری سیاسیدا، دەربڕین بێت لە خەونی نەوەیەکی نوێی سیاسی و کۆمەلایەتی و تەنانەت ئەدەبیش لەسەر زەوی هێزی کۆنینە. ئیدی ڕیفۆرم دێت و دەڵێت : ئەم زەویە فشەڵ بووە بۆ بیناسازی خەونی نوێی ئێمە، دەڵێت: چیتر پرنسیب و هێلەگشتیانە ناگونجێت لەگەڵ سەردەمدا... لەم نێوەندەدا، ڕیفۆرم خۆی بەنوێنەری (ڕۆحی سەردەم ) تێدەگات .

ئەوەی لەم گوتارەدا هێڵی گشتی گفتوگۆمان دەبێت، سەرەتایەکی گفتوگۆئامێزانەیە بۆ تێگەیشتن لە (ئەقلیەتی ڕیفۆرمخوازی کوردی )، بەمانایەکی دیکە، نیزیکبوونەوەیەکە لەو بیرکردنەوە ڕیفۆرمخوازانە کە دەیەوێت بارودۆخێکی کۆمەلایەتی و سیاسی بگۆڕێت، چ نەبێت چاکسازی بکات. نێزیکبوونەوەیەکە لەو ئەقلیەتەیەی خۆی بەهەڵگری چەمکی (دڵسۆزی ) تێدەگات ، چ بۆ پڕنسیبە سیاسیەکانی، چ بۆ کوردستان وەك

نیشتمانیکی پارچه‌پارچه‌کراو ؟!، له‌دواجاریشدا خۆی به‌دلسۆزی ( ڕۆحی سه‌رده‌م) تیده‌گات!!.

ئه‌م ئه‌قلیه‌ته (ریفۆرمخوازه) خاوه‌نی کیشه‌به‌ندی خۆیه‌تی ، تیگه‌یشتن له‌و ئه‌قلیه‌ته به‌نیو (ریفۆمخوازه) که میژوویه‌ك ترادیتسیۆنی سیاسیانه‌ی له‌پشته‌وه وه‌ستاوه، نیزکبوونه‌وه‌یه‌کی یه‌ك لایه‌نی نیه له‌ته‌نها گروپه‌یه‌ك، به‌لکو نیزیکبوونه‌وه‌یه‌که له کۆی پیکهاته‌ی ئه‌قلیه‌تیکی پیاده‌کراوی چه‌ند ساله، ڕه‌نگدانه‌وه و جیگه‌په‌نجه‌ی سه‌ختی له‌سه‌ر حکومه‌ت و به‌ڕیوبردن و ڕه‌گه‌زیندووه‌کانی ژیانی ڕۆژانه‌ی کۆمه‌لگه‌وه هه‌بووه و هه‌یه‌تی. ئه‌م گوتاره هه‌ول ده‌دات له‌و مۆراله تیبگات که (ئه‌قلیه‌تی ریفۆرمخوان) لیوه‌ی سه‌رچاوه‌ی هه‌لگرتووه، نیزیکبوونه‌وه‌یه‌که له چه‌مکی (ڕه‌واخوزای / مه‌شروعیه‌تی) ئه‌قلیه‌تی ریفۆرمخواز ، له‌م گوتاره‌دا هه‌ردوو چه‌مکی (مۆرال و ڕه‌وایه‌تی ) به‌پیکه‌وه‌به‌ندی مامه‌له‌یان له‌گه‌لدا ده‌کریت و ئه‌م، ئه‌و په‌لکیش ده‌کات بۆ ئه‌وی دیکه و هه‌روه‌ها به‌پیچه‌وانه‌شه‌وه..

بۆ ئه‌وه‌ی له‌و کاتیگۆری و خانه‌به‌ندیه تیبگه‌ین که ریفۆرمی بانگه‌شه بۆکراوی کوردی له‌سه‌ری وه‌ستاوه، پیویستمان به وینه‌یه‌کی ڕوون و ئاشکرای سه‌ره‌تاکانی چه‌مکی ریفۆرمه به‌گشتی، به‌مانای پیویستمان به‌گه‌ڕانه‌وه‌یه‌کی هیمنانه هه‌یه بۆ نیو چیرۆکی (ریفۆرم ) خۆی،به‌هه‌مان شیوه‌ش من پیمووایه چیرۆکی ریفۆرم په‌لکیشمان ده‌کات بۆ ئاوڕدانه‌وه له چه‌مکه مۆڕالیه‌کان، ئه‌مانه هه‌مووی گه‌ڕانه‌وه‌یه‌کن بۆ میژووی بیرۆکه و بیریارانی ریفۆرمخوازان له‌سه‌ده‌کانی ڕابوردوو، بۆ هیچ نا ، ته‌نها بۆ ئه‌وه‌ی ڕۆحیکی به‌راوردکار قوتارمان کات له غرووره‌کانی بیروبۆچۆنی ڕه‌ها و دۆگمایی و خوتبه نوسین ...

ئه‌وه‌ی که‌سه‌ره‌تا سه‌رنجمان ڕاده‌کیشیت له چه‌مکی (ریفۆرم) نیوه‌ڕۆکی پیناسه‌کاریه‌تی، وه‌ك جولانه‌وه‌یه‌ك، مه‌به‌ستی تیکدانی سوستیمیکی بیرکردنه‌وه‌ی ئاینی یاوه‌کو سیاسی ، یاخود فیکری نیه، به‌لکو مه‌به‌ستی دووباره دامه‌زراندنه‌وه و بنیاتنانه‌وه‌ی سوستیمه له چوارچیوه‌ی خانه‌به‌ندی و کاتیگۆریه‌کانی خۆیدا. خانه‌به‌ندیه‌کان که‌ده‌شیت بیروڕای سیاسی یاوه‌کو ئاینی یاوه‌کو کولتوری کۆمه‌لایه‌تی بن، ده‌که‌ونه به‌رده‌م گومانه‌وه ، به‌لام گومانیك نا بۆ گۆڕانی ڕیشه‌یی و ڕادیکالی ، به‌لکو بۆ دووباره بنیاتنانه‌وه‌ی به‌شه کۆنین و داڕازه‌وه‌کانیتی. به‌مانای، پرۆژه‌ی هه‌لوه‌شاندنه‌وه‌ی خانه‌به‌ندیه‌کان

نیه. پرۆژەی تێکدانی سوستێم نیه و دانانی ئەڵتەرناتیفی ڕادیکاڵ نیه. بەقەد ئەوەندەی دووبارە بیناکردنەوەی سوستێمە لەنێو خودی خۆیدا. لێردوە ئەقڵیەتی (چاکساز و ڕیفۆرمخواز) ئەقڵیەتێکە لەدەرەوەی ئەو خانەبەندی وکاتیگۆریانە هەڵناسوڕێت کە مەبەستی بێت سوستێم ڕادیکالانە ڕابماڵێت و پرۆژەی بەدیلی سیاسی و جێگر بخاتە شوێنای، بەپێچەوانەوە، لەنێو کاتیگۆریەکانی سوستێمی پێشوو هەڵدەسوڕێت و دەیەوێت ئەو بیروڕا سیاسی و ئاینی و کولتوریانە زیاتر پتەو بکات نەك لاوازی بکات.

بەم شێوەیە کردەی گۆڕان لەنێو چوارچێوەی خودی ئەو پارتە سیاسی و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتیانەدا ڕوودەدەن، نەك لەدەرەوەی، هێزەکانی کە دەیانەوێت گۆڕانکاری بەئەنجام بگەیەنن هێزێکی دەرەکی نین ، بەڵکو لەنێو دەزگای کۆمەڵایەتی و حزبی و حکومیدا سەرهەڵدەدەن. ئامانجی ئەمان پاراستنی دەزگاو حزب خۆیەتی . نەك لەپێناو ڕووخاندن و جێگەلەقکردنی.دەبێت ئەوەش بڵێین لەسەرەتادا پرۆسەی ڕیفۆرم وادەردەکەوێت کەمەبەستی هەڵوەشاندنەوەی دەزگای سیاسی و حوکومیە، لەم دەرکەوتنەوە لەلایەن ئارتۆدۆکسیەتی ئاینی و سیاسی و کۆنەخوازی ئیدازی هەموو پرۆژەیەکی ڕیفۆرم بە (سەرەتای ئاژاوە و نەیارخوازان) تاوانبار دەکرێت، بەشێوەیەك کە دەبێتە دروستبوونی بەرەی جیاواز لەچوارچێوەی دەزگا حکومی و حزبی وئیدازی و کۆمەڵایەتیەکاندا. لەم خاڵەوە دروستبوونی بەرەکان، کە نوێنەری بیروڕای خۆیانن و دەرهاویشتەیەکی سروشتی پرۆسەی ڕیفۆرمن، کاراکتەر و شوناسی دیاری شێوازی زۆرانبازی سیاسی و ئیداری و کولتوری دەبن لەچوارچێوەی دەزگا و پارتی سیاسیدا.

بێگومان لێرەدا پێویستە ئاماژە بکەین بۆ ئەوەی کەچەمکی (بەرەکان) لە چەمکی (کوتلە) کان جیاوازترە و جیاوازیەکی جەوهەری هەیە لەنێوان ئەم دوو چەمکەدا، چ لەڕووی جوڵەی سیاسیەوە ، چ لەڕووی جوڵەی کۆمەڵایەتیەوە. (بەرەخوازی) ودابەشبوونی دەزگای کۆمەڵایەتی و سیاسی بەدوو بەرەوە یان چەند بەرەیەکەوە، سەرەتایەکی جوڵەی چاکسازانەیە بۆ گۆڕینی شتروکتوری نێوەکی و دەرەکی پارتی سیاسی و شوێنای لەنێو ڕووداوەکاندا، بەمانای، ئەمە کاتێك ڕوودەدات کە ڕیفۆرم خاوەنی پاکەتێکی پرنسیبی سیاسی و مۆڕالی نوێی تایبەت بەخۆی بێت، بەشێوەیەك، کەئەم پاکێتە کاریگەری هەیە بۆ سەرجەم تەشکیلەی پارتی سیاسی و جێگیرە سیاسی و

ئەخلاقیاتەکانی . (کوتلەگەری) بە پێچەوانەوە خاوەنی هیچ پرۆژەیەکی سیاسی و ئیدۆلۆژی نیە، کوتلەکان لەسەر بنچینەی بەرژەوەندیەکان دادەمەزرێن و هەڵدەوەشێنرێنەوە و پێکدێن. لەخولێکی سەیری زۆرانبازی و تەحالوفاتن لەسەر بنچینەی بەدەستهێنانی بەرژەوەندی . کوتلەکان سورانەوەن لەنێو هەمان جێگیری سیاسی و نەریتی دەسەڵات. کوتلەچێتی هاوکێشەی تەرازووی هێزەکانی ناوخۆی دەزگایەکی سیاسی یان ئیدارین ، خاوەنی هیچ دنیابینیەکی جیاوازتر نین لە کوتلەیەکی دیکە. بەرە سیاسیەکان بە پێچەوانەوە شەڕی ئیدۆلۆژی و فیکری پێکیاندەهێنێت و لەدواجاریشدا شەڕێکە لەسەر بەرنامە و دنیابنینی سیاسیانە. ڕیفۆرمی ڕاستەقینە بەرەیەکی نوێ پێکدێنێت لەنێو خانەبەندی دەسەڵاتەوە هەوڵدەدات بەرنامەی خۆی بانگەشەبکات.

لەم کاراکتەرانەوە کە خۆی یەکەم: لە گۆڕینی نێوەکی و جوڵە لە نێو کاتیگۆریەکانی دەسەڵاتی سیاسی و فیکری گروپەدا دەبینێتەوە و ئامانجی تێکدانی کاتیگۆریەکان نیە ، بەڵکە گرتنەوەی هەموو ئەو ناشرینی ناهەمواریانەیە کەبەپێی زەمەن و مومارەسە گروپەی ئاینی کۆمەڵایەتی تووشی بووە و هەوڵدانێکە بۆ پارێزگاری لە و سوستێمە و پەرەپێدانی خانەبەندیە سیاسی و ئیداری و فیکریەکانێتی. دووهەمیش دەرئەنجامی پرۆژەی ڕیفۆرم بەرەی دژ بەیەك پەیدا دەبن و کێشە و ململانێ لەنێوان ئارتۆدکسیەتی سیاسی و (جێگیرپارێزانی) نێو دەزگا و (بەرەی ڕیفۆرم )هەڵادایسێ و دەگەنە چەندەها ئاستی پێکدادانی سیاسی و فیکری . وسێهەمیش کە لەم نێوەندەدا گومان و پرسیار دەهاروژێنێت کێشەی (مۆراڵ و جێگیرە ئەخلاقیەکانێتی ) کە ئەز بەچەمکی (ڕەواخوازیەی) گرێیدەدەمەوە و لەدواجاریشدا هەموو پرۆسێسەکە دەرژێتە نێو کێشەی قەیرانەکانی کولتور لەکۆمەڵگەدا...

دوای ئەم تێپەڕبوونە پێناسەییە و بۆ زیاتر ڕۆشنایی خستنە سەر چەمکی ڕیفۆرم و تێگەیشتن لە پرۆژەی ڕیفۆرمی کوردی، پێمان باشە ئاوڕێك لەچیرۆکێکی گەورەی ڕیفۆرم بدەینەوە و بگەڕێینەوەبۆ سەرەتای سەدەی شازدە و ڕەگەکانی لەنێو خودی گوتاری ئاینیدا تاوتوێ بکەین..

# مارتین لوتەر و ڕیفۆرماتسیۆن

مارتین لوتەر (١٤٨٣ـ ١٥٤٦) ئەو پیاوەی لە سەرەتای سەدەی شانزەدا ڕابەری بزوتنەوەی (ڕیفۆرم ) بوو کە بە (ڕیفۆرماتسیۆن) ناودەبرا،ئەو قەشە (ئۆگستن) یە بوو کە کڵیسای خستە بەردەم پرسیاری نوێ لەمەڕ ئاین و دەسەڵات و بازرگانی بە میهرەبانی خوداوەندەوە. دوا جار ئێفانگیلزم بووە ڕێبازێکی جیاواز لە کڵێسای کاسۆلیکی دێرین و تاوەکو ئەمڕۆ ئێفنگیلیزم ڕێبازێکی دیکەی کڵێسایە. چاوخشاندنێکی بەپەلە بەژیان و هێڵی گشتی ڕیفۆرمی ئاینی مارتین لوتەر و زۆرانبازی دەسەلاتی (شازادە و میرەکانی ) ئەوسای ئەڵمانیا و دەسەلاتی پاپی (ڕۆما) و تێکەڵبوونی وەرقەکانی سیاسەت بە بیری ئاینی و ڕیفۆرمی ئاینی ، ئەو ئەزمونە مرۆیەمان پێدەبەخشێت کە لە هاوکێشەی (ڕیفۆرم ) و (کولتوری ڕیفۆرم) نێزیکبینەوە. لەدوایدا دەگەڕێینەوە سەر ئەم دوو چەمکە بۆ تێگەیشتن لە ئەقلیەتی ڕیفۆرمخوازی کوردی.

مارتین کوڕی خێزانێکی جوتیارەی دەوڵەمەند بوو، سەرەتا بڕیاری دابوو ببێت بە دادوەر و یاساناس ، لەپرێکدا و لەکاتی گەڕانەوەی بۆ ماڵەوە لەنێزیك شاری (ئێرفۆرت Erfurt) باوبۆرانێکی سەخت دەستپێیکرد و هەورەبروسکە لێیدا، گالیسکەکەی وەرگەڕا و لەو ساتەدا هاواری پیرۆزان (ئانا) دەکات و دەڵێت (دەمەوێت ببم بەقەشە) ، ئیدی ژیانی قەشاتی لەو ساتەوە دەستپێدەکات!!. ئەم ڕووداوە بە ڕووداوی هەورەبروسکە ناسراوە. هەڵبژاردنی ژیانی سەختی قەشەیی کەبریتی بوو لەبەرەبەیانەوە کارکردن تاوەکو ئێوارە درەنگ، لەکارکردنەوە بیگرە تاوەکو دەرۆزەیی بەناوی خوادوە بۆ نان و خوێندنی لاتینی و تێگەیشتن لە کتێبە پیرۆزەکان، هەموو ئەمانە، هەڵبژاردنێکی ئیرادەگەریانەی مرۆڤێك بوو کە لەبەر ئەوەی لەخێزانێکی دەوڵەمەندەوە هاتبوو ، دوارۆژێکی ماتریالی ڕۆشن چاوەڕێی دەکرد، بەلام جگەلە ڕووداوی (هەورە بروسکە)، ئەوپێش ئەوەش لەگەڵ خودی خۆیدا بڕیاری‌بەقەشە بوونی دابوو....مارتین لوتەر لە ژیانی قەشاتیدا بەووردی کتێبی پیرۆزی بەزمانی عیبری و مێژووی فەلسەفە و ئەنتیکای خوێندبوو و لەزمانی لاتینیدا قوڵ بوو بووە ،

ئەمانەهەمووی ، جگە کاریگەری ئەو بە (هیومانیزم) وەك چەمکێکی ئاینی و لەهەمان کاتیشدا فەلسەفەی گریکی (یۆنانی)، سەرەتای فۆرمولە بوون و داڕشتنی (گومانێك) بوو لەمەڕ ئەو پەیوەندیەی نێوان کلێسا و خەڵکی و کلێسا و چەمکی پیرۆزی. کاریگەریشی بە هیومانیەتی ئاینی بەشێکی دیکەی لە بیری ئاینی ئەو پێکهێنابوو، هیومانیەت لای مارتین لوتەر بریتی بوو: گەڕانەوە بۆ کتێبی پیرۆز بەزمانی ئۆرگینالی عیبری و کتێبی ئینجیلی هیومانیزم.. سەرچاوە www.Luther.de

کەش هەوای سیاسی و فیکری سەدەی شازدەهەم ، کەش وهەوایەکی پڕ جوڵە و زۆرانبازی خوێناوی بوو، لەلایەك لەنێوخوی ئەڵمانیادا دەوڵەتێکی یەکگرتوو بوونی نەبوو، بەقەد ئەوەندەی شازادە و میرەکان لەنێو خۆیاندا هەرێمەکانیان دابەشکردبوو، ئەمە جگە لەوەی زۆرانبازی و جەنگ و دووبەرەکی لەنێوانیاندا گەیشتبووە ئاستێکی خوێناوی ، سەرەڕای ئەوەی بوونی دەوڵەتی فەرەنسای پادشایی و ئینگلیزی و قەیسەری ڕووسی و پیرۆزکردنی هەموو ئەم پادشایانە لەلایەن پاپی (ڕۆما) وە ، زیاتر ئەو دەلاقەیەی لەنێوان کلێسای ڕۆما و پاپ لەلایەك و شازادەکانی ئەڵمان لەلایەکی دیکەوە، گەورەکردبوو. لەسەرێکی دیکەوە پەرەسەندنی بیروڕای هیومانی وەك (کەرامەتی مرۆڤ) و (لێبوردن/ تۆلەرانس ) ..هتد تەوەرەی هیومانیەتی ئینجلی بوو کە بەناوبانگترین هیومانیستی قەشە ئێراسموس فۆن ڕۆتەردام بوو Erasmus von Rotterdam بیروڕاکانی ئەو کاریگەریان هەبوو لەسەر لوتەر، هەرچەندە ئێراسموس لەڕیزی (ڕیفۆرم) دا بوو، بەڵام لەدوایدا لەگەڵ لوتەردا کەوتنە جیاوازیەوە. هەروەها هاوەڵی ژیانی بیرمەندی لوتەر (فیلیپ میلانختۆن Philipp Melanchthon ) یەکێك بوو لە هیومانیستە ئاینیە ئینجیلیەکان.. ئەمانە هەمووی ، کاریگەرە سەرەتایەکانی پێگەیشتنی بیری (ڕیفۆرمخوازی ) مارتین لوتەر بوو کەلەدوایدا لە ٩٥ تێزە بەناوبانگەکەیدا لەدژ کلێسای کاسیۆلیکی و گەندەڵی ئۆتۆکراتیەتیان خۆی فۆرمولە کرد.

لەو زەمەنەدا قەشەکان بەناوی عیسای پیرۆز و ئاینی مەسیحی پیرۆزەوە سامانێکی ئێجگار دڕەندە و وەحشیان بۆخۆ گرد کردبۆوە، بەشێوەیەك کە پەنجەکانیان پڕ بوو لە ئەنگوستیلەی پڕ مرواری و بەردی گرانبەها و ئاڵتونی جۆراوجۆر، عەباکانیان لەئاوریشمی جوان و دانسقە دوورابوو، سامانی ئەوان ڕۆژ بە ڕۆژ لەزۆربووندا بوو.

لوتەر تێبینی دەکرد کەجوتیاران کەئامادەنین لەگەڵ قەشەکانیاندا باس لەگوناهەکانیان بکەن، بۆ نمونە لەو شارەی کەمارتین لۆتەر قەشەی سەرەکی بوو (ڤیتین بێرگ) Wittenberg ، جوتیاران دەچوون بۆ دەرەوەی ئەم شارە و لەبازاڕکانی یۆتەربۆگ Jüterbog یان Zerbst تسێرباست گونەهەکانی خۆیان دەشتەوە!!، نەك هەر گوناهی خۆیان ، بەڵکو گوناهی مردووەکانیشیان دەشتەوە، بەکورتی بەهەشتیان بۆ خۆیان زامن دەکرد.. ئەمە چۆن ڕوویدەدا ؟!، بەئاسانی دەچوون بۆ لای قەشەکان و (نامەی لێبوردن/ Ablaßbrief)یان دەکڕی و بەپێی بڕی پارەکەیان دەیانتوانی گونەهاکانیان بشۆنەوە ، کەئەمەش بەڕای لوتەر بەکارهێنانی گەندەڵی لێبوردنی خودایی و مەسیحیەتە بۆ قازانجی تایبەتی قەشە و کڵێسا و پاپی ڕۆما.

هەر لەو سەردەمەدا نامەکانی لێبوردنی خودایی کەلەبازاڕەکاندا دەفروشران، قەشەی گەورەی بەناوبانگی شاری براندنبۆرگ کەناوی ئالبرێخت Albrecht بوو لەلایەن کڵێسای پاپی ڕۆماوە ڕاسپێردرابوو نامەی لێبوردن بفرۆشێت، بەشێکی قازانجەکەی بۆ گەورە قەشە ئالبرێخت خۆی بوو، ئەویش لەلایەن خۆیەوە (نامەی لێبوردنی) قەشەی دۆمینێکانی (یۆهان تێتسل Johann Tetzel ) ی دەفرۆشتەوە ، کار وای لێهات کە قاچاخچی و دوکانداری گوناهە پاکردنەوە پەیدابوو، گەر هاتوو پیاوکوشتنیش بووایە!!، لەمەش زیاتر کار گەیشتە ئەو ڕادەیەی گوناهەی مردووانی خۆشیان بەپارە دەشتەوە ، یەکێك لە گووتە بەناوبانگەکانی قەشە تێتسل ئەوە بوو : ئەو کاتەی پارە لەدەخیلەدا دەزرنگێتەوە، ڕۆحی مردووانیش لەئاسماندا باز بازێنیانە..

لێرەوە بیرکردنەوەی مارتین لوتەر لە خاڵێکی قورسەوە دەستیپێکرد، کەئەویش چەمکی (دادپەرەوەری) یە بە مانا ئاینی و دووریە خودایەکەی، بەشێوەکی دیکە بڵێم بیرکردنەوە لەخودی نوێنەرانی خوادەوەند و دادپەروەری ئەوان و مەشروعیەتیان بوو بۆ بەخشینی گوناهەکان و هاوسەنگکردنەوەی تەرازووی پاکە و گوناهە لەسەر زەوی خودا. کێشەی مارتین لوتەر لەگەڵ کڵێسادا لەم خاڵەوە دەستیپێکرد، مارتین لوتەر پێی وابوو :( دادوەرێتی لە نێو ئیماندا خۆی دەبینێتەوە)، لوتەر لەوبڕوایەدابوو ئیمان و بڕوا هێنان مەسەلەی پەیوەندیەکی ڕۆحی گەورەیە لەنێوان مرۆڤ و خودا، مرۆڤ و

باوەڕی بەپیرۆزی، تاکە دادوەر دڵی کەسی بڕواکارە بە پیرۆزی و هەر خۆشی دەتوانێت گوناهەکانی خۆی بشواتەوە نەك دەزگایەکی کڵێسا بەپارە و سامان بۆی بشواتەوە.
(لەئەنجامی لێکۆڵینەوەی قوڵی لە نامە ڕۆمانیەکان ئەوەی بۆ دەرکەوت کە مرۆڤ دادپەروەری لەڕێگەی بەزەیی خوادوە بەدەست دەهێنێت ، نەك لە ڕێگەی خوڵقەوەکانیەوە، (١٧ .Röm) ، بەمانای دادپەروەری لەباوەڕەوە و بۆ نێو خودی باوەڕ دەگەڕێتەوە..

Luthers Thesenanschlag in Wittenberg.
http://www.mdr.de/geschichte

بەڕای لوتەر مرۆ خۆی وەکو پێغمبەر عیسا فەرمویەتی بونەوەرێکی خاوەن گوناهەی بەردەوامە و بڕوابوون و کاری بەردەوامی ڕۆحی لەسەر بڕوا بە نۆرم وبەها پیرۆزەکان ، وەهای لێدەکات کەبەردەوام بیرلەپاکێتی و گوناهە بکاتەوە، ئەم دوالیزەی گوناهە و پاکی تەنها لەئیمان و بڕوادا خۆی یەکلایی دەکاتەوە . گەڕانەوە بۆ بڕوا و بۆ خودی مرۆڤی ئیماندار و بۆ قەشە وەك یارمەتیدەرێکی ڕۆحی و گفتوگۆ و ڕاوێژ ، بەڕای لوتەر ڕێگەی ڕاستەقینەی نێزیکبوونەوەیە لە شتنەوەی گوناهە. ئەوە مرۆڤ و ڕۆحی خودی مرۆڤەکان و بڕوایانە بەپیرۆزی وپاکی و مەسیح و کتێبی پیرۆزە کە گوناهەکان دەشواتەوە، نەك کڕینی نامەی لێبوردنی کڵێسای ڕۆما و نوێنەرەکانیان!!. لەم بیرکردنەوە لوتەر لەو بڕوایەدابوو کە کڵێسا لە قەیرانێکی خراپدایە و پاپ و نوێنەرەکانیان دەسەڵاتی ئاینی بەخراپ و قازانجی خۆیان بەکار دەهێنن ، هەر لەم خاڵەوە کەوتنە نوسینی ٩٥ تێزە بەناوبانگەکەی لەدژی نامەکانی لێبوردن، ئەوەبوو لە بەرواری ٣١،١٠،١٥١٧ بەخۆی و چەکوشێکەوە لەسەر دەرگای کڵێساکەی خۆی چەند پەڕاوێکی داکوتی کە پێکهاتبوو لەنەوەد و پێنج تێزە بەناوبانگەکەی ، هەرچەندە ئەم تێزانە بۆ عەوامی خەڵك نەنوسرابوو ، بەڵام زۆر زوو لەناو خەڵکیشیدا بڵاوبۆوە. داهێنانی چاپکردن و هونەری چاپەمەنی لە ئەوروپا وایکرد زۆر زوو ئەو تێزانە لەلایبزیك و نورنبێرگ و شاری بازلی سویسرا بڵاوبێتەوە، دووهەفتەی نەخایەند کەلەهەموو ئەڵمانیادا بڵاوبۆوە.
تێزەکان لەلایەن شازادەکانی ئەڵمانەوە پێشوازی لێکرا، بەتایبەت لەکەسایەتیەکی ئاینی پایەبەرزی وەك لوتەرە وە سەرچاوەی هەڵگرتبوو ، گفتوگۆیەکی زۆری لەو

نێوەندەدا جولاندەوە، هەر لەنارەزایەوە بیگرە تاوەکو پشتیوانی کلێسا و قەشەکەکانی ناوچەکانی دیکەی ئەلمانیا. لێرەوە بەباشی دەزانم پێناسە باسێکی ئەم ٩٥ تێزانەبکەم.

ئەم تێزانە بەگشتی لە ٩٥ خالی ژمارە بۆ دانراو لەلایەن لوتەر خۆیەوە فۆرمولە کرابوو، لوتەر ئەم تێکستە گرنگەی بۆ خەلکی عەوام نەنوسیبوو، بەلکو بۆ قەشەکانی ئەلمان و و رۆمای نوسیبوو، شوێنای ئەو وەك قەشەیەکی بالا و تیۆلۆگێك لە کلێسای ڤیتینبێرگ ، وایکردبوو کە تێزەکان زیاتر رەواخواز کردەبن، بەتایبەت لوتەر لەو قەشانە نەبوو کەخاوەنی پارە و سامانێکی زۆربێت، لەگەل ئەوەشدا کەئەو دەیتوانی شوێنای خۆی بۆ کۆکردنەوەی سامانێکی بێشومار تەرخان بکات. رەوایەتی لوتەر لەوەدا بوو کەبەشێك نەبوو لەگەندەلی کلێسا و هیچ مێژوویەکی دوورو نێزیکی لەگەل سامان و ژیانی دنیایدا نەبوو.. ئەم دوو فاکتەرە رۆلێکی گرنگیان بینی لەبرواکردن بە رەوایەتی و ناوەرۆکی تێزەکانی ..

- ✓ لەتیزی ژمارە ٢٨ دا دەلێت : گومان لەوەدانیە کاتێك پارە لە دەخلیەکاندا زرنگەی بێت سووخۆر و قازانج خۆر و چاوچنۆکان زیاد دەکەن، بەلام ئەوە تەنها رابەری بەزەیی خودایە، رابەری کلێسایە، کە لەبەرامبەر ئیرادەی خودا دەوستێت..

- ✓ لەتێزی ژمارە ٣٦ دا دەلێت : هەر دیانێك کەپەشیمانی دەربرێت و راستگۆ بێت لە پەشیمانیەکەی، مافی تەواوەتی بەخشینی خودایی هەیە، بەخشینێك کە پێویستی بە نامەی لێبوردن نیە..

- ✓ لەتێزی ٣٧ دا دەلێت : هەموو کریست و ئیمانداریکی راستەقینە، زیندوو یان مردوو، مافی رەحمەت و خێراتی مەسیح و کلێسای هەیە، ئیدی گەر هاتوو نامەی لێبوردنیشی نەبێت..

✓ لەتێزی ٤٣ دا دەڵێت: مرۆ دەبێت لە حەزرەتی مەسیحەوە فێری ئەوە بێت کە بدە بێت بەهەژارن و یارمەتی نەداران بدات، ئەوە زۆر لەفرۆشتنی نامەی لێبوردن باشترە .

✓ لەتێزی ٤٤ دا دەڵێت : تەنها لەڕێگەی کردەی خۆشەویستەیەوە،خۆشەویستی گەشەدەکات. بەڵام لەڕێگەی نامەی لێبوردنەوە باش نابێت ، بەڵکو تەنها نیمچەتاوانێکی لەسەر لادەچێت.

✓ لەتێزی ٨٦ دا لوتەر بەڕاستەوخۆ هێرش دەکاتە سەر پاپی ڕۆما و دەڵێت : تێناگەم ، بۆچی پاپ کەئەمرۆ لەهەموو دەوڵەمەندێکی قەڵەو دەوڵەمەندترە، لەجیاتی ئەوەی پارە لەئیمانداران بسەنێت ،لەگیرفانی خۆی کڵێسای سانت پیتەر بیناناکاتەوە ؟.

سەرچاوە: ٩٥ Thesenwww.luther.de/

پێموایە لەم چەند نمونەیەوە لوتەر وەك ڕیفۆرماتیستێك دووپرسیاری گرنگ دەهاروژێنێت ، یەکەمیان (ڕەواخوازی ) و دووهەمیان (مۆراڵ ) ، لەنێوان ئەم دووانەشدا (دەسەلات ) یاری خۆی دەکات. ئیدی کڵێسا وەك دەسەلاتێکی ئاینی نەك لەو سەردەمەدا تەنها بەخشندەیی ڕەواخوازی بووە بە دەسەلاتی پادشاکانی فەڕەنسا و بەریتانیا و ڕوسیا، بەڵکو خۆشی دەسەلاتێك بووە لەسەروو هەردوو دەسەلاتەکەوە، هەر خۆشی سێنترالی بەخشندەیی مۆراڵ بووە ، بەمانایەکی دیکە (پاپ ) دەیتوانی ڕەواخوازی بدات بە پادشا و موبارەکیان بکات، پاپ دەیتوانی بڕوای ئیمانداران قۆرغ بکات و متمانە بدات بە دەسەلاتی پادشایەکانی ئەوروپا، پاپ پێوەدانگی مۆڕالی دەسەلات بوو، پاپ و کڵێسای ڕۆما ، هەردوو دەسەلاتە دنیا و ئاسمانیان لەدەستدابوو. بەجۆرێك کە کرینی گوناهەکانەکانیش ڕەوا بوو بەمەرجێك ڕازیبوونی کڵێسای ڕۆمی لەسەر بێت. بەڵام لەنێو ساڵی کریستدا. لەنێو بازنەی قەشاتیدا ، یەکێك دەردەکەوێت و هەموو

ئەم کردانە دەخاتە بەردەم گومانەوە. لەنێوخۆی ماڵدا باس لەچاکسازی دەکات، چاکسازیەك کە بەتوندی و ڕەقیەوە داوای گەڕانەوە دەکات بۆ سەرچاوەکانی ئاین، بۆ سەرچاوەکانی سەرهەڵدانی دەسەلاتی ئاینی مەسیحی بۆ (شێوە ژیانی) حەزرەتی مەسیح ، بەکوردی و بەکورتی گەڕانەوەیەکە بۆ ئەو مۆراڵەی خیانەتی لێکراوە!

لەم خاڵەوە ڕیفۆرمخواز دێت و دەڵێت : ئەوە سەرجەم سوستێم نیە کە ڕەواخواز نیە، بەڵکو بەشێکە لەسوستێم کەپێویستە چاکسازی تێدا بکرێت. لوتەر دەیگووت ئەوە ئاینی مەسیحی و کتێبی پیرۆز نیە کە هەڵەکاری دەکات، بەڵکو ئەوە ئەوانەن کەنوێنەرایەتی خۆیان بەکار دێنن بۆ کڕینەوەی گوناهە و سامان پێکەوەنان. لوتەر لەدوای ئەم تێزانە چەند تێزێکی دیکەی نوسی کەلەهەمان بابەتی پەیوەندی نێوان کڵێسا و دەسەلاتا و خەڵکی دەدوا، لوتەر دەیویست خودا لە نوێنەرە پارەخۆرەکانی جودا بکاتەوە!! بەمانایەکی دیکە دەسەلاتی ڕۆحی و دنیایی لێکتری جودا بکاتەوە و ئاین و پیاوانی ئاینی بگەڕێنێتەوە بۆ ئیمان نەك بۆ گیرفان. هەر بۆیە زۆر زوو کڵێسای کاتۆلیکی بڕیاریدا، لوتەر و ڕەدوکەوتووەکانی بە (بێ باوەڕ و کافر) لەقەڵەم بدەن، مێژووی ڕیفۆرماتسیۆن مێژووی سوتاندن و لەخاچدان و ڕاونانی نێوان کڵێسای کاتولیکە کەدەسەلاتی پادشاکانی ئەوروپایان لەگەڵدا بوو،لەدژی ڕەدوکەوتووەکانی لوتەر و لوتەر خۆی بوو کە بە ئیفانگیلیزم ناودەبران. گفتوگۆی نێوان ئەم دووهێزە، ڕەواخوازی کڵێسای کاتۆلیکی لەقکرد و ئیفینێگلیزم وەك باوەڕێکی ڕیفۆرمخواز بەتەوژمێکی دیکە پەیوەندی نێوان خەڵك و خودا و کڵێسای داڕشتەوە. تەوژمێك، جیاواز بوو .لەڕووی کۆمەڵایەتی و ئاینیەوە، ئەمەش لەشێوازی ژیانیانەوە خۆی بەرجەستە دەکرد.بۆنمونە قەشە ڕەدوکەوتووەکانی لوتەر جلی زۆر سادە و زبریان لەبەر بوو، ئەوان گیرفانیان نەبوو، پەنجەکانیان نەڕازابۆوە بەئەنگوستیلەی زێڕین و موتا و مووروی جوان.بە پێچەوانەی شێوەژیانی قەشەکانی ڕۆم و کاتۆلیك کەعەبا و جلەکانیان گرانبەها و جۆرێك بوون لە نمایشکردنی سامان و تێری، ڕیفۆرماتسیۆن و چاکسازەکان بە پێچەوانەی ئەوانەوە ، سەرەڕای توانای ئاینی و تیۆلۆگیان و پایەیان خەڵکانێك بوون سادە و ساکار و دوور لەنمایشکردنی سامان و ڕووکەشگەرایی بوون، یەکێك لەو ڕستە بەناوبانگانەی کەلەدژی کاتۆلیکەکانی سەدەی شازدە بەکاریان دەهێنا ئەوە بوو : حەزرەتی مەسیح گیرفانی نەبووە، نازانم ئێوە بۆچی هەتانە؟!...

لێرەوە گەڕانەوە بۆ خودا نەك بۆ كلێسا، گەڕانەوە بۆ باوەڕ نەك بۆ دەسەڵاتی پاپ و قەشە، گەڕانەوە بۆ كتێبی پیرۆز نەك نامەی لێبوردن ، سێ خاڵی جیاوازی و گفتوگۆ بوون كلێسای كاتۆلیكی زیاتر لاواز كرد و زیاتر دەسەڵات لە ئاین جیادەبۆوە و ئاینی دەگەڕانەوە بۆ شوێنای ڕۆحی و پیرۆزیەكەی خۆی و پەیوەندی مرۆڤی دەگەڕانەوە بۆ پەیوەندی نێوان خودا و مرۆڤ خۆی و پاشان هێزی ڕاوێژ بۆ پیاوانی ئاین، بەمانای سەرەتا پەیوەندی ڕۆحی باوەڕ لەناوەوەڕا خۆی ئاراستەایژ دەكات بۆ دەرەوەی خۆی ، نەك لە دەرەوە و لەڕێگەی قەشە و نامەی لێبۆردنەوە بۆ نێو ناوەوە ، ڕۆحی مرۆڤەكان پاكبكاتەوە..

كاری* لوتەر تەنها نوسینی ئەو تێزانە نەبوو، بەڵكو بەردەوام بوو لە نوسین و بڵاوكردنەوە و پەیوەندیكردن لەگەڵ خەڵكیدا. لوتەر تاوەكو مردنی ژیانێكی زۆر سادە و ساكاری نیمچە هەژارانەی خۆ هەڵبژاردە ژیا. دەبێت ئەوەش بڵێین كە وەرگێڕانی كتێبی پیرۆز لە لاتینیەوە بۆ سەر زمانی نەتەوەیی (ئەڵمانی) لێدانێكی دیكە بوو لە دەسەڵاتی كلێسای پاپی ڕۆما، ئیدی كتێبی پیرۆز ئەو كتێبە نەما كەتەنها قەشەكان بتوانن بیخوێننەوە بەڵكو هەموو كەسێك دەیتوانی بگەڕێتەوە بۆ كتێبی پیرۆز و بەزمانێكی سادەی نەتەوەیی لەدێرەكان تێبگات، لوتەر بەم هەنگاوەی دەیویست كتێبی پیرۆز بخاتە هەموو ماڵێكەوە ، ئەمەش لەو بڕوا پتەوەی سەریهەڵدابوو ، كەتەنها گەڕانەوە بۆ خودی باوەڕ و كتێبی پیرۆز گوناهە و چاكەكاری دەستەبەر دەكات ، نەك دەسەڵاتێكی كلێسا یاوەكو قەشەیەك، ئەم هەنگاوەش بەشێكی دیكەی بزوتنەوەی ڕیفۆرمخوازی (ڕیفۆرماتسیۆن) ی سەدەی شازدەبوو..

دیارە كەش و هەوای هیومانیەتی سەدەی شازدە و دابەشبوونی دەسەڵات و پشتگیری شازادە و ئەمیرە ئەڵمانەكان ڕۆڵی خۆیان بینی لە بڵاوبوونەوەی بیروڕا ڕیفۆرمیستەكانی لوتەر. گرنگترین كاری بزوتنەوەی (ڕیفۆرماتسیۆن) جیاكردنەوەی دەسەڵاتی ئاین و دەوڵەت بوو لەیەكتری، ڕێخۆشكەرێك بوو بۆ سەدەی ڕۆشنگەری ..

مارتین لوتەر ناهەقی نەبوو دوای ئەم هەموو نوسین و زۆرانبازیە، لەدوای ئەوەی گەورەترین چیرۆكی بزوتنەوەی ڕیفۆرمخوازی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بەجێهێشت، لە دواگەشتیدا بۆ چارەسەركردنی*كێشەیەكی كۆمەڵایەتیدا و لە ١٨,٠٢,١٥٤٦ ڕستەی خۆی بڵێت :ئای .. چیدی توانام نەماوە ، من زۆر هیلاكم ...

## فۆكۆ و چەمكی (شێوازی ژیان)

ئەوەی لەبزوتنەوەی ڕیفۆرماتسیۆنی لوتەریداسەرنج ڕاكێشە بوو . هێزی پاڵپێودنانی بوو لەبەرەنگار بوونەوەی كڵێسای كاسیولیكی كۆنە پارێز . شێوازی ژیانی) لوتەر و هاوبیرەكانی بوو . لەم خاڵەوە چەمكی (شێوازی ژیان) بەشێكی گرنگی هەموو كردەیەكی گۆڕانكاری و ڕیفۆرمخوازیە .. ئەوەی لەژێر زۆر ناونیشانی شێوازی ژیان) خۆی پێناسە دەكات ، دەتوانین بەمەبەستی ڕوونكردنەوە بڵێین: شێواز Style بریتی یە لەو سیفەت و كاراكتەرە گشتیانەی كە دەبێتە مۆركی گروپەیەك یاوەكو كەسێك لە بەڕێوەبردن یاخود جۆری كارێكی تایبەت، كەلەوانەیە جۆرێكی تایبەت لەژیان یاوەكو جۆرێكی تایبەت لە هونەر بە ستایلێك یاخود شێواز یان شێوازەیەكی تایبەت كاراكتەریزە و پێناسە بكرێت و خاڵی جیاكەرەوەی بێت لەوانی دیكە. لێرەوە شێوازی ژیان ، ستایلی ژیان، شێوازێكی ژیانی تایبەتە كەمۆدێلێكی تایبەت لە هەڵس و كەوت و جیهانبینیەكی تایبەت ئاوێنەیی دەكاتەوە. بۆ نمونە ئەوەی سەرنج ڕاكێش بووە لەژیانی لوتەر و ڕەدووكەوتووە و هاوڕیفۆرمخوازەكانی ، ئەو شێوازی ژیانەیە كە بەسەریان بردووە. شێوازی ژیان خاڵی جیاكردنەوەی تاكە (ئیندیڤیدواڵە) لە مێگەلی كۆمەڵایەتی ، یاخود خەڵكی ڕەشۆك و مەسلەكی و بەڕێوبەرانی ئاینی و دەسەڵات لەلایەك و گروپەی ڕیفۆرمخواز لەبەرەیەكی جیاوازدا. بەمانایەكی دیكە: لەڕێگەی شێوازی ژیانی تایبەتەوە فیگورێكی تەواو جیاواز لەنێو ژیانێكی باودا دەردەكەوێت و بەشێوەیەكی دیكە ژیان بەڕێوەدەبات.

باتۆزێكی دیكە بێینە بەردەم بیرمەندێكی وەك (فۆكۆ) و ئەم چەمكە(شێوازی ژیان) ی لێ قەرز بكەین و پاشان هەوڵبدەین لەڕێگەی ئەم چەمكەوە بەشێك لە قەیرانی (ئەقڵیەتی ڕیفۆرم) و كولتوری سیاسی كوردی تێبگەین ...

فۆكۆ دەربارەی (شێوازەی ژیان) دەڵێت : ئانتیكا هەرگیز نەوەستاوە لەپرسیاركردنی بەردەوام لەمەڕ شێوازەكردن، شێوازەكردن بەپەیوەندیداركردن لەگەڵ خودی خۆدا ،بەمانای بەشێوازەكردنی ژیان و شێوازی ژیان بەسەربردن، بەشێوازەكردنی هەڵس و كەوتكردن لەبەرامبەر ئەوانی دیكەدا. ئانتیكا و گریكی كۆن نەوەستاون لەپرسیاركردن

لەوەی ، ئایا چۆن بتوانرێت لەکۆمەڵێك بواری جیاوازی هەڵس و کەوتەوە شێوازێکی هاوئەنگ و یەکدگیر پێك بهێنرێت. شێوازێکی پێناسەیی یەکگرتوو پێکبهێنن. لەڕاستیدا دۆزینەوەی ئەو شێواز و ستایلە ڕێخۆشکەرێك بووە بۆ پێناسەکردنی خود . یەکگرتوویەك بۆ (مۆراڵێك بۆ شێواز) لەمەملەکەتی ڕۆم و لەسەدەی دووهەم و سێهەمدا بیری لێکرایەوە، لەهەمانکاتیشدا یەکسەر بووە کۆدێك و هەقیقەتێك .

سەرچاوە : میشێل فۆکۆ. گەڕانەوەی مۆڕاڵ . دەزگای بلاوکردنەوەی دیتریخس ١٩٩٨
Foucault. Die Rückkehr der Moral.
Diedrichs Verlag ١٩٩٨. S ٤٨٥

ئەوەی لەو ڕستە چڕ و پڕانەی فۆکۆ دەرئەنجامی دەکەین ، ئەوەیە، کە گریکی کۆن و شارستانی کۆن (ئانتیکا) بەردەوام پرسی کراوەی هەبووە لەمەڕ (شێوازی ژیان) . ئەم پرسە بەڕای فۆکۆ یەکگرتوویەکی بەخۆیەوە نەبینیوە ، وەك لەوەی لەوەی لە سەردەمی شارستانی ڕۆمانیەکاندا فۆرمی تایبەتی خۆی هەبووە. ئەوەی لەژێرئەم چەمکی ستایل و شێوازە تێیدەگەین، کۆمەڵێك هەڵس و کەوتە لەبەرامبەر ئەوانی دیکە، فۆرمێکە پێویستی بە ئەخلاقیات و مۆراڵی تایبەت بەخۆ هەیە، کەئەمە فۆکۆ بە (مۆراڵی شێوازە) ناو دەبات. مۆراڵی شێواز ، ئەو نۆرم و پرنسیبانەیە کە شێوازێکی ژیان لەوی دیکە جیادەکاتەوە ، بەمەش (تاکڕەو و تاکخواز ) جۆرێك لە بوونگەرایی خۆی دەسەلمەنێت، بەمانایەکی دیکە دەمانگەیەنێتە بەردەم بە (شێوازێکی بونگەرایی)، یاخود دەبێتەمەسەلەی بوون و (لێرەبوونی) تاك لەنێوەدێکی کولتوری و کۆمەڵایەتیدا.
گریکی کۆن بەڕای فۆکۆ ئەم پرسیارەیان بەردەوام دووبارە کردۆتەوە و لەچوارچێوەی دەوڵەت و کۆمەڵگە و جۆری پەیوەندیەکاندا گفتوگۆیی فەلسەفیان لەسەر کردووە. ئەم پێیوایە ئەمۆراڵی شێواز لەئانتیکادا (ژمارەیەکی کەمی تاکڕەو و ئیندوڤیدوالن کە داوای ئەوە ئاکەن گوێڕایەڵی شێمایەکی تایبەتی هەڵس و کەوت بن( فۆکۆ / هەمان سەرچاوە) بەمانای بوونی پاکەتێکی تایبەت لە مۆراڵ و شێوەی هەڵس و کەوت و داسەپاو نیە کەکەسەکان پابەندبن پێوەی ، بۆنمونە و بۆ مەبەستی ڕوونکردنەوەی ئەم دەستەواژەیە. لەئاینەکاندا شێمایەکی تایبەتی ئەخلاقیات و نۆرمی چاکە و خراپە هەیە کەدەبێت کەسەکان پابەند بن پێوەی ، لەوانەشە لەئایدۆلۆژیایەکی تایبەتیشدا ئەمە بوونی هەبێت، بەلام لە گریکی کۆندا شێمایەکی یەکگرتوو بوونی

نەبووە، بەقەد ئەوەندەی جۆرێك لە كراوەیەك هەبووە لە جۆری شێوازی ژیان، بۆنمونە زیاتر باس لە كەمینەیەك كراوە كە پێویستە شێوازێكی تایبەتی ژیانی هەبێت ، بەتایبەت كەسە ئازاد و سەربەستەكان و فۆرمی سەربەستیەكان ، (بۆنمونە چەندەها فۆرمی ئازادی هەبووە، ئازادی سەرۆكی دەوڵەت ..فۆكۆ ..هەمان سەرچاوە) .. كەواتە ئێمە بەپێی ئەم چەمكەی فۆكۆ و ڕاڤەكردنی لەبەردەم چەمكێكی خوێندنەوەداین . كەبەچەمكی (مۆراڵی شێوازی ژیان ) پێناسەدەكرێت.

## چەمکی شێوازی ژیان و نەوەکان

نەوەکان وەکو لەگوتارێکماندا (نەوەکان و گەڕەلاوژەکانیان/ بڕوانە گۆڤاری متمانە ژمارە ١٠ ساڵی ٢٠٠٦) پێناسەمان کردووە، مەرج نیە تەنها لەجیاوازی تەمەن و زەمەندا خۆی ببینێتەوە، بەڵکو زۆرجار نەوەتازەکان پێکهاتەیەکی فیکری وفەلسەفین، دنیابینیەکی دیکەن لە نێو کولتور و کۆمەڵگەدا، بەڵام ئەوەی کەهێڵی جیاکەرەوەیە، خەسڵەتە دیارەکانی ئەم گروپەیە لەوی دیکە لەڕوانینان بۆ پاشەڕۆژ کەزیاتر گونجاوترن لەگەڵ گوتارێك، کەئەز بەگوتاری (دواڕۆژخواز) ناوی دەبەم، بەمەرجێك نەوە کۆنەکە لەوبازنەیەدان کەدەیانەوێت دنیای هەبوو وەکو خۆی بمێنێتەوە! ئەمەش کرۆکی کێشە و مل ملانێیە لەنێوان دوونەوەی جیاوازی سیاسی و فیکری و لە نێو بازنەیەکی تایبەتی سیاسی یان کۆمەڵایەتیدا. بەهەمان شێوە دابەش بوونیانە بەسەر (ئیرادەیەك لەگۆڕان) کە نەوەی نوێ هەڵگری دەبێت و نەوەی کۆنینەش خاوەنی (ئیرادەیەکە بۆ ڕاگیری) !!. لەوانەیە ئێستا هەر یەکێك بڵێت: ئەمە زۆرانبازی نەوەکان نیە ، بەڵکو زۆرانبازی ئیدیا و جیهانبینیەکانە!!، کەداینەمۆی کاری سیاسی و فیکری سیاسیە . ئەمە لەسەرێکەوە ڕاستە، بەڵام ئەوەی خاڵی قورس و پێچە بەدەوریە ، شێوازی گوتارە لە گوتاری گۆڕان وئایندەیی یاخود شێوازی گۆڕانکاری و مانەوەخوازی، کەدەکرێت لەسەرێکی دیکە بەزۆرانبازی کۆنزەرڤاتیف و گۆڕانکاریخواز لەقەڵەمی بدەین، بەڵام بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی نەوەی نوێ لەگەڵ گۆڕانکاریە و لەبەرەی گۆڕاندایە.. دیارە ئەم چەند دێڕە ئەم ئیشکالیەت و کێشەبەندیە تیۆریە چارەسەرناکات ، بەوەی بەکێ دەگوترێت نەوەی نوێ و مەرجەکانی چین و چۆن دەجوڵێن، بەڵام بەگشتی ئێمە لە گۆشەنیگای (گوتاری گۆڕان و ئایندەیی ) پێناسەی دەکەین ، کەدەشێت بەچەندەها دووری جیاوازی دیکەوە خوێندنەوەی دیکەی بۆ ئەنجامبدرێت.

نەوەنوێیەکان یەکەم هێزن کەبە پڕۆسەی (ڕیفۆرم)ە وە دەنوسێن و هێزی ڕاکێشانی ڕیفۆرم لەوەدایە، کە گەورەترین پاڵپشتی لە نەوەی نوێی سیاسی و فیکری و پیشەیی بۆ خۆی قۆرخ دەکات ، ئەمەش نهێنی بوونیانە بە هێزێکی دیکە لەنێو کۆمەڵگە و نهێنی بەئەنجامگەیاندنی پڕۆسەی گۆڕانکاریە لەهەموو بوارەکانەدا. ئەو گروپە

سیاسی و فیکریەی بیەوێت ڕیفۆرم بەئەنجام بگەیەنێت ، ناتوانێت سەرکەوتن بەدەست بهێنێت ، هەتاوەکو گرەوی خۆی لەسەر نەوەی نوێ دانەنێت. نەوەی نوێ خاوەنی ئەو وزەیەیە کە نەك تەنها ڕیفۆرمخواز دەیدۆزێتەوە و برەوی پێدەدا. بەڵکو هەموو ئیدیا و کولتورێکی نوێ پشتی پێدەبەستێت.

بەڵام ئەمانە چ پەیوەندیان بە(شێوازی ژیان) وە هەیە. چ کێشەبەندیەك (ئیشکالیەت) هەیە لەنێوان ئەم شێوازی ژیان و ڕیفۆرمخوازان و لەنێوەندیشیانە نەوەی نوێ !!. ئەم هاوکێشەیە چۆن لێکدی جودا دەکرێنەوە و چۆن چۆنی پێکرا گرێدەدرێن و دیالەکتیکی نێوانیان چۆنە؟!. ئەمە ئەم پرسیارانەن کەبەدرێژایی ئەم گوتارە کێشەبەند ئامێزی دەکەین و مەودایەکی کراوەیی ڕاڤەکردنی بۆ جێدێڵین.

شێوازی ژیان وەکو باسمانکرد، فیگورێك (کەسایەتیەك) بەرهەمدێنێت کەبەشێوەیەکی جیاواز دەژی ، شێوە ژیانێکە بە کۆمەڵگە قووت ناچێت و سەرەتا ئەم فیگورە نامۆیەکی دەرەکی و خۆ هەڵقوڵتێنەرێکی ژیانی ئاساییە. لێرەوە فیگوری شۆڕشگێڕ (وەك نمونەیەك) ، فیگورێکی جیاوازە بەستایلێکی جیاوازی ژیانەوە، یاخود گرویەیەکی قژدرێژ و ڕیش درێژی (هیپی) سالانی شەستەکان ، شێوەژیانێکی تایبەت بوون کە خوێنەر لەڕۆمان و چیرۆکەکانی هەردوو نوسەری مەغریبی (موحەمەد زەفزاف) و (موحەمەد شوکری) دا مەزندەیان دەکات، یاخود لەهەشتاکانی نێوەندی ئەدەبی و سیاسی و کوردیماندا، دوو فیگوری جیاواز هەبوون . یەکێکیان مارکسیستێکی شۆڕشگێڕ و دووهەمیان وجودیەکی خەیاڵی، هەریەکیان لەگەڵ جیاوازی بیروبۆچوون و جیهانبینیان . (کەدەتوانرێت لەسەر ئاستێکی ڕێژەیی گفتوگۆیان لەسەر بکرێت)، جیاواز بوون لەهەڵبژاردنی شێوازی ژیانیان، لەوانەیە وەك نمونەیەك بتوانین بڵێین کە مارکسیستەکان زیاتر کۆمەڵایەتی خواز بوون و زیاتر گرنگیان بە گفتوگۆ دەدا و قەناعەتکردن و بەگرویەیی و سۆسیالی لەژیاندا و لە پەیوەندیەکاندا بۆ ئەوان لەکارە گرنگەکانیان بوو، بەمەرجێك ئەو کەمە خەڵکانەی کە لەژێر ناوی وجودیەت خۆیان ناساندبوو ،مەسەلە کۆمەڵایەتی و قەناعەتکردن بەئەوانی دیکە بۆ هاوکاریکردنی یەکتری ، لە پێناو گەیشتن بەئامانجێك ، جێی گرنگی نەبوو !!.. تەنانەت لەشێوەی جل و بەرگدا مارکسیتەکان دووربوون لە لوکسوسیەتی جلو بەرگ ، هیچ ڕەنگێکیان بەسەر ڕەنگێکی دیکە بەباشتر نەدەزانی، وجودیەکان بەپێچەوانەوە کراسی ڕەش و

ساقۆی ڕەشی درێژ و کاوبۆی نیمچەدڕاو مۆدەی ئەوان بوو. دیارە ئەمانە لەبەر سیخانخبوونی کۆمەڵگە بە ترادیسیۆن و هەڵس و کەوتی خێڵەکانەوە ، کەشارەکانمان لەکۆبوونەوەی کۆمەڵێك خێڵ نەبێت هیچی تر نەبووە، نەیاندەتوانی ببن بە (کولتێك) یاخود بەشێوەکولتورێکی تایبەت، بەڵام هەبوونیان بەشێوازێکی ژیانەوە نکوڵی لێناکرێت....

لەسەر ئاستی تاکڕەویش (ئیندیڤیدوال) ،شێوازی ژیان خاڵی جیاکەرەوەی ئەمە لەوی دیکە، ناکرێت فیگورێکی ڕیفۆرمخواز بیت بە شێوە ژیانێکی بیروکراتیەوە!، ڕیفۆرمخواز ئەو کەسەیە جوڵە دەخاتە نێو ژیانی ڕاوەستاوی کۆمەڵگە، شێوەژیانێکی دیکە پێشکەش دەکات، ئەمەش بەڕێزان نهێنی هێزی ڕاکێشانی نەوەی نوێیە و بیرخوازی نویە بۆ پرۆسەی نوێبوونەوە و ڕیفۆرم ، لێرەوە دەتوانین بڵێین کەئەوەی ڕیفۆرم بە نەوەی نوێ گرێدەدات ، شێوە ژیانی نوێیە ...

## ڕیفۆرمخوازی کوردی و قەیرانەکانی ڕیفۆرم

لەم ماوەیەی دوایەدا کۆمەڵێك سەرکردە و کادری سیاسی، بانگەشەی ڕیفۆرمیان کرد و کێشەیەکی سیاسی لەسەر شێوەی دەسەلات هەڵگیرسا ، پەیوەندی سەرکردایەتی و سکرتێری گشتی و دیاردەی گەندەڵی ئیداریش باسی لێوەکرا. ئەو جۆرە ڕوانینگیریەی (ئینتیباع) سەرەتا ئەم بانگەشەیە هاروژاندنی ، ئەوەبوو ، کەکۆمەڵێك کادێری سیاسی حزبێکی سۆسیال دیموکراسی کوردی کەلەئاستی لێپسراوێتیدان، پەیوەندیەکانی حزب لەنێو خۆیدا دەخەنە بەردەم پرسیار و لەئاستێکی دیکەشدا پەیوەندی نێوان حزب و حکومەت و پاشان حکومەت و خەڵکیان خستە بەردەم لێدوان .. ئەوەی تەواوی سێ لاپەڕەکەی بخوێندایەتەوە، دەکەوتە سەر ئەو بڕوایەی کەلەبەرامبەر پلاتفۆرمێکی نوێدایە. ئامانجی ڕیفۆرمکردنەوەی سەرجەم دۆزی سیاسەت و دەسەڵاتە، گەڕانەوەی سیاسەتە بۆ کولتورێکی دیموکراسی ، بەوەی دەسەلاتی سکرتێری گشتی سنوردار دەکرێت ، نەك هەر ئەوە ، بەڵکو بە ڕوونی ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە (لەئەنجامدا گەندەڵی دارایی، گەندەڵی سیاسی ، گەندەڵی کارگێڕی و بەڕێوبەرایەتی،تەنانەت گەندەڵی خوو و ڕەوشت ، سەرانسەری دام و دەزگاکانی حیزب و حکومەتی گرتۆتەوە

...) سەرچاوە: نامەی بەڕێزان نەوشیروان موستەفا و کۆسرەت ڕەسوڵ و عومەر سەید عەلی بۆ بەڕێز سکرتێری گشتی ٢٠٠٥.

ئەوەی ئەم سێ لاپەڕەیە بخوێنێتەوە دەکەوێتە سەر ئەو بڕوایەی کە گۆڕانکاریەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئیداری بەڕێوەیە و ئیدی سەردەمی (ڕیفۆرمی کوردی ) بۆ یەکەمجار ڕووی شەفافیەتی خۆی وەدەردەخات ، زۆر لە نوسەران و بەشێك لە کادێرە خەیاڵاویەکانی دەرەوەی وڵات ، تەنانەت بەشێکیش لەوانەی لەتەواوی پێکهاتەی سیاسی و کۆمەڵایەتی حزبەکەیان تێنەگەیشتوون، مەزندەی ئەوەیان کرد کەئیدی سەردەمی کاریزمای باوکسالاری حزبی کۆتایی پێدێت و دەرخستنی جیاوازیەکان ئاوەها بەئاشکرا ئاماژەیەکە بۆ مۆدێرنیزە بوون و دیموکراسیزەبوونی حزبی سیاسی.. بەڵام ئەمانە هەمووی وەك بڵقی سەر ئاو زۆر زوو تەقین و هەموو ئەم ڕیفۆرمە بووە هۆی دابەشبوونەوەی جارێکی دیکەی دەسەڵات لەنێو خۆدا ، دابەشبوونێك لەنێو دەستەیەکی دیاریکراوی (خۆتەیمانکردوو) بە دروشمەکانی پیرۆزی و موقەدەس ، ڕیفۆرم لەبەیاننامەیەك زیاتر هیچی دیکە نەبوو، ئەوی دیکەی لەو دیوو پەردەکانی دانوستان و برابەشکردن چارەسەرکرا. ئیدی کادێری سیاسی خەیاڵاوی کە لە کوتلەبازی بێزاربوو جارێکی دیکە خۆی لەنێو دابەشبوونێکی دیکەی کوتلە بازیدا بینیەوە ، یەکێکیان کوتلەی سەرۆکن وئەوانی دیکە کوتلەی ڕیفۆرم ،لەداویدا دیسانەوە زۆرانبازی کوتلەکان دەستپێکردەوە بۆ گرتنە دەستی شوێنای حکومی و ئیداری و قازانجی کەسی . ئەو پرسیارەی کەدەکرێت ئەوەیە : بۆچی ناتوانرێت پڕۆسەی ڕیفۆرم ئەنجامبدرێت؟!. لەوانەیە ئاسانترین وەڵام و لەهەمانکاتیشدا کێشەبەندترین وەڵام ئەوە بێت ، کە بەنێو ڕیفۆمیستەکان هەڵگری خەسڵەتەکانی ڕیفۆرم نین!!.

ڕیفۆرم بەڕێزان پێویستی بە کولتورێکی تایبەت بەخۆی هەیە، کولتورێك گەشەکردوو و خاوەن گوتارێکی ئایندەیە، ڕیفۆرم لە تەرح و کرانەوەیدا جیهانبینیەکی ئاشکراو ڕوون و شەفاف و عەرەب گووتەنی خاڵ دەخاتە سەر وشەکان. ڕیفۆرم خاوەنی ئاسۆیەکی کراوەیە بۆ نەوەکانی داهاتوو، خاوەنی گوتارێکی ڕەخنەیەکی زانستی شیکاریە، بەلاپەڕەیەك و دووان کۆتایی پێنایەت. ڕیفۆرم لەسەرێکی دیکەوە گردبوونەوەیەکی کۆمەڵایەتی، سیاسی ، کولتوریە، بێگومان لەسێ سەرکردە پێکنایەت!!، بەڵکو دەربڕینە لەڕەخنەیەك کەزەمەنێکە لەبەر هەر هۆکارێك بووبێت جڵەو کراوە، بەڵام

لەکاتێکدا کەئەو هەستە گەشە دەکات بەگووتن و ئاشکراکردنی ئەو ڕەخنانە، لەگەڵیشیدا هێزێکی نوێ دەهێنێتە نێو دەزگای کۆمەلایەتی و سیاسیەوە. ئەمە برادەران ، پرۆسەیەکی دوور و درێژ و تیۆرە و ململانێی فیکریە وەك هەنگاوی یەکەم ، پاشان ووردەکاری پراکتیکی هەیە وەك کارە ئیداری و دابەشکردنەوەی دەسەلات و پەیوەندیەکانی بەدوادا دێت. بەکورتی و بەکوردی ، ڕیفۆرم خاوەنی پرنسیبەکانی خۆیەتی کەنەك تەنها تیۆری نین ، بەڵکو کردەین و تیژ بڕن و خاوەنی کادێری ئامادەکاری خۆیەتی. جگە لەو سێ سەرکردە بەڕێزە و کوتلەکانیان نەبێت، کەلەوەوپێشیش هەبوون، هیچ کادێرێکی دیکە نەبوو سیمینار بگێڕێت، قسان بکات، بۆ ڕۆژنامەکان بدوێت، نەخشەی داهاتوو و تەشکیلەی داهاتووی حکومەت و کەسەکانی ناو بنێت ، گەندەڵی و هۆکارەکانی شیکاربکاتەوە، هەر کوتلەکۆنەکانی ڕەدوو کەوتووی ئەو سەرکردە بەڕێزانەن، لەکوتلەی فلان یان فیسارەوە ، ناوی خۆیان نا کوتلەی ڕیفۆرم و کوتلەی سەرۆك !!..ئەمە تراژیدۆکۆمیدی کولتوری سیاسی حزبێکی سۆسیال دیموکراتی کوردیە کەگۆڕانکاری و مل ملانێ تێدا لە ئاستی قسە و ناولێناندایە نەك تیۆرەی سیاسی ..

لێرەدا ئەز نامەوێت لەم قسانەی سەرەوەمدا بەوە تاوانبار بکرێم کە لایەنگری (ڕیفۆرم) نیم و ئیدی بەپێی ئەقڵی دابەشبووی کوتلەگەرایەوە ، ئەزێك کە پەیوەندیم بەهیچ پارتێکی سیاسیەوە نیە، بچمە خانەی کوتلەکەی دیکە..مەسەلەکە پرسیاری کولتورێکی سیاسیە کەلەقەیراندایە، نەك حزبێك!، کاتێکیش حزبێکی سیاسی نێو گۆڕەپانەکە، ڕۆشنبیرێکی جدی، ڕۆژنامەیەك دەکەوێتە نێو تەنگەژەی فیکری وسیاسیەوە ، ئەوا کێشەبەندی ئەو لە خانەی خودی خۆیی دەردەچێت و دەبێت بەکێشەیەکی ڕۆشنبیری گشتی و کاریگەری هەیە بۆ سەر ژیانی کولتوری کۆمەڵگە، گەر لەو بڕوایەدابین ،حزب بیەوێت و نەیەوێت ، جۆرێکە لەدەزگای کۆمەلایەتی و بەشێکە لەزۆرانبازی کۆمەڵگە و خەون و مل ملانێیەکانی .

ئەوەی لەم چیرۆکە کورتخایەنەدا جێگەی سەرنجە ، ئەوەیە ، کەبۆ یەکەمجارە (ڕیفۆرم) وەك چەمك بەکاربهێنرێت و گروپەیەك لەسەرکردەکان بیکەن بەماڵ بەسەر خۆیانەوە،کەلەناوەڕۆکدا دابەشبوونەوەیەکی نوێی دەسەلات بوو لەنێوان سەرۆك و سەرکردەکانی دیکە ، کەدەتوانینی بە(کۆدێتایەکی سپی) ناوی بەرین .

ئەمە بەشێکی وەڵامەکەمان بوو لەمەڕ: بۆچی نەتوانرا پرۆسەی ڕیفۆرم ئەنجامبدرێت؟! بەشێکی دیکەی وەڵامەکەمان ، پرسی ڕیفۆرم و نەوەکانە، ئەو ڕیفۆرمەی سێ لاپەڕەکە بانگەشەی بۆ کرابوو ، دەربڕین نەبوو لە خواستی نەو نوێیە سیاسیەکان ، بێگومان ئەگەر نەوەی نوێی سیاسی بوونێ هەبێت!. ئەمانە هەمووی گلەیی و شێوە هەڕەشەیەکی (پیرە سیاسیەکان) بوو لەیەکتری ،لەئەوانەی تۆزێك لەخۆیان (پیرتر) بوون . بەڕێزان ئەم دێڕانە بخوێننەوە : (سکرتێری گشتی تەمەنی لە ٧٠ ساڵ تێپەڕیوە ، کاتی ئەوە هاتووە ، ئیتر وەکو (ڕەمزێکی بەڕێز) خۆی لەدەست تێوەردانی ڕۆژانەی یەکێتی بکشێنێتەوە.. هـ.س.پ) . ئەم ئەوی دیکە تاوانبار دەکات بە جۆرێك لەپیری و لاوازی حوکمی لۆژیکی و دەستەگەرایی و خزم خزمێنە و مەحسوبیەت.. ئەم نوسینە ئەو قسە ئاساییانەن کە لەسەر جادەو کۆڵانەکان دەکرێن، لەهەموو شوێنێکی ئەم وڵاتەدا ، تەنانەت وەزیرەکانیش ئەم جۆرە (بۆڵە بۆڵە) دەکەن، بەڵام ئایا دەبێت (ڕیفۆرم) دووبارە کردنەوەی بۆڵە بۆڵێك بێت کەهەمووان دەیزانین؟، یاخود دەبێت داڕشتنەوە و نەخشە بۆکێشان و وەرقەیەکی کارکردنی درێژخایەن بێت بۆ سەرجەم پێداچوونەوە بەو بنەما و کارانەی لەوپێش ئەنجامدراون.. ڕاستە هەموو ڕیفۆرمەکان لەدنیادا سەرەتا بە چەند لاپەڕەیەك و چەند هێڵێکی گشتی دەستپێدەکەن ، پاشان دەبێتە بەرنامە و نەخشەکێشان ، هەروەك لەنمونەی ٩٥ تێزەکەی مارتین لوتەردا ئاماژەمان پێدا. ئەمە جگەلەوەی نابێت ئەوەمان لەبیر بچێت کەدوای هەموو وەرقەیەکی ئاوەها کەبانگەشەی ڕیفۆرم دەکاتەوە ، بەرنامە و نوسین و پلاتفۆرمی دیکە دەنوسرێت، ئەکە جگەلەوەی چەندەها جوڵە و گفتوگۆی سیاسی و ڕۆشنبیری هەیە کەجیاوازیەکان قوڵتر دەکاتەوە و سنورەکان دیاری دەکات. ئارگومێنت و حونجەتکاری نوێ دێتە کایەوە بۆ نمونە وەکو باسمان کرد کە (ڕیفۆرمستانی لوتەر) دەیانگووت : مەسیح هەرگیز گیرفانی نەبووە ، کەچی ئێوە پەنجەکانیشتان وەکو گیرفان زێڕ و بەردی نایاب بەخۆی هەڵدەگرێت.. لەهەموو شوێنێکی سەدەی شانزەدا گفتوگۆی جیاواز بوو لەسەر پەیوەندی مرۆڤ و خوداوەندو کەنیسە و ئەوەشی بازنەی ئەم گفتوگۆیانەی زیاتر گەرمتر دەکردوە، نوسینەکانی لوتەر خۆی بوو ، لەدوای ئەو ٩٥ تێزە لوتەر کتێبێکی دیکەی نوسی، ئەمجارەیان بەزمانێکی سادە کەخەڵکی عەوام تێبیگات ، تێزەکانی شیکردەوە . هەموو ڕیفۆرمێك گەر ڕیفۆرمێکی ڕاستەقینە بێت، خاوەنی

پێشینەیەکی تیۆری و فیکریە و پرسیاری جۆراوجۆر دەهاروژێنێت، بەلام بەداخەوە ئەو ریفۆرمستانەی کەبانگەشەی ریفۆرمیان کرد نەك هەر خاوەنی تیۆرەیەکی نوێی نەبوون لەمەڕ (پەیوەندیەکانی دەسەلات بەخۆی و دەرووەی) ، بەلکو ئامانجیان دابەشکردنەوەی دەسەلات بوو، دابەشبوونێك لەسەر هەمان هەیکەل و تەشکیلەی دەستەگەرایی پێشوو ، ئەوەی کەگۆرا چەند سەلاحیاتێك و بەرژەوەندیەك بوو لەیەکێکەوە بۆ ئەوی دیکە و دابەشکردنەوەیەکی دیکەی بەشی هەر یەکێك بوو لە کێکی دەسەلات و ماڵ !. ئیدی دووبارە ریفۆرم لە بواری سیاسەت و هەڵبژاردنی نوێ لەسەر بنەماکانی بیری نوێ و پڕۆژەی نوێ و پاکسازی و چاکسازی دەزگاکان لەنێو تەمومژی زانیاری و دانوستانی پشت پەردەکانەوە لەبیرکران، ئەوەی ڕوویدا گۆڕینی فلان بوو بەفیسار ، ئەوا زەمەنێك بەسەر ریفۆرمیستەکان تێپەڕ بوو و ناوی خۆشیان ناوە دەستەی (ریفۆرم) ، نەك هەر ریفۆرم بەئەنجام نەگەیەنرا ، بەلکو بارودۆخی حکومەت و دەسەلات لەجاران خراپتر بوون . ئەوەتا جارێکی دیکە چەند وەرقەیەکی دیکە بەرهەمدێنن و کۆمەڵێك کادێر وسەرکردەی دیکە باس لەریفۆرم دەکەنەوە نوسیویانە کەلەوەتەی حزب بوونی هەیە لەزەمەنی شاخ و شاریدا ، کاتی ئاوەها سەختی بەخۆیەوە نەبینیوە، نوسیوویانەکە گەندەڵی بۆتە مۆرکی پەیوەندیەکان .. ئەمەو زۆر شتی دیکە ..

ئەم گروپەیەش هەر وەك گروپەی یەکەم ، بۆ لە بۆڵیانە و ئێستا وای لێهاتووە ، هەموو کەسێك دەیەوێت ئەم بۆڵەبۆڵانە دووبارە بکاتەوە بۆئەوەی لەژێر ناوی (ریفۆرم) دا گەندەڵی خۆی بشارێتەوە، خۆی بخاتە بەرەی ئەوانەی دیکەوە کەدژی گەندەڵی ئیدارین ، کەچی گەر سەیری لیستی مووچەی رەسمیان و ژیانی ڕاستەقینەیان بکەیت ، نەك هەر جیاوازی ، بەلکو دەلاقەیەکی ئێجگار ترسناك لەنێوان ئەم دووانیەدا بەدی دەکەین .. ئیدی کێن ریفۆرمیستەکان؟! ، ئایا هەر بەهەقەت بوونیان هەیە؟! ، یاخود هەر بوونێکی خوتبەبێژی و قسەفرێدانن و هیچی دیکە !! .

نەوەی نوێ لەئەنجامی ژیانی لەگەڵ ئەم کەش و هەوا سیاسی و دەرئەنجامەکانی ، هیچ پرۆسەیەکی ریفۆرمی ئاوەها بەهەند وەرناگرێ ، نەك هەر ئەوەندە ، بەلکو پێمەوایە بانگەشەکردنی (ریفۆرم) ئەو بەدگومانیە ترسناکە دەهاروژێنێت کەنەك تەنها لە(ریفۆرم) و ریفۆرمخوازان دەیکەن ، بەلکو لەسەرجەم ئەو پارتە سیاسیەی

بانگەشەی کۆمەڵگەی مەدەنی دەکات، ئەم بەد گومانیە ڕۆژ بەڕۆژ تیژ و تیژتریش دەبێتەوە !!.

ڕیفۆرمخوزان و شێوە ژیانیان

کێن ئەوانەی بانگەشەی ڕیفۆرم دەکەن و تاچ ڕادەیەك ڕەوایەتی و مەشروعیەتیان هەیە بۆ ئەو جۆرە بانگەشەیە؟، کێن ئەوانەی کەدەتوانن بڵێن ئێمە ڕیفۆرمستین و دەمانەوێت گۆڕانکاری بکەین ، کێن ئەوانەی مەشروعیەتی قسەکردنیان هەیە و کێن ئەوانەی هێزی بڕوا پێکردنیان هەیە؟! ..ئەم پرسیارانە دەبێت لەسەرەتادا بیکەین بۆ ئەوەی لەسەرەتاوە بزانین بڕوا بەکێ دەکەین و لەگەڵ کێهادا سەمادەکەین ، ئەمانە هەمووی خوێنەری ئازیزم ، پرسیاری مۆراڵن کەمرۆڤەکان پابەند دەکەن بە ئیدیا و بیروبۆچوونەکانیانەوە. ئەوە (شێوازی ژیانە) کەبڕیار دەدات بڕوا بەکێها بکەین و کامەش بەدرۆزن تێبگەین، ئەوە هەڵس و کەوت وئەخلاقیاتی ئیداری و مێژووی کەسیە کە ئێمە پابەند دەکاتەوە بە پڕۆسەی بڕواکردن بەبانگەشەکان. ئەوە مۆراڵێکی کەسی و خودێکە کە یەکدەگرێتەوە لەگەڵ مۆراڵێکی مرۆیی باڵا وامان لێدەکات بڕوابەیەکتری بکەین ، نەك ئەو بانگەشانەی کەئەم سەرکردە یاوەکو ئەم گروپەیە ، لەملا و لەولا بانگەشەی بۆ دەکەن..بەکورتی و بەکوردی، ئەوە مۆراڵە بڕیاردەدا کێ جێگەی بڕوایە و کێش دەیەوێت فیلمان لێبکات و بەناوی فلان پڕۆژە و فیسارەوە ، خەونەکانمان بهاروژێنێت و لەئەنجامدا بیخاتە نێو کۆڵانەکانی قازانجی کەسی خۆی و دەستەکەیەوە .. بەداخەوە ئەمە واقیعی حاڵی گوتاری سیاسی کوردیە کە دژبەیەکیەکی ئێجگار قوڵی هەیە لەگەڵ مۆراڵی بانگەشەبۆکراو ، کەخۆی بەخاوەنی تێدەگات، لێرەوە دووفاقی ئەخلاقیاتی کۆمەڵایەتی و سیاسی مۆرکێکی دیاری پەیوەندی سیاسی خاوەن بڕیار و مەسەلەکەیەتی ، چاوخشاندنێکی سانا بەئەدەبیاتی حزبی ئێمە ، ئەو دووفاقیە ئەخلاقیە ئاشکرا دەکات ..

لەهەردوو بانگەشەی ڕیفۆرمەکەدا باس لەگەندەڵی کراوە، باس لە گۆڕینی پەیوەندیەکانی دەسەلات لەنێو خۆیدا کراوە، بەلام باس لە پرنسیبەکان نەکراوە!!. بەمانایەکی دیکە، ئەوە پرنسیبە سەرەتایەکانە کە کۆیی گشتی ڕیفۆرم دەکاتە

بەرنامەیەکی سیاسی و کۆمەلآیەتی و کولتوری درێژ خایەن، ئەوە پرنسیبەکانە سەرجەم دەم و چاوی نوێی ریفۆرمخواز دیاری دەکات، ئەوە پرنسیبەکانە کەسەرجەم پرۆسەی ریفۆرم دەکەنە پلاتفۆرمێکی ئاشکراو شەفاف. ووردەکاریەکانی دیکە، وەك دیاریکردنی دەسەلآتی ئەم سکرتێری گشتی یان ئەم دەزگاو دامەزراوە، ئەمانە هەمووی لەسەر بنەمای پرنسیبە نوێیەکان کاری بۆ دەکرێت و برەوەی پێدەدرێت و بەرنامەی کار و نەخشەی زۆرانبازی نوێی بۆ دیاری دەکرێت، ئەمە جگە لەوەی تێۆرەیەك هەیە بۆ ریفۆرم و تێزی گشتی هەیە کە هێلی گشتی ریفۆرمن .

ئەوانەی سەرەتا باسیان لە ریفۆرم کرد ، تەنها ویستیان دەسەلآت دابەشبکەنەوە و تەرازووی هێزەکانی نێو خۆی حزبی سیاسی هاوسەنگ بکەنەوە ، ویستیان زیاتر لە پاوەنخوازی سکرتێری گشتیەوە بگوێزنەوە بۆ جۆرێکی دیکە لە مۆنۆپۆلکردنی دەسەلآت، کەلەدواجاریشدا دانوستانەکان و دابەشبوونەوەی پلەکان ئەو راستیەی سەلماند.

گروپەی دووهەم کەئێستا دیسانەوە بەناوی (ریفۆرم) وە خۆی بە رزگارکاری حزب دەزانێ و بەتۆبزێ خۆی دەخاتە خانەی (ریفۆرم) وە ، دەیەوێت خۆیان لەو هەموو حەیاچوونە سیاسی و گەندەلّیە بێبەری بکەن، کەبێگومان خاوەن بریارەکانی نێو حزب و حکومەت لێی بەرپرسیارن ، ئەگەر خۆیان بەشێك نەبن لەو گەندەلّیە..

ئەمانەی سەرەوە نێزیکمان دەکاتەوە لە کرۆکی کێشەکە و پرسیاری ئەوەی بۆچی ریفۆرم ئەو کاریگەریەی نیە ، لەگەلّ ئەوەی کۆمەلّێك سەرکردەی بەهێز و خاوەن بریار لە پشتیەوە وەستاون؟!، بەدیوێکی دیکەدا پرسیار بکەم دەلّێم بۆچی بەجدی وەرناگیرێت!!، گەواهی لەسەر جدی وەرنەگرتنەکە ئەوەیە ، کە ریفۆرم بۆتە کوتلەیەکی گەورە و لەسەر هەمان میکانزمی کوتلەچێتی بەردەوامی بەخۆی دەدات. ریفۆرم لەدەرگای پشتەوەی حزبەوە خۆی دەکاتەوە بەنێو ژوورەکانی کوتلەچێتی و حکومەت و دەزگاکانیشی لەسەر ئەو بنچینەیە بەرێوبەر و تەنانەت وەزیرەکانیشیان دەپالێون بۆ پلەگرنگەکان..

کەواتە بۆچی ریفۆرم بەجدی وەرناگیرێت؟!. دیوێکی دیکەی وەلآمی ئەم پرسیارە بەئاسانی لە (شێوازی ژیانی ریفۆرمیستەکان) دا خۆی ئاوێنەیی دەکاتەوە. هەروەکو لە گفتوگۆی میشیل فۆکۆ ئاماژەمان پێدا کەشێوە ژیان پابەندە بەپرسی مۆرالّ و

شێمایەکی کراوە بەرامبەر بەژیان .. بەداخەوە ئەوانەی کە بانگەوازی ڕیفۆرم دەکەن خاوەنی نیشانەی پرسیارن لەمەڕ شێوازی ژیانیان ، ئەمە جگەلەوەی مۆراڵێك نیە کەئەوان بە پڕنسیبەکانی بانگەشەکەی خۆیان ببەستێتەوە ، بەکوردی و بەکورتی ئەمان خۆیان دروستکاری ئەم گەندەڵی و هەرایەن و ئێستاش دەیانەوێت قەناعەت بە ئێمەی هاوڵاتیان بهێنن کەئەوان بەرپرس نین ، یاخود بەشێوەیەکیّ ناڕاستەوخۆ بەرپرس نین لەو بارە ناهەموارەی کەهەمووان دەیزانین ، هەر لە بوونی کولتوری بەعسەوە بیگرە تاوەکو دەگاتە تەراتێنی تاوانبارانی جینۆساید و ئەنفال و فایلدارن تاوەکو ئەو هەموو دزینە گەورەیەی سامانی کوردستان و گەندەڵیەی کەئەمڕۆ خەریکە ئازادی ڕۆژنامەنوسان و نوسەرانیش قۆرخدەکات. ئیدی کامانەن ڕیفۆرمیستەکان؟! ..

ڕیفۆرمیستەکان خاوەنی هیچ شێوە ژیانێکی ئاوەها نین لەئەوانی دیکە جودایان بکاتەوە ، کەرەخنەیان لێدەگرن، هەر لە دابەشکردنی پلە و پایەوە بیگرە تاوەکو دەستەگەری و کوتلەگەری و تادەگاتە خاوەنداریێتی مولك و ماڵ و ڕەدەڵ و بەدەڵی بازرگانی بەناوی ئەم یان ئەوێك کە سەر بەخۆیانن ، بەداخەوە وەرقەکان ئاوەها تێکەڵ بووە ، کەڕیفۆرمیست و بەنێو کۆنزەرڤاتیف ، سۆسیال دیموکرات و ئیسلامی و خێڵەکی ، هەموویان تێکەڵی یەکتری بوون و هەمووی لەهەڵپەیەکی سەیری سامان و پارە و مولك کۆکردنەوەیەکەن کەتێربوونی نیە ..

ڕیفۆرمیستان دەبێت شێوە ژیانیان جیاواز بێت ئەوسا ئێمە دەتوانین باس ((مۆرال و ڕەوایەتی ) بکەین ، ئەوسا دەتوانین بڕوا بە (چیرۆکی دڵسۆزی) بکەین کەڕۆژانە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن بۆ ئێمەی هاوڵاتیانی دووبارە و سەد بارە دەکەنەوە.. (شێوە ژیان) بەرێزان سەنگی مەحەکی هەموو پرۆسەیەکی ڕیفۆرمە. بهێننە بەرچاوتان کە مارتین لۆتەر وەکو قەشەکانی ڕۆم پەنجەکانی پڕن لە ئەمگوستیلەی گرانبەها و ئەڵماس، عەرەبانەکەی گرانبەها و باشترین ئەسپی ناوچەکە ڕایکێشابایە، ئەوەندەی پارەی هەبووایە کەداروەدە ستەکەشی خەنی بوونایە .. لەوبڕوایەدان لوتەری ئاوەها دەیتوانی ببێتە مەزنترین ڕابەری ( ڕیفۆرماتسیۆن) لە مێژووی مرۆڤایەتیدا؟!..

# پرسی پرنسیبەکان و مۆراڵ

مۆراڵ و نۆرمەکان ، هەڵسوڕێنەری بنچینەیی هەموو کردەیەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتورین، ونبوونی مۆراڵ و نۆرمەکان لەهەر یەکێك لەو پرۆسانەدا، ئیفلیجی ئەو ئیدیا و بیروڕایانە ئاشکرا دەکات. ناکرێت لەدایکبوونی ئیدیایەکی نوێ مەزندەبکەین ، بەبێ بوونی مۆراڵ و نۆرمی تایبەت بەخۆی. ئەوەی کە بەگشتی لەژێر مۆراڵدا تێیدەگەین ، ئەوەیە ، ئەو یاساو ڕێسا مرۆییانەن کەچاکە و خراپە و ئەخلاقیاتی گشتی ئیدیایەك لەوی دیکە جیادەکاتەوە، هەڵس و کەوتی مرۆڤەکان لە کۆمەڵگەدا ئۆرگانیزەدەکات. گەر مۆراڵ لە تێزێکی ئاینیدا گوێڕایەڵی بێت بۆ هێزێکی ئاینی ، ئەوا مۆراڵ لەپێچێکی عەلمانیدا گوێڕایەڵیە بۆ لۆژیك و ئەقلانیەت. گەر سوستێمی سۆسیالستی زیاتر جەخت بکاتە سەر بەها و نۆرمەکانی دەوڵەتی سۆسیالیستی و ڕۆڵی خێزان و ناسیونالیەت و مۆرالەکانی پەیوەندی نەتوەدیی کەمکاتەوە و بیگۆڕێت بۆ مۆراڵێك بۆ جیهانگیریەکی کرێکاری ، ئەوا لە کەش و هەوای نەتەوەییدا گیان فیدایی کردن لە پێناو نیشتماندا و خۆبەخت کردن ، مۆراڵێکی بەرهەمهاتووی ئەو کەش و هەوا کولتوریە دەبێت. مۆراڵی ئیسلامەویەك جیاوازە لەمۆراڵەکانی مارکسیتێك و سێکولاریستێك .بەڵام ئەوەی لەم نمونە کورتکراوانەدا دەمەوێت بیڵێم ئەوەیە، نۆرم و بەهاکان ، کەووردەکاری پێکهاتەی مۆراڵن، خاڵی جیاکارەوەی گروپەیەکن لەوی دیکە. حزبێکی سیاسی لەوی دی ، چین و توێژ و ئاینێك لەوی دیکە، بێگومان مۆراڵێش بەپێی سەردەم و قۆناغەکان دەگۆڕێن و ئەخلاقیاتیش کە لەزۆر کاتدا بە ئیتیك ناوی دەنێن ، لەیەکێکەوە بۆ ئەوی دیکە و لەکولتورێکەوە بۆ ئەوی دیکە دەگۆڕێت..

ئەوەی کەحزبی سیاسی دەکاتە حزبێك مێژوو بگۆڕێت و کۆمەڵگە لەقۆناغێکەوە بگوازێتەوە بۆ ئەوی دیکە، تەنها گۆران نیە لە شێوەی دەسەلات، کە ئەوە بە کۆدێتا و موئامەرەی موخابەراتیش ئەنجامدەدرێن، بەڵکو گۆڕانی بەهاو نۆرمە کۆنینەکانە بە بەهاو نۆرمی تازە ، لێرەوە قسەکردن لەسەر (مۆدێلێکی کۆمەڵایەتی ) ئەرکی ئەو حزبە سیاسیانەن کەخاوەنی پرۆژەیەکی گۆڕانکارین لەکۆمەڵگەدا..ئەمانە هەمووی کاتێك ڕوودەدا کە ئەو پارتە سیاسیە خاوەنی (ڕەوایەتی / مەشروعیەت) خۆی بێت.

بەمانایەکی دیکە خاوەنی مۆراڵێکی تایبەت بێت بەخۆی کە پێچەوانەیی خەونی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کولتوریان بێت بۆ داهاتوو. ئەوە مۆراڵە کە ئیدیا گرێدەداتەوە بەژیان، هەر کاتێکیش ئەو مۆراڵە لە قەیراندا بوو ، ئیدیا تەنها مەرەکەبی سەر کاغەز و وێنەی بێمانای میدیاکان دەبێت.. لەم گۆشەنیگایەوە دەتوانین سەیری پەیوەندیەکانی پارتی سیاسی کوردی بکەین بەخۆی و ئیدیاکانی بانگەشەی بۆ دەکات و پەیوەندیشی لەگەڵ خەڵك و ژیاندا بخەینە بەر ڕۆشنایی ڕاڤەکردنەوە.

لەوبڕوایەدا نیم پارتێکی سیاسی بتوانێت گۆڕانکاری گەورە لە کۆمەڵگەدا بەدی بهێنێت ، بەبێئەوەی نۆرمە دێرینەکان نەخاتە ژێر پرسیارەوە، خاوەنی مۆراڵێکی تایبەت نەبێت بەخۆ .

مۆراڵ پێکهاتەیەکی گرنگە لە چەمکی (شێوازی ژیان) ، ئەوە مۆراڵە کە شێوازی ژیانمان دیاری دەکات، فۆکۆ مۆراڵ وەك (کۆدێك بۆ هەقیقەت ) پێناسە دەکات، درزبردن لە مۆراڵدا ، درزبردنە لە هەقیقەتەی ئەو ئیدیا و بانگەوازانە، هەتاوەکو پرسیارە گرنکەکانی یەکلانەکرێنەوە ، ناتوانرێت باس لەهەقیقەتێکی نوێ بکرێت ، مۆراڵ لەم گوتارەماندا پڕۆژەیەکی گەیشتنە بەبڕواکردن، بڕواکردن بەهەر پڕۆژەیەکی سیاسی و ئیدۆلۆژی ، هێزێکی ئەخلاقی و پاکەتێکی پڕی لە نۆرم و بەهای تازەی پێویستە کە جێگەی بەهاو نۆرمە کۆنینەکان بگرێتەوە.. شۆڕشی فەرەنسی هەموو بەهاکانی پیرۆزی سەدەی ناوەڕاست و ملکەچی بۆ پادشا و ئۆرستۆکراتیەت و ئەخلاقیاتی خانەدانانی ئەوروپای خستە ژێر پرسیارەوە، لە هونەری نیگارکێشاندا شۆڕشی (ڕوانینیگێرەکان / ئینتیباعیەکان / ئیمپریسیۆنیستەکان ) لەوەدا بوو کە وێنەی نیگارکێشیان گۆڕی، لەڕێگەی شێوازی کارکردن و شێوازی ژیانی خۆیانەوە،جیهانبینیەکی ئێجگار جوداوازیان لەمەڕ مامەڵەکردن لەگەڵ ڕەنگ و دنیادا کرد. لەفیگورێکەوە، لەیەکێکەوە کەلەهەوڵداندایە بۆ گەیشتن بۆ نێو کۆشکی ئۆرستۆکراتی و شازادەکان و کڵێساگەورەکان و چیرۆکی ئەوان و پۆرترێتی ئەوان نیگارکێش بکات، گۆڕا بۆ فیگورێکی نوێ، بۆ جۆرێك لە بۆهێمیەت و چەرکەزی شارە تازە پەیدابووەکانی پڕ لەجوڵە،لەوێوە لەکۆشکەکانەوە بۆ نێو بۆ نیگارکێشانی جوتیاران و سروشت و دەم وچاوەکان وەکو خۆی بەبێ گێڕانەوەی چیرۆکەکانی پیرۆزی کاریان دەکرد !. بە شێوازێکی دیکە فڵچە دەوەشێندرا کە لەخاڵی پڕ ڕەنگی جیا جیا

دەچوون ، ئەو ووردەكاريەی كەكلاسيكدا هەبوو ، كەدەربڕينی كۆپيكردنی مەخلوقاتی خودا بوو، هەر وەك كڵێسا سێبەری خۆی بەسەر هونەری كلاسيكدا بەجێهێشتبوو.لەتابلۆكانی ئەواندا گۆڕا بۆ وەشاندنی فڵچەی پڕ ڕەنگی گەرم كەلەنێزيكەوە لە خاڵ وپنتكی هاوێژارو دەچوون كە هارۆمننيەتی تێدا بەدی نەكرێت. بەپێچەوانەوە تۆزێك دوورتر لە تابلۆكە هارمۆنيەت تەواوی ڕەنگی گەرم و ژيانی ڕەنگی جيهانی سروشت و شتەكان و مرۆكان و شارەكانی پێچەوانەيی دەكردەوە. ئەوان بڕوايان بە تێكدانی ئەو فيگورە ڕێكانەی ژيان بوو لەنێو كلێشەيەكی نوێی پڕ ڕەنگدا. چيدی ئەميرەكان بەخۆيان و لوتبەرزيانەوە لە تابلۆكاندا ئامادە نەبوون و بۆ ئەبەد لەو شێوازەيەدا ناديارکران، ئەوان چيدی ديار نەبوون وەك ئەوەی لە كلاسيكدا بوونی هەبوو، بەڵكو بەپێچەوانەوە، كرێكارانی كێڵگەی پەتاتە، لە تابلۆكانی (ڤان كوخدا) و ئافرەتە ڕووتەكانی دوورگەگەرمەكانی (هايتی) لە تابلۆكانی (كۆگان)دا، و ژيانی شارەكان و گازينۆكان لە تابلۆكانی (ديگاس) و خۆرهەڵاتن لە تابلۆی (مۆنێ) جێگەی ژيانی كۆشك و كڵێساو ئەفسانەكانی گريگ و ڕۆمی گرتەوە.. ئەمانە مۆراڵێكی نوێ بوون ، ئەو پيرۆزيەيان درز پێبرد كەهونەری نيگاركێشی كلاسيك خۆی پێوە بەند كردبوو .

مۆراڵكی نوێ بۆ وێنەكێشان، بوونی لەشێوەی ئاتيلێری (مرسم) بچوك و داخراوەوە ، بۆ ئاتيلێری كراوەدا خۆی كۆڕپەيی دەكرد، هەموو سروشت شوێنی وێنەكێشانی ئيمپريشينستەكان (ڕوانينگيرەكان) بوو، ئەوان خۆيان بە ڕاڕەوەكانی خانەدانانەوە هەڵنەواسيبوو ، پيرۆزی ئەوان گەڕانەوە بوو بۆ ڕەنگەكانی سروشت و شتەكان ،نەك چيرۆكی خوداكانی گريك و بونەوەرە ئەفسانيەكان، چيرۆكی پيرۆزی مەسيح و لەخاچدانی و قەشە پيرۆزەكان لەم شێوازەدا جێگەی نەبۆوە.. گەر ئەم چيرۆكانە لەخەياڵێكی پشت بەستوو بە هەستێكی ئەفسانەيی ياوەكو ئاينی ياوەكو شكۆمەندی نەتەوەپەرستی و خانەدانی نێو كۆشكەكانەوە سەرچاوەی هەڵگرتبێت، ئەوا ئيمپريسيۆنيستەكان بەمۆراڵێكی ديكەوە دوور لەو مۆراڵی پيرۆزی و شكۆمەندكردنی گەڕانەوە بۆ سەرچاوە سەرەكيەكانی پەيوەندی سانا و لەهەمانكاتيشدا ئاڵۆزی نێوان مرۆڤ و جيهان، فانتازيا و خەياڵيش تەنها لەڕێگەی ڕەنگەكان و وەشاندنی فڵچەو كاريگەريەكانی چاوەوە بوو ، مۆنێ جارێك گووتبووی : [من حەزمدەكرد بەكوێری

لەدایکبوومایە و لەپڕێکدا ڕۆشنایی چاوم بۆ بگەڕایەتەوە، تەنها بۆ ئەوەی شتەکان بێکاریگەری پێشینیەیان. وەك خۆی ببینم...] ، چیدی بابەت گرنگ نەبوو بۆ تابلۆ ، بەڵکو مۆتیف و ڕوناکی و سێبەر و ڕەنگەکان جێگەی سەرنج و کاکردنیان بوو . لەگەڵیشیدا خەیاڵ و بابەت وندەبوون ، ئەوەی دەمایەوە، (مۆنێ ) گوتەنی: (چاو و دەست و تەنها چاو و دەست وهیچی دیکە) ..

بۆزیاتر زانیاری بڕوانە (جیهانی ئیمپریشینزم : ئەو هونەرمەندانەی لەخۆشبەختیەکانی ژیانەوە ، نیگارکێشیان دەکرد .. نوسینی : هانز خافێ . وەرگێڕانی هاوبەش لە ئەڵمانی و هۆڵەندیەوە: ئیسماعیل حەمەئەمین و حەمەی ئەحمەد ڕەسوڵ . چاپ و بلاوکراوەکانی سەردەم / کتێبی گیرفان ٢٠٠٤ ).

خوێنەری بەڕێز لەم نمونەیەوە ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت کەهەموو ئیدیایەکی نوێ، مۆراڵێکی نوێ و شێوزاە کاری نوێ و شێوازژە ژیانی نوێ لەگەڵ خۆیدا دەهێنێتە نێو کۆمەڵگەوە،لەگەڵیشیدا زۆربەی مۆراڵە جێگیریەکانی کۆنینە دەکەونە بەر گومان و نیشانەی پرسیار. شێوە ژیانی نوێ مۆراڵی نوێ بەرهەمدەهێنێت و (جێگیر) لەخەوی قوڵی خۆی وەئاگا دێنێ، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە هەموو مۆراڵ شکاندنێکی کۆنینە ، مانای پرۆژەیەکی گۆڕانکای نوێیە. هەموو مۆراڵ و بەهای نوێ جێگیرەوەی مۆراڵ و بەهای کۆنینە نیە ، بەڵکو زیادەکردن و درێژکردنەوە و خستنەسەری نوێشە!!. مۆراڵ ئەو چەترەیە کەشانبەشانی ئیدیای نوێ بەردەوام لەسەر بنچینەی ئیدیا و پرۆژەی نوێ خۆی بینادەکاتەوە..

ئەز پێموایە مۆراڵ زیاتر پابەندە بە (ڕەوایەتی ) و لەهەمان کاتیشدا پرسێکی گرنگی ژیانە. بەشێوەیەکی دیکە لەمەڕ کولتورێك بۆ سیاسەت قسان بکەم . دەڵێم : بەکردەبوونی پرۆسەی (گۆڕانکاری و ڕیفۆرمە ) پارتێکی سیاسی و دەزگایەکی کۆمەلایەتیە لە قۆناغێکی مێژوویی گرنگدا...

# نەوەکان و پرسی ڕیفۆرم

لەدوای ڕاپەڕینەوە هەموو کێشە سیاسی و ئایدۆلۆژی و مۆراڵی سیاسیانە بەشێوەیەکی ڕادیکالانە گۆڕانکاریان بەسەردا هاتووە. گۆڕانکاریەك کە ڕۆژ بەڕۆژ هەموو خەونێکی مۆدێرنیزەکردن و بیناکردنەوەی کۆمەڵگەی کوردەواری دەخستە نێو کۆلانێکی تەسك و تەنگەبەری پڕ قەیرانەوە.. گەر لە شۆڕشی شاخدا یاسای شەڕ و خۆڕاگری و لەخۆبوردن و قارەمانێتی، هەڵسوڕێنەری شەڕی پێشمەرگانە بوو بێت و بەشێك بووبێت لە مۆراڵی بەرگریکردن لەخەڵکی بێتاوان لەبەرامبەر هێرش و پەلاماردانی شۆفێنستی بەعسیەکان و پرۆژەی (پاکتاوی ڕەگەزی و نەتەوەیان) ، گەر لەو سەردەمەشدا هەڵە و کەم و کوڕیش هەبوو بێت ، ئەوا خۆشەویستی بۆ ئەو (شێوازە ژیانە سەختەی ) شاخ ، پۆزش و پشتگیری هەموو کردەیەکی بەرگریکردن بوو. ئەمانە هەمووی ئەو شێوە ژیانە بوون کە ڕەوایەتی بە پارتی سیاسی دەبەخشی و تاڕادەیەك ڕۆحی لێبوردنی لەلای هەمووان دەبزواند.. فیگوری پێشمەرگە و سیاسی کورد بەهەموو پارتەکانیانەوە، فیگوری مرۆڤێك بوو کە دژ بەفاشیەت دەجەنگێ ، شێوە ژیانێکی سەختی هەڵبژاردووە لە پێناو ئازادی و سەربەستی بۆ خەڵکان، ئیدی هەریەکەو بەشێوە و بیروڕای خۆی لەخانەی پارتێکی سیاسیدا بوو دژ بە فاشیەت .

شێوە ژیانی ئەوان نەوەی نوێی سروش بەخش دەکرد بە وزەیەکی نوێ ، ئەوان فیگورێك بوون کەنەوەی نوێ بەسەرسامی و پڕ لەشەوقەوە لێیان دەڕوانین، ئەوانە پاڵەوانی فیکری و سیاسی و پێشمەرگەیی شەڕێکی سەخت و بێئامان بوون لەدژی بۆگەنترین و وەحشیترین سوستێمی حوکمی ڕەگەزپەرستی پان عەرەبی فاشی . ئەمە شەرعیەتێك بوو کەئەوان هەیانبوو لەڕێگەی هەڵبژاردنی شێوە ژیانی سەربەست و خۆ بەختکردن لەپێناو جوانی وئازادی لەکوردستاندا، هەموو پرۆژیەیەکیش گەر ئەوان پێشکەشیان بکردایە، جێگەی گفتوگۆ و لێدوان بوو، ئەوان خاوەنی ڕەواخوازیەکی ئاوەها بوون ، کەزۆر ووردەکاری ناجۆر و نهێنی ترسناك هەبوون لەژێر ئەو شەرعیەتەدا داپۆشرابوون، بەشێوەیەك ئەو ووردەکاریانە لەو زەمەنەدا لەبەرامبەر ئەو شەرعیەتە ئەوان هەیانبوو ، جێگەی بڕواکردنیان بەخۆ نەدەپچڕی ..

هەر لەدوای هەفتەکانی یەکەمی دوای ڕاپەڕینەوە ئەم مۆراڵە درزی تێکەوت و وورده وورده ئەم فیگورە گۆڕا بەشتێکی دیکە کەسەرەتا لای زۆربە شۆکێکی گەورە بوو.

فرۆشتنی کەل و پەلی خزمەتگوزاری گشتی لە پرۆژەی (بێخمە) وە بیگرە تاوەکو شۆفڵ و کار گەیشتە ئەوەی ئامێری خەستەخانە گشتیەکان و لیفتی (مەسعەد) ی گەورەی خەستەخانە و داینەمۆی کارەبا و کارگەی قیر و کابلی تەلفۆناتی ژێر زەوی و بۆری و چی شتومەکی خزمەتگوزاری و ئامێر هەیە لەژێر هەرەشەی دزین و ئاودیو کردندا بوون. بەداخەوە شۆڕشگێڕەکانی دوێنی بازرگانە بێبەزەیەکانی ئەمڕۆیان لێدەرچوو، گەر سەرەتا ئەوە حاڵەتێك بوو بێت ، ئەوا لەدوایدا بوو بەدیاردەیەك و ئێستاش بەمۆدێلێکی سیاسی. دیارە مەبەستی من چوونە ئەو ووردەکاریانە نیە کەهەمووان دەیزانین ، بەڵکو مەبەستم درزتێبوونی (ڕەوایەتیە) لەنێوان پارتی سیاسی کوردی وخەڵکی. ئەم درزە ، ئەم کەلێنە، ئەم دەلاقەیە ، بەداخەوە ڕۆژ بەڕۆژ لە فرانبووندایە و شەڕی ناوخۆش دواوێستگەی کۆتایی هێنان بوو بەو پەیوەندی (بڕواکردن ) بە پارتی سیاسی ، نەك تەنها بەدگومانی بوو لەنێوان خەڵك و پارتی سیاسیدا، بەڵکو بەد گومانی لەنێوان ئەندامی پارتە سیاسیەکان بە سەرکردایەتی و بەرنامەی کاری خۆیان !!. ئەوەی کەلە دوای شەڕی ناوخۆ ماوەتەوە وەك پەیوەندی نێوان مرۆی کورد و پارتە سیاسیەکان، پەیوەندیەکی (بەرژەوەندیخوازانەیە) نەك بیروباوەڕی سیاسیانە ، ڕەوایەتی و مۆراڵێك نیە کەپارتی ببەستێتەوە بە مرۆڤەکان، بەڵکو پەیوەندیەکانی بەرژەوەندی ماتریالی ،(بەتایبەت دوای ڕووخانی ڕژێمی سەدام) . جێگەی ئەو کوردە ناموسیەی گرتەوە کە زۆربەی کادێر و پێشمەرگە و ئەندامە دێرینەکانی بەحزبەوە دەبەستەوە..

من لێرەدا نامەوێت باس لەو کادێر و ئەندامە دڵسۆزانەی نێو حزب و ڕێکخراوەکان بکەم ، کە تاوەکو ئەمڕۆ دژی ئەو دیاردانە دەجەنگن و زۆربەشیان باجی گەورەیان داوە لەو پێناوەدا و هەندێکیشیان کەبۆیان گونجاوە مەنفایان هەڵبژاردووە. ئەوانە گەر تاوەکو ئێستاش لە پارتی سیاسیدا مابێتنەوە هۆکارەکەی ئەوەیە تەمەنێکی زۆریان لەو پارتەدا بەسەر بردووە ، جگەلەوە لەلای هەمووان ڕوون و ئاشکرایە ، کەکۆمەڵگەی کوردی ، کۆمەڵگەیەکی خێڵەکی حزبیە، ژیان لەدەرەوەی حزب ، مانای ژیانە لەدەرەوەی ژیان خۆی ، هەموو ڕێگەکانی ژیانی ئاسایی دەتگەڕێنەوە بەردەم حزب ، کۆمەڵگەی کوردی حزبێکی گەورەیە ، خێڵەسیاسی و کۆمەلایەتیەکان لەنێوان خۆیاندا بەشیان کردووە. لەوانەیە داهاتووی ئێراقیش بەسەر هەمان نەخشەدا دابەش بێت..

بیرەوە و ئەم پەیوەندی بەرژەوەندیدا کەبۆتە نەریتێکی باوی ژیانی سیاسی و تەنانەت نێوەندی ڕۆشنبیریشی لەگەڵ خۆیدا ڕاپێچکردووە، هەموو پڕۆژەیەکی (ڕیفۆرم ) لەلایەن هەر گروپەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتیەوە بێت ، ئەرکێکی گران دەبێت. ئەرکێك دەبێت کە سەرەتا پڕۆژەیەکی ڕۆشنبیری سیاسی و کۆمەڵایەتی دەبێت ، پاشان شۆڕدەبێتەوە بۆ نێو ڕیفۆرم لەنێو بونیادی پەیوەندیەکانی دەسەلات ..لەم خاڵەوە چەند هێڵێکی گشتی پڕۆژەی (ڕیفۆرم ) دیاری دەکەین کەدەشێت خوێنەری ئازیز و زۆر لەڕۆشنبیرانی چالاك چەندەها هێڵ و پرنسیبی دیکەی بۆ زیادبکەن ، ئێمە بەشێوەیەکی دیاریکراوە چەند هێڵێکی گشتی دەخەینە ڕوو ، کە پڕۆسەی (ڕیفۆرم) ی ڕاستەقینە کاری لەسەر بکات :

- *ڕیفۆرم بە پڕۆسەیەکی شەفافەیەت دەستپێدەکات*: ڕیفۆرمخوازان ، هەروەك لە نمونەی مارتین لوتەرەوە فێری دەبین ، ئەو کەسایەتیانە پێبهەڵدەستن کەکرانەوە بەرامبەر خەڵکانی خۆیان لەسەر ئاستی ناوخۆی گروپەکەیان و لەسەر ئاستی دەرەوەی گروپەکەشیان ، کاراکتەری کەسێتی ئەوانە. ئەوانە کەسێتیەك نین ناوچەگەر و دەستەگەر و کوتلەچی بن ، ئەوانە کەسانێکن خاوەنی هێڵێکی سیاسی و بیروڕای خۆیانن و لەسەر ئاستێکی باڵای مۆراڵی کولتوری سیاسی بوونیان هەیە .

- *ڕیفۆرم پڕۆسەی کەشفکردنی خۆ گەندەڵیە* : ئەز پێموایە (*خۆگەندەڵی*) ئەو خودەیە کە گەندەڵ بووە، یاوەکو فاچی کەوتۆتە نێو زۆنگاوە پڕ قەوزە ژەهراویەکانی گەندەڵی ئیداری و سیاسی ، لەسەروو هەموویانەوە دەبێت ئەوانەی بە(ڕیفۆرم ) هەڵدەستن ، خۆیان لەو گەندەڵیەوە نەهاتبن ، دەنا ڕیفۆرم وەکو ئەو هێلکە پیسەی لێدێت کە مریشێکی تووشبوو بەئەنفلۆنزا هەڵیدەهێنێت.

- *ڕیفۆرم کارکردنە لەڕابوردوودا*: کولتوری بەعس و مانەوەی فایلدران لەشوێنای خۆیان و ئاسەوارەکانی شەڕی ناوخۆ، ئەو مەسەلە گرنگانەن کە دەم و چاوی

گەندەڵی ئێستایان پێکهێناوە. بەبێ کارکردن لەو سێ دۆسیە گرنگانەدا ڕیفۆرم لەئاستێکی خیتابیدا دەمێنێتەوە ..

- *ڕیفۆرم ئاشکراکردنی سەرچاوەی پارە وسامانی کەسیە:* گرنگترین فەیس لە پڕۆسەی ڕیفۆرم ئاشکرا کردنی ئەو سامان و پارە و پولەیە کە بەپلەی یەکەم ڕیفۆرمخوازان هەیانە. ئەم پارەیەمان لەکوێ بوو ؟! ئەمە پرسیارێکی جەوهەری و وەڵامی ڕاستەقینە و کرانەوەی دەرگای و دۆسیەکان بۆ لیژنەکانی (پاکتاوی گەندەڵی)، ئازایەتیەکی بێ وێنەی پێویستە ، دەبێت یەکەمجار بە ڕیفۆرمخوازان بە ئاشکراکردنی سەرچاوەی پارەی خۆیان دەستپێبکەن.

- *ڕیفۆرم بەرنامەیەکی ئاشکرا و ڕوونە:* ڕیفۆرم خاوەنی بەرنامەیەکی ئاشکراو ڕوون و هەمەلایەنە و تەنها لەچوارچێوەی بەیاننامە و گوتاردا نامێنێتەوە، بەڵکو وەردەگێڕدرێتە سەر زمانی ئیداری و لیژنەکاری و تیۆری .

- *ڕیفۆرم خاوەنی میکانزمێکی دیموکراسیانە :* بەمانای ڕیفۆرم بەشێوەی هەرەمی دانابەزێت و کۆمەڵێك سەرکردە و کادێر لەسەرەوە (سەرکردەی ڕیفۆرمخواز) بن ، هەروەك چۆن لەوەو بەر سەرکردە بوون، ڕیفۆرمخوازان واز لەشوێنە گرنگەکانیان دێنن و نەوەی نوێی سیاسی پێدەگەیەنن و خۆیان دەبنە ڕاوێژکار و تیۆرەکار ، ئەمە میکانزێکی دیموکراسیانەی پێویستە، کە(کولتوری هەڵبژاردن) ڕێخۆشکاری ئەم میکانزمە دەبێت، ڕیفۆرم کردەیەکی جەمعیە و بەفەرمان دانابەزێت.

- *ڕیفۆرم خاوەنی کولتوری هەڵبژاردنی نوێیە:* (کولتوری هەڵبژاردن) مەرجێکی سەرەکی پڕۆسەی هەڵبژاردنە، ناتوانرێت هیچ هەڵبژاردنێك لەژێر ڕۆشنایی ڕیفۆرم ئەنجامبدرێت، بەبێ بوونی کولتورێك بۆ هەڵبژاردن، دەنا دیسانەوە ڕیفۆرم دەبێت بە دابەشکردنەوەی دەسەڵات لەفۆرمێکی جیاوازدا.

- *ڕیفۆرم یەکەم هەنگاوی چارەسەری ژیانی بنچینەیی کۆمەڵگەیە:* کەحکومەتی هەرێمی یەکەم دامەزرا، کارەبانەبوو، خەستەخانەکان لەژێر نەبوونی دەرمان و ئامێر و کادێری پزیشکیدا دەیناڵاند، حزب دەستی هەبوو لەزۆر بنەما سەرەکیەکانی ژیانی خەڵکی، بەجۆرێك کەژیانی مەدەنی مراندبوو. ئێستاش هەر وەکو ١٣ ساڵ لەمەوبەر کارەبا نیە و خەستەخانەکان لەبەردەم قەیرانی گەندەڵیدا لەجاران خراپتر بوون، ئەوە جگەلەوەی بازرگانیەکی سەیر هەیە لەو بوارەدا. کوردستانێکی بەو جۆرە نەخۆشیە بنچینەیانەوە، مانای کوردستانێکی داگیرکراوە بەنەخۆشی و نەبوونی و کارەساتی مرۆیی ..

- *ڕیفۆرم پێداچوونەوەیە بەهەموو پێناسە دێرینەکان:* هەموو پێناسە کۆنینەکان ، لەکوردایەتیەوە بیگرە تاوەکو بۆچوونمان بۆ دەسەڵات و ژیان ، دەبێت دەستەی ڕیفۆرم و ڕیفۆرمخوازان خاوەنی پێناسەی نوێی بن گونجاوبێت لەگەڵ ڕۆحی سەردەم.

- *ڕیفۆرم پێویستی بە ڕابەرایەتی و توانای نوێیە:* دەبێت دەم و چاوی نوێی بەتوانا و بەتایبەت لە گەنجاندا بەشێکی گەورەی ڕیفۆرم پێکبهێنن. ناکرێ باس لەڕیفۆرم بکەین ، بەبێ توانا گەنجە نوێیەکان لەهەموو بوارەکاندا..

- *ڕیفۆرم پرۆسەیەکی گواستنەوەیە لە (بڕواکردن) وە بۆ (گەڕان بەدووی هەقیقەتدا):* گەر تاوەکو ئێستا بڕوای کوێرانە بەسەرکردایەتی و پارتی سیاسی پرنسیپی کارکردن بێت،ئەوا کاتێك باس لە ڕیفۆرم دەکەین هەموو بڕواکردنە دەبێت گەڕانێك بێت بەدووی هەقیقەتی هەموو ووردو درشتێك ، بەشێوەیەك کە هاوشان بێت لەگەڵ پێداچوونەوە و فۆرمولەکردنی پێناسەنوێیەکان بۆ چەمك و جیهانبینیەکان ..

- ڕیفۆرم بەڕێزان، گیرفانی نیە ....

## نەوەکان و پرسیارکردن لە ڕیفۆرم

نەوەکان بەم شێوەیە بەرامبەر ڕیفۆرم دەبنەوە . ئاوەها نەوەی نوێ لەنێو کولتوری سیاسیدا پێدەگات. مەرج نیە ڕیفۆرمخوازان دەسەلات بگرنە دەست ، ئەوسا مێژووکردە دەبن و گۆڕانکاری بەئەنجام دەگەیەنن، نەخێر ، ئەوە تێزەکانی ئەوانە کەتەمەنی ئەوان لەنێو مێژووی کۆمەڵگەدا درێژ دەکاتەوە. شۆڕشچۆکەی ١٩٦٨ ی ئەوروپا و ئەمریکا نەبووە هۆی هێنانە کایەی دەسەلاتێکی سیاسی ڕاستەوخۆ ، بەلام سەرجەم دەسەلاتی سیاسی و تەنانەت پارتە دژ بەڕیفۆرمەکانیشی ناچارکرد لەهەموو بوارەکانی ئازادیەکەسیەکان و ئازادی بیروڕادەربڕین و گۆڕینی پرۆگرامی خوێندن و شێوازەکانی وانەگوتنەوە و زۆر ووردەکاری دیکە، پشتگیری لە ڕیفۆرم بکەن.

ڕیفۆرم کەش و هەوای سیاسی و کولتوری سیاسی باو و کۆنەخواز دەخاتە ژێر پرسیارەوە و کەش و هەوایەکی نوێ کولتوری دەهێنێتە ئاراوە. ئەوەی جاران عەیبە و تابۆ بوو، لەگەڵ چرکەساتی ڕیفۆرمدا جێگەی خۆی لەنێو نۆرمەکاندا دەکاتەوە. نۆرم و بەهای نوێ جێگە بەنۆرم و بەهای کۆنەخواز لەقدەکەن، مۆراڵێکی دیکە بەجیهانبینیەکی دیکەوە لەڕێگەی ڕیفۆرمەوە ، دەبێتە جێگری مۆراڵی کۆنەخواز.

لەکوردستاندا تاوەکو ئێستا وامەزندە دەکرێت کەئەنها یاسا ئاسمانیەکانن خاوەنی مۆراڵ و ئەخلاقیاتن و ئەوی دی لەو چوارچێوانە دەرباز بێت قبوڵ نیە و تابۆیە. یاساکان بەشێکی زۆریان لە شەرعیتەوە هەڵقوڵاون ، کەئەمانیش ئیجتیهادی کۆمەڵێ فەقیهی سەدە دێرینەکانی ئیسلامن. تەنانەت دەستوری ئێراقی بەنێو فیدرال، بەداخەوە کە(ڕیفۆرمخوازە سۆسیال دیموکراسەکان) دەنگیان پێ بەخشی و خەڵکیشیان لەسەر دەنگـدەدان ئانبڕوا و تیرۆری مەعنەوی کرد ، یاساکانی ئیسلام دەکاتە بنچینیەك بۆ لێدانی دیموکراسیەت!!. ئیدی بۆچی ڕیفۆرم پێش هەموو شتێك، ئەو پرسە جەوهەریە ناخاتە ژێر گومانەوە ؟!!.

نەوەی نوێ هیچ جیاوازیەکی مێژوویی نابینێت لەنێوان چرکە ساتی ڕیفۆرم و زەمەنی پێش بانگەشەی ڕیفۆرم، مادامەکی جادە و خیابانەکانمان نەك هەر تاریك و پیسن ، نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو بەرهەمهێنەری برینداری کۆمەلایەتی و سایکۆلۆژین. مادامەکی هەر مەلایەکان و خێڵە میلیشیاکانن ژیانی نەوەی نوێ کۆنترۆڵ دەکەن. ئیدی دەبێت ڕیفۆرم مانی چی بێت ؟!.

ڕیفۆرم دەبێت پرسێك بێت لە بەردەم نەوەی نوێ بۆ گۆڕینی نۆرم و خوو ڕەوشتە دواکەوتووەکان، کەچی ئەوەتا ئەمڕۆ بەناوی پیرۆزی ئاین و سەرکردەوە ،ئازادی بیروڕای نوسەران بەنێوی ئەو برگەیەوە قۆرخ دەکرێت و بەشێکی زۆر لەڕێگەی دادگای وەهمیەوە فرێدەدرێنە نێو زیندانەکانەوە . دەبێت ڕیفۆرم لەچ شوێنایەکی ئەم دنیا کوردیەدا بێت؟!.

ڕیفۆرم دەبووایە پێکهاتەی پەرلەمانی کوردی بخاتە ژێر پرسیارەوە، بەوەی پەرلەمانێك هەیە لەنێو ئەم هەموو کێشانەدا لەتەمەڵیدا وەنەوز دەدا.ئیدی دەبێت ڕیفۆرم لەکوێی پرسی هەڵبژاردن و خەسڵەتی پەرلەمنتاراندا بێت؟!!..

ئەمە و زۆر کێشەی جەوهەری هەن کە بەنێو گروپەی ڕیفۆرم و پارتە سیاسیەکەیان خۆیانی لێ دەدزنەوە.. ڕیفۆرم بەڕێزان، کولتورێکە بۆ ژیان ، بۆ مرۆڤ، بۆ ژینگە. نەك دابەشکردنی دەسەڵات لەنێو ئارتۆدۆکسیەتی سەرکردەپیرەکاندا. ڕیفۆرمی ڕاستەقینە پرسێکی کراوەی نەوەکانە...

# سەرچاوەکان


١. ژیانی مارتین لوتەر : www.Luther.de

٢. تێزەکانی مارتین لوتەر لەڤیتین بێرگ. Thesenanschlag in Wittenberg

http://www.mdr.de/geschichte

٣. سەرچاوە : میشێل فۆکۆ. گەڕانەوەی مۆڕال . دەزگای بڵاوکردنەوەی دیتریخس ١٩٩٨
Foucault. Die Rückkehr der Moral. Diedrichs Verlag ١٩٩٨. S ٤٨٥

٤. تیۆدۆر ئادۆرنۆ : مۆڕاڵە بچوکەکان. چاپی ١٩٩٧. چاپخانەی زانستی دارمشتاد
Theodor W.Adorno. Minima Moralia. Wissenschaftliche Buchgesellschaft. ١٩٩٧

٥ . نامەی بەڕێزان نەوشیروان موستەفا و کۆسرەت ڕەسوڵ و عومەر سەید عەلی بۆ بەڕێز سکرتێری گشتی. کوردستان پۆست & هاوڵاتی .

٦. نامەی گروپەی دووهەمی ڕیفۆرم . ڕۆژنامەی ئاوێنە .

## لەنێوان مۆنۆمێنت و دەخیلەدا

-١-

سوتاندنی مۆنۆمێنتی شەهیدانی هەڵەبجە لێدان نیە لە ماناکانی شکۆداری شەهیدان، بەڵکو سەرەتایەکی ترسناکی قەیرانێکدا بۆ ماوەی زیاتر لەپازدەساڵە کەڵکەبووە و لەخاڵێکی ئاوەها نەرم و هەستیاردا تەقیەوەتەوە. ئەمە نەدەستی ڕەشە و نەپلانی لایەنەێکە و نە تەحالوفایکی بێگانەیە ، بەڵکو تیژبوونەوەی ئەو فەرامۆشیە دەست ئەنقەستەیە کەلەلایەن سەرمایەدارانی میلیشای حزبیەوە وەك مۆدێلێکی بەڕێوەبردن ساڵاهایە پیادە دەکرێت، بەجۆرێك، کەئیدی سیاسەتی (گوێچکەی کەڕ) لەئاست هەموو سکاڵانامە و کۆڕ و کۆبوونەوە و تەنانەت نزاو پاڕانەوەی خەڵکی ، سیاسەتێکە ساڵانێکی دوورودرێژە هەر ساتەی لەژێر بەهانەیەکەوە پەیرەو کراوە. ئەو سیاسەتەی کەدەڵێت : باقسە بکەن ، بابنوسن ، با خۆپیشاندانی هێمنانە بەڕێوە بەرن و ئێمەش گوێچکەی کەڕی خۆمانیان دەدەینێ ..بۆتە سیاسەتی پەیوەندی نێوان خەڵك و دەسەڵات، بۆتە تاکە کۆمۆنیکاتیڤێك لەنێوان خەڵك و دەسەڵاتی کوردیدا، ئەو گوێچکە کەڕە تاکە کەناڵی گوێگرتنی دەسەڵاتی کوردیە لە داخوازی دژە گەندەڵی و داواکردنی دیموکراسیزەکردنی کۆمەڵگەی کوردی. گوێچکەی کەڕ و فەرامۆشکردن و دەستی بەدەستی پێکردن بۆتە شێوازی دیاری مامەڵەکردنی حکومەت لەگەڵ خەڵکیدا . بەداخەوە ئەمە کورتکراوەیەکی سادەی سیاسەتی دەسەڵاتی کوردیە بەهەردوو حزبە دەسەڵاتداریەکەیەوە و بێگومان بە بێدەنگی وبەشداری حزبەکانی دیکەی نێو تەحالوفاتەکانیان. لەبەر ئەوە سەیرنیە کاتێك هەر سومبۆلێك بستونێرێت، بەهێرشی تێنەگەین لەسەر مانای مێژوویی و ناوەڕۆکی شکۆداری و پیرۆزی ئەو سۆمبۆلە نیشتمانی و نەتەوەیی یان ئاینیە، بەقەد ئەوەندەی ئەو سومبۆلە پابەندە بە چیرۆکی دەسەڵاتێکەوە ڕۆژ بەڕۆژ شەرعیەت وندەکات .لێرەوە دەتوانم بڵێم سوتاندنی مۆنۆمێنتەکە ئاشکراکردنی لەدەستدانی شەرعیەتی دەسەڵاتی کوردیە.

پەیوەندی نێوان سۆمبۆلەکان و مرۆڤەکان پەیوەندیەکی ئەزەلیە، پەیوەندیەکە دەبێت لەسەر بنەماکانی مۆراڵێکی هەمیشەکارلەسەر کراو دابمەزرێ ، دەنا ئەو سەمبۆلانە چەندە لەڕووی مێژوویەوە ڕەگیان هەبێت، پابەند دەبن بەدۆزێکی تایبەتی دەسەڵاتەوە ، لەگەڵ بێزراوی ئەو دەسەڵاتە، ئەو سۆمبۆلانەش دەکەونە بەر هێرشی تورەیی خەڵکی. ئەمە ئەلف و بایەکی سادەو ساکارە کە بەنێو ئەقڵی سیاسی کوردی نەك هەر لێی تێناگات ، بەڵکو دەیکات بەسەرمایەکی ماتریالی و بەردەوام بەرهەمهێنانی سۆمبۆلەکانی قوربانی وەك (هەڵەبجە و ئەنفال و شەهیدان) بۆ قازانجی پڕوپاگەندەیی هەڵبژاردن و کردنی مۆنۆمێنتەکان بە دەخیلەی پارمەتی‌ەو ونکردنی ئەو هەموو پارەیە لە نێو کەناڵە پێچاوپێچەکانی گەندەڵی میلیشای حزبی و پاری دەسەڵات. ئەمە وایکردووە لەگەڵ یەکەم ڕووبەڕووبونەوەدا، ئەو سۆمبۆلانەدا بەر هێرش بکەون، کە ( کۆ هۆشمەندی ) کۆمەڵگە . ئۆتۆماتیکی پابەندی بکاتەوە بە دۆزی دەسەڵاتی گەندەڵەوە و تەجریدی دەکات لەهەموو ڕەگ و چیرۆکە مێژوویەکانی.

بێگومان ئەمەش ،سەرەتایەکی سادەی زانستی سایکۆلۆژیەتی جەماوەر و جوڵەیەتی لەکاتی هەڵچووندا، کاتێك ئەقڵی گشتی تورە دەبێت و خۆی دەداتە بەر نائەقڵانیەتی توندوتیژی، هەموو فاکتەرە ڕاستەقینەکان و هۆکارەکانی کێشەکە، کەساڵانێکی دووروودرێژە لەکۆنەستی کۆمەڵایەتیدا کەڵەکەبوون و برینداریەکی ڕۆحی پێکهێناوە، ئەم هەستە پەنگخواردووانە بەشێوەیەکی زۆر خێرا تێکەڵی کاردانەوە خۆڕسکی عەفەویەکان دەبن، ئیدی هەموو تورەبوونێك بەرەو هۆکار و سۆمبۆلەکان خۆی ئاڕاستەخواز دەکات، خۆی ئاڕاستەی ئەو سۆمبۆل و هەبووانە دەکات کە ڕەمزن بۆ ئەو دەسەڵاتەی ئازاری داون، برینی ویژدانی قوڵی تێدا بەجێهشتوون. لە هەشتاکاندا قوتابیانی ناوەندی و دواناوەندیەکان و هەندێك لەخوێندکارانی زانکۆکان، مێزو تەختەرەشیان دەشکان، پەنجەرەیان دەشکان، لەگەڵیشیدا وێنەکانی دیکتاتۆریش دەدڕێنرا، ڕاپەڕینی ١٩٩١ ڕاپەڕینێك بوو بەتاڵانی و تورەبوون دەستیپێکرد، لەبەرەبەیانەوە دەستیپێکرد تاوەکو ڕۆژانی دوایی ، هەر لەسوتاندنی فەرمانگەکانەوە بیگرە تاوەکو تاڵانی کارگەی جگەرە و عەمبارەکانی چەك و زەخیرە و خواردەمەنی . ئەمانە گێرەشێوێنی نەبوون بەقەد ئەوەندەی تورەبوونێکی مەشروع بوون لەئاست

هەموو ئەو سیاسەتی برسیکردن و عەسکەرتاریەت و چەوساندنەوە و تیرۆرەی حکومەتی بەعس پیادەی دەکرد، ئیدی هەموو دەزگا حکومیەکان کەوتنە بەر لێشاوی ئەو تورەیە، لەکاتی ڕووخانی بەغدا ئەو دیاردەیە جارێکی دیکە دووبارە بۆوە.ئەمانە هەمووی دوژمنداریەك نەبوون دژی خزمەتگوزاری ، بەڵکو تورەبوونێك بوو لەئاست قەیرانی خوێندن و دیکاتۆریەت و خوێنڕێژی و برسیکردن .

-٣-

سیناریۆی دەسەڵاتی دیسپۆت لەهەموو زەمەنەکاندا خۆی دووبارە دەکاتەوە، بەوەی گووایە لەهەموو تورەبوونێکی ئاوەهادا دەستێکی بێگانە و نەیار هەیە و چەند کەس و گروپێك تاوانبار دەکرێن. بەردەوام دەسەڵاتی دیسپۆت خۆی بەخاوەن ئەزمونێك دەزانێت لەبەردەم هەڕەشەدایە!، ئەم هەڕەشانەش پێویستیان بەزەبر هەیە. لەم هەستکردنەوە بەهەڕەشە، سیناریۆکان دەستپێدەکات. بەنیازی ئەوەی ئەو سیناریۆیە کاتیان پێ ببەخشێت بۆ ئەوەی بتوانن ڕووداوەکە بپێچنەوە و ڕای گشتیش لەنێو پڕوپاگەندەی جۆراوجۆری میدیاکانی خۆیاندا سەروبن بکەن. ئەم سیناریۆیە ئەو دەسەڵاتە دیسپۆتانە دەیکەن کەچارەسەری دیکەیان نیە جگەلە شێواندنی ڕاستیەکان و بەکارهێنانی هێزی سەرکوتکردن نەبێت .

دەسەڵاتی کوردی لەگەڵ هەموو خۆپیشاندانێکی ئاوەهادا بۆ ماوەیەك دەکەوێتە گرتن و کوشتن بەناوی گوللەی وێڵەوە!!، پاشان پڕوپاگەندەکردن بەناوی هێزی نەیار و بێگانە و دەستی ڕەش و ئێستاش بەناوی ئیسلامیەکانەوە!. لەدوایدا لیژنە و لیژنەکاری لەسەر شاشەی تەلەفیزۆنەکان باس لەبەرنامەی خۆیان دەکەن . بەمەش زەمەنێك تێپەڕ دەبێت و ئیدی کێشەکان جارێکی دیکە فەرامۆشدەکرێنەوە. بێگومان ئەوان چاك دەزانن کە مرۆیی کورد یادەوری مێژوویی لاوازە و زۆر زوو ڕووداوەکانیشان لەبیر دەچێت !!. ئەم سیناریۆیە لەکەلار دووبارە بۆوە ، لە ئاکرێ دووبارە بۆوە، لەلێدنی مقەڕاتی یەکگرتوو دووبارە بۆوە، لەکێشەی فڕاندنی‌دکتۆر (کەمالی سەید قادر) دووبارە بۆتەوە، ئاوەتا ئێستا لە هەڵەبجە بەتراژیدیای شەهیدبوونی گەنجێك خۆی دووبارە دەکاتەوە. ئەمانە هەمووی ئەو هاوکێشەیەمان بۆ ئاشکرا دەکات کەچیدی حاڵەتێك

نیە، دیاردەیەك نیە ،تورەبوونێك نیە، بەڵكو كێشەی خەڵكی كوردستانە لە گەڵ مۆدێلێكی دەسەلاتی سیاسی كە شەرعیەتی لەدەستداوە .

-٤-

سوتاندنی مۆنمێنتی هەڵەبجە حەیابردنی سیاسەتێكە بەبێ كولتور ، سیاسەتێكە بەبێ پرنسیپی ئەخلاقی ، ئاشكرا كردنی سیاسەتێكە دوور لەمێژوو و ئەدەب و زمان . سیاسەتێكە لەسەر فاكتەری رێكەوت دروستبووە ، لەسەر بنەمای هەل قۆستنەوە پێكهاتووە، لەسەر بنچینەی خۆمانەوەی ئەمرۆیە و داهاتووی میللەت و كۆمەڵگەیایەكیش بدەرە دەست قەدەر . ئەمانە كاردانەوەی ئەو سیاسەتەن كە هەموو رۆژێك خەڵكی كوردستان مامەڵەی لەگەڵدا دەكەن، وایلێهاتووە چیرۆكی گەندەڵی لێپسراوان بۆتە چیرۆكی بەرئاگردان و قسەی ئەسەتەق، سكاندالْ و حەیاچوونەكان بۆتە گێرانەوەكانی رۆژانەژیانی خەڵكی. لەگەڵیشیدا بەداخەوە چیرۆكی شۆرش و شەهید و ئەنفال بۆتە كارگەیەكی باشی بەرهەمهێنانی دۆلار و خۆنمایشكردنی ئەرجسیانە، بۆتە بانكێك سوودەكانی ئەوانی كردۆتە بەملیۆنێر و نیمچەمیلۆنێر ، هەموو چیرۆكەكانی شۆرشی كوردی بەداخەوە بوون بەچیرۆكی بێزراو و ناشرین لای خەڵك ، بەرادەیەك زۆر لەخەڵك لەبێزاریدا دەڵێن : ئاخ .. ئەوانەی شەهید بوون! ، كێ دەڵێت گەر لەژیاندابوونایە وەك ئەمانیان نەدەكرد .. ئەمە گەر بەدەنگی بەرزیش نەگوترێت ئەوا غایلەیەكە وردە وردە بەهزری هەمووان‌دا تێپەر دەكات، بەشێوەیەك نێكۆشەرێكی دێرین شەرمبكات لەنێو خەڵكیدا شانازی بەخەباتیەوە بكات لەدژی فاشیەت.. هەموو شتێك لەم دەڤەرەی ئێمەدا كراوە بە سەرمایە ، هەموو شتێك قابلیەتی بازرگانی پێوەكردنە، ئیدی گەر باس لە دڵسۆزی و بیناكردنەوە و كولتور و زمان و ئەدەب و دیموكراسی بكەیت ، خەڵكی بەگومانەوە سەیرت دەكەن، چونكە تەئكید بە لەدڵی خۆیاندا دەڵێن : ئاها ئەمەش گەندەڵێكی بچوكە و تازە سەری لەهێلكەی گلەییەوە دەرهێناوە بۆ ئەوەی بە پارە دەمی چەوربكرێت.. لەبەر ئەوە بەرێزان لاتان سەیر نەبێت كە مۆنۆمێنت ببێت بەدەخیلە و دەخیلەكەش لە تورەیدا بشكێنرێت!.

سوناندی مومینتی هەڵەبجە زۆرانبازی نێوان گەنج و پیری هێنایە ئاستی تەقینەوە. ئەم زۆرانبازیە کاتێك دەستیپێکرد کەنەوەکانی دوای ڕاپەڕین، گەنجی کوردی لەچیرۆکەکانی میلیشیای حزبی بێزاربوونە، ئەو چیرۆکانەی هەموو ڕۆژێك و هەموو ساتێك خۆی دووبارە دەکاتەوە و لەهەمان کاتیشدا پاسپۆرتی تێپەڕاندنی ناعەدالەتی و چەوسانەوەیە لە کۆمەڵگەدا. بۆنمونە خوێندکارێکی هیلاکی هەڵەبجەیی کەبەهەزار دەردەسەری نمرەی زانکۆ بەدەست دەهێنێت ، لەسلێمانی فڕێدەدرێتە نێو بەشێکی ناوخۆیەوە کە لەهەموو شوێنێك دەچێت ، تەنها شوێنی حەوانەی مرۆڤ نەبێت. کار بگاتە ئەو ڕادەیەی خوێندکاران لەتاو بێ کارەبایی و بێئاوی لەبەر دەمی حەوزی مزگەوتەکاندا خۆیان ببینەوە، بەیانیش دوای ئەو جەنگە سەختە لەگەڵ بێ کارەبایی و بێ ئاوی ، لێپسراوێکی پیر لەتەنشتیەوە دانیشێت ، یاخود تەنها لەنادی کۆلێژ و تاقیکردنەوەکاندا دەرکەوێت، یان قبوڵ خاسێکیش بەئاسانی لەگەڵ ئەودا لەهەمان هۆڵی خوێندندا بن!. ئەوان ڕوومەت سوور و خوێن گەش ، ئەم هیلاك و بێپارە ، ئەوان خاوەنی چیرۆکی خۆیانن کە چیرۆکی قارەمانێتیە و هەموو ساتێك بەهەمووانی دەفرۆشنەوە، ئەمیش خۆی بە قوربانیەکی زیندوو دەبینێتەوە کەهێشتا بەسەر زەویدا دەڕوا .. ئیدی دەبێت بەڕێزان مۆمێنت و چیرۆکەکان چ هێزێکی سۆمبۆلیان هەبێت، کە مۆنمێنت سومبۆلێك بێت بۆ دەسەلاتی پیرە جەنگاوەرەکان،کەخەباتی خۆیان و خوێنی ئەوانی دیکەیان کردۆتە تەلار و کۆشك و دۆلار و کۆمپانیا و شەهاداتی دکتۆرا و ماجستێری بەلاش و ئەستێرەی سەر شاشەکانی تەلفیزۆن و سەفەر بەناوی هەڵەبجە و کارەساتەوە بۆ ئەم ولات و بۆ ئەوێ.. بەمەرجێك هەمان خوێندکار دەبێت قەمتەرە بدات لەدەمی و قایشی پانتۆڵ و تەنورەکەی توندتر بکاتەوە بۆ ئەوەی پارەی پاسی نێوان هەڵەبجە و سلێمانی لەگیرفاندا بمێنێتەوە.. ئەمە لایەنێکی جیاوازی نێوان پیری سیاسی دەوڵەمەندە و گەنجی پڕ هیوای هەژارە، هەر بۆیە سەیر نەبوو کەلەهەموو خۆپیشاندانەکانی کەلار و تەنانەت ئاکرێ و زانکۆی سلێمانی و خۆپیشاندانەکانی دیکە . گەنج سەرە ڕمی ئەو بەریەکەوتنە توندوتیژانە بێت..

دەسەڵاتی کوردی ئەوەندەی خەریکی قژ و سمێڵ ڕەشکردنەوەیە بۆ ئەوەی خۆی بەگەنج نیشاندات ، ئەوەندە ئەو ڕووکەشیە ڕەنگدانەوەی دژایەتی و قەیرانی نێو هەناوی خۆیەتی لە بەرامبەر ئەو دروشمانەی کەبانگەشەی دەکات. دروشمەکانی وەك کۆمەڵگەی مەدەنی و عەلمانیەت و جیهانگیری و دیموکراسی و ئێراقێکی ئازاد و مەدەنی و لێبوردن و پێکەوەژیان..هتد . هەموو ئەم دروشمانە دروشمی نەوەی نوێی سیاسین کە سیاسەت وابەستەدەکەنەوە بەکولتور، سیاسەت وەك جیهانبینیەك دەبینن، سیاسەت وەك جوڵەیەکی کۆمەڵایەتی، سیاسەتێك کە گەنجە و هەمیشە لەجوڵەدایە. دەسەڵاتی کوردی سەرو ڕیشی خۆی بە بۆیەی عەلمانیەت و کۆمەڵگەی مەدەنی بۆیە دەکات ، کەچی کەدەکەوێتە نێو مامەڵەی سیاسەتەوە هەرچی مەلا و کۆنەبەعسی وفایلداران و کۆنەخواز و خێڵەك و ئیسلامەوی هەیە لەخۆی کۆی دەکاتەوە . کە خۆپیشاندانێکی ئاوەها دەبێت ئیدی گوللەبارانکردن و توندکردنی خەڵکی لەزیندانەکاندا و فڕاندنی نوسەرەکان (وەکو حاڵەتی کەمالی سەیدقادر) ،و تاوانبارکردن و زڕاندنی ناو و کەرامەت و ڕاستیەکان دەم وچاوی ئەو دەسەڵاتەیە کەهیچی کەمتر نیە لە ڕژێمە پیرەکانی ناوچەکە و داهێنەرانی ( چەوساندنەوەی ڕۆژهەڵاتی ). ئەمانیش لەسەر شێوازی خۆیان و بەو ئەو ئیمکانیەتە موتەوازعەیان درێژە بە زەبری چەوساندنەوەی ڕۆژهەڵاتی دەدەن. لە دوای خۆپیشاندانەکەی کەلار دەسەڵات بیری لەوە دەکردەوە چۆن پۆلیس فێربکات لەجیاتی گوللەباران و کلاشینکۆف ، هەڕاوەی پلاستیکی بەکاربهێنن!، بەڵام زۆری نەخایەند هەڕاوە پلاستیکیەکانی وەزیری ناوخۆ بەقودرەتی قادر بوونەوە بەکلاشینکۆف و لەهەڵەبجە بەکارهێترانەوە.

سەیر نیە خێرا دەسەڵاتی کوردی لەسلێمانی ڕابکات بۆ هەڵەبجە و دیسانەوە لەگەڵ مەلایەکان کۆببنەوە،بۆ ئەوەی مەلایەکان گەنجەکان هۆشیاربکەنەوە، بەگەنجەکان بڵێن کەئەمان هێشتا پێشمەرگەی گەلن و چیرۆکەکانینان جارێکی دیکە سەرلەنوێ بۆ بگێڕنەوە. بەڕای دەسەڵاتی کوردی هێشتا چیرۆکی شکۆمەندی ئەوان بە پێی پێویست نەگێڕدراوەتەوە، نوێنەری حکومەت بۆ کاروباری ئاینی خێرا ڕایکردەوە بەردەمی مەلایەکان و داوای ئەوەی کرد گەنجەکان دەبێت زیاتر مێشکیان سیخناخ بکرێت بە چیرۆکی پیرەکان، زیاتر دۆزی پیرەکان خەستبکرێتەوە، هەروەك چۆن پارتی دوای

سکاندالْ و حەیـچوونی شێخ زانا و گروپەکەی ڕایکردەوە بەردەم مەلایەکان و هەمان داوایان هەبوو. دەسەڵاتی کوردی لەقەیرانی ئاوەها پەنادەباتەوە بەر کۆنەخوازی خێڵەکی کوردی و مەلایەکانی، بۆ هیچ نا ، تەنها بۆ ئەوەی چیرۆکی پێشمەرگەئازاکان جارێکی دیکە بگێڕنەوە بۆ گەنجان، ئەو جەنگاوەرانەی لەنێوەڕۆکدا کۆنەخواز و دیسپۆتن ، بەڵام سمێڵ و ڕیشیان بە بۆیەکانی عەلمانیەت ڕەشدەکەنەوە ...

-٧-

هێشتا دەسەڵات وادەزانێت نوسین لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا پولێك ناکات . هێشتا لە ئەقڵیەتی خێڵەکی ئەواندا ڕۆژنامە تەنها بۆ نانخواردنە لەسەری یان تەنها پارچە کاغەزێکی قەبارە گەورەیە، ئەوان تەنها لەهێز تێدەگەن و ڕێزی هیچی دیکە ناگرن ، هەر بۆیە زمانی هێزی خەڵکی ڕۆژ بەڕۆژ تیژتر دەبێتەوە. ئەوەی بەئاسانی چاوێکی خێرا بە لاپەڕەی سکاڵانامەی هەموو ڕۆژنامەکانی نێو خۆی کوردستان و تەنانەت سەردانێکی ماڵپەڕەکانی ئینتەرنێت بکات،ئەو هەموو سکاڵانامەیەی بەرچاو دەکەوێت کە هاوڵاتیان زۆر هێمنانە خستویانەتە بەردەم حکومەت و بەنێو لێپسراون.چارەنوسی ئەو سکاڵانامانە ئەوەیە یان فەرامۆش دەکرێن و کەس وەڵامیان ناداتەوە، یاخود ئەوەیە بەشەکانی ڕاگەیاندنەکانی دەزگا حکومی وحزبیەکان وەڵامی دەدەنەوە،ئیدی لەوەڵامدانەوەی سەر کاغەز نەبێت هیچی دیکە نیە.. لای لێپسراوان ڕۆژنامەکان و وەڵامدانەوە و گوتاری ڕەخنەیی لەدەرەوەی هاوکێشەکانی سیاسەت و دەسەڵاتە ، سیاسەت کاتێك لای ئەوان سیاسەتە کە لوتیان دەبێت بە لوتیەوە، ئەمەش ئەو نابینایی و ناجیهانبینیە سیاسیە ئاشکرا دەکات کەدەسەڵاتی کوردی پێوەی دەناڵێنێ .. ئەوەندەی من ئاگادار بم خەڵکی هەڵەبجە و خوێندکارانی زانکۆ و هەموو ئەوانەی لەخۆپیشاندانەکانی کەلار و ئاکرێ و زانکۆیی سلێمانی و مامۆستایان و چەندەهای دیکە تادەگاتە دوا خۆپیشاندانی هەڵەبجە ، هەموو ئەمانە پێش وەخت هەموو ڕێگەیەکی شارستانیەتیان گرتۆتە بەر، لەبەرکارهێنانی ڕۆژنامەوە بیگرە تاوەکو سکاڵای ڕەسمی، لەحاڵەتی دکتۆر (کەمالی سەید قادر)دا پێشینە خۆی داوای دادگایەکی عادیلانەی کردبوو، هەموویان ڕێگەنەما نەیگرنە بەر، بەشێوەیەك فەرامۆش کران کە ئیدی خۆپیشاندان ببێتە ئامانج و لەدوایشدا لەشێوەی ڕاپەڕین شەڕە بەرد و پێکدانندا

تەعبیر لەخۆی بکات. دەسەلاتی کوردی بە خۆپیشانداراانی هەلەبجەیان دەگووت ناشارستانی و گێرەشوێن ، بەمەرجێك گەر چاوێکی خێرایان بە ڕۆژنامە و گۆڤار و تەنانەت ئەرشیفی فەرمانگەکانی خۆیان بخشاندایە ، ئەو ڕاستیە ساکارەیان بۆ دەردەکەوت کەئەوە خۆپیشاندەران نین کە ناشارستانین ، بەلکو ئەوانەن لەبەر مەستی شەوانە و گەندەلیان نەك هەر چاوێك بە ڕۆژنامەکاندا ناخشێنن. بەلکو ڕۆژنامە وەك سفرەیەکی هەرزانی نان خواردن دەبینن. خوێندکارانی هەلەبجە چەند ڕۆژێك پێش یادەکە ئاگاداری هەموو لایەکیان کردبۆوە کە ئەوان ئەمجارە ناهێلن هیچ لێپسراوێك خۆی بکات بەهەلەبجەداو چیدی نایەنەوێت ڕەمزی شەهیدەکانیان ببێت بە موناسەبەی خواردنەوە و چەپلە لێدان و هەلڕشتنی فرمێسکی تیمساحانە و دەخیلەبازی. دەسەلاتی کوردی لەگەندەلیدا بێت یاوەکو مەستی و خوماری شەوانەیان بێت، وەك هەموو گروپەیەکی مافیا، ئاگادارکردنەوەی خوێندکار و ڕۆشنبیر و سکالانامە بە هێند وەرنەگرت و کار گەیشتە تەقینەوەی توندوتیژی. لێرەوە ئەوە دەرئەنجامدەکەین کە دەسەلاتی لۆکالی تەنها حساب بۆ تیلای نێو دەستەکان دەکات. پێدەچێت باشتر بێت لەو هەموو نوسین و ڕەخنە و سکالانامە و پرۆسێسی مەدەنیانە. دەست بدەینە تیلاو بەردۆچکە ، بۆئەوەی بڕێك کارەبامان بدەنێ . یاخود زێرابێکمان بۆ چاکبکەنەوە، یاخود قوتارمان بکەن لەنەبوونی بێ ئاوی و بێ نەوتی( ولاتی نەوت) و نەخۆشی بێ دەرمان و خەستەخانە! پێدەچێ هەمووان بێنەوە سەر قەناعەتی ئەوەی لەگەل ئەم هەموو نەخوێندەوارە سیاسی و گەندەلانە لەجیاتی قەلەم و زمانی گفتوگۆی مەدەنی ،تیلا بگرینە دەست و لە فەرمانگە و پلە و پایە کارتۆنیەکانیان توڕیان بدەینە دەرەوە ژووری مالە حەفتا ژووری و چل و سی ژووری و ڤێلاکانیان داگیر بکەین و خوێندکارانی زانکۆیان تێدانیشتەجێ بکەین . بەڕێزان ئەمە قسەی من نیە . بەلکو ئەوە قسەی ئەو گەنجانەن. کەبەداخەوە، گەیشتونەتە ئەو قەناعەتەی کەزمانی تیرۆر باشترین زمانی ئاخافتنی مەدەنینانەیە لەگەل دەسەلاتی کوردی ..

ئەوەی لەنێو ئەم هەموو ڕووداوانەدا ونبووە، ڕۆشنبیرە بە مانا پڕوا پڕەکەی، ڕۆشنبیرێك کە لەبەردەمی میلیشیایەکاندا بەئاسانی دەکڕدرێت و نرخی لەسەر دادەنرێت. هەموو ئەوانەی لەتەنیشت سێبەرکانی دەسەڵاتەوە بێدەنگیان هەڵبژاردووە، بەشێوەیەك لەشێوەکان بەشێکن لەو دەسەڵاتی گەندەڵیە. لەڕفاندنی دکتۆر (کەمالی سەید قادر) بەتایبەت ، ئەو موباعەیە و پەیمابەستیەی نێوان نوسەرانی مەسلەکی و دەسەڵاتدا ئاشکرابوو. هەندێك وەك مژدە ئازادکردنی دکتۆر کەمالیان دەکردە سەرکەوتن بۆ لایەنی دیموکراسی سەرۆکەکان!!، بەمەرجێك دکتۆر کەمال تاوەکو ئەمڕۆ لەزیندان و بەندیخانەیەکی بێزراوی ئەم دەڤەرەدا ئەشکەنجەی جۆروجۆر دەدرێت. دەبووایە هەموو نوسەرانی نێو وڵات، بەتایبەت یەکێتی نوسەرانی کورد ، بەخۆپیشاندان لەبەردەم دەرگای ئاسایشدا دابنیشتنایە و تاوەکو دکتۆر کەمالیان نەهێنابایە دەرەوە وازیان نەهێنابا، بێگومان ئەمەش خەیاڵی دۆنکیشۆتانەی دکتۆر کەمال بوو لە ڤێنا ، پێش ئەوەی بەپێی خۆی بێتەوە بەردەمی دەسەڵاتی کوردی. کەچی نەك بەنێو یەکێتی نوسەران هەر ئەوەیان نەکرد بەڵکو ئارەزاییەکیشیان دەرنەبڕی .. وەزارەتی مافی مرۆڤی هەردوو حکومەتەکە کەئەمیان (وەزارەتی مافی مرۆڤی هەولێر) لەئاست ڕفاندنی دکتۆر کەمال و گرتن و کوشتنی بارەگاکانی حزبێکی سیاسی وەك یەکگرتوو و خۆپیشاندانەکانی ئاکرێ بێدەنگی هەڵبژارد ، گەر بەتوندی بەرگریشیان لە میتۆدە مرۆڤ دۆستەکانی ئاسایش نەکردبێت!!. وەزارەتی مافی بەنێو مافی مرۆڤی سلێمانیش لەمەڕ تەقەلێکردن لە خۆپیشاندەرانی کەلار و لێدانی خوێندکارانی زانکۆی سلێمانی و تەقەلێکردنی خۆپیشاندەرانی هەڵەبجە و شەهیدبوونی قوتابیەکی گەنجی وەك کۆردۆ بێدەنگ و کرو ماتی هەڵبژارد. پێمووایە وەزارەتەکانی مافی مرۆڤی حکومەتەکەمان دەرگای دووهەمی ئاسایش و بەندیخانە نەبێت، هیچی دیکە نین ..

خۆپیشاندەران ڕۆژانە لەنێو ئەم هەموو ناماقوڵە سیاسی و کۆمەڵایەتیەدا دەژین، ئیدی با هەر ئێمە بڵێین ئەمە مۆنۆمێنتە ، ئەوا ئەوان هەر دەڵێن : نەخێر ئەمە دەخیلەی دۆلارە!. بەڕێزان، لەنێوان سۆمبۆل و مرۆڤەکاندا چیرۆکێکی ئەخلاقی هەیە کەدرۆ قبوڵ ناکات...

# هاوڕێم ئێمە کوڕە وونبووەکانی دیکتاتۆرین

هاوڕێم هیوا قادر نامەکەتم خوێندەوە کە بۆ ( ڕێبین هەردی ) ت نوسیبوو , دیارە ئەو گەش بینیەی ڕێبین بەشێکی گەورەی لە کاری بەردەوامی ئەو وەك و نوسەرێکی هەمیشە لەبەرەی ئۆتۆپۆرسیۆنێکی فیکری جدیدا کاری کردووە , سەرچاوەی هەڵ گرتووە , گەشبینیەکی مەشروعە ڕێبین جوانترین گەشبینە کە لە تیۆری ڕەخنەو وکارکردن لەنێو پۆژەی ڕەخنەدا بڕوای بە دیموکراسیەت هەیە . سەیر لەوەدایە ڕۆژێك پێش ڕووخانی ڕژێم رادیۆی زێد ( Z ) لە نۆرنێرگ بۆ ماوەی چارەکە سەعاتێك گفتوگۆیەکی لەگەڵمدا ئەنجام دا , بەو سیفەتەی لەنێو ناپایلدا مێزگردێکم بۆ سازدرابوو لەمەڕ مەسەلەی جەنگ و ئاشتی , لە پرسیارێك دا لە مەڕ داهاتوی عێراق , هەمان وەڵامم دایەوە , کە دیموکراسیەت و کارکردن بۆ دیموکراتی مەسەلەی داهاتووی عێراق دەبێت , دیارە ئەمە گفتوگۆکارەکەمی زیاتر وروژاند و گووتی :

سەیرم لێ دێت تۆ باس لە دیموکراتیەت دەکەیت , بەمەرجێك ئێستا نیوەی شارەکانی عێراق دەسوتێن !! , دیارە من باسم لەوە کرد لەگەڵ روخانی رژێمێکی دیکتاتۆردا , خۆمان بەرانبەر جەنگێکی دی دەبینینەوە کە ئەویش جەنگە بۆ دیموکراسیەت , ئەمەش وەك و ئەزموونی کۆمەڵێك منداڵ وایە کە دەیانەوێت گەورە بن بە نوشتی و کێشەی خۆیاندا تێپەڕ دەبن , ن من ووتم یەکەم هەنگاو بۆ دیموکراسیەت نۆرمالیزەبوونی ژیانە , ئاسایی بوونەوەی ژیانە لە هەموو بوارەکاندا , ئێمە نیو سەدەیە لە باری نائاسایدا ئەژین , بەشێوەیەکی دی بڵێم هەرەشەی کوشتنمان لەسەرە , جاری با هەرەشەی کوشتن و تەعداکردنمان لەسەر لاچێت , ئەوجا دەتوانین هەناسەیەك هەڵکێشین , ئەو تۆزە هەناسە هەڵکێشانە سەرەتایەکی دیموکراسیەتە , لەم گۆشە نیگایەوە تەواو لەگەڵ ( ڕێبین ) دا یەك دەگرمەوە کە نەمانی دیکتاتۆرەکان یەکەم هەنگاوە بۆ دیموکراسیەت .

ڕێکەوت وابوو لە ئێوارەی روخانی سەدام دا ئێزگردەکەم ئەنجام دا چەند کاژێرێك دوای روخانی رژێم , من هەمان قسەی ڕۆژی پێشووم دووبارە کردەوە , چە پە هیلاکەکان و بەنێو مارکسی و ئانارشیست و توندڕەوە ئۆتۆنۆمەکانی دژ بە گلۆبالیزەشنی , ئەڵمان گاڵتەیان لە باسکردنی ئەو جۆرە دیموکراسیەتە دەهات , دیارە ئەوان لە قەوارەی سەدام تێ ناگەن

وەك كارەساتێكی گەورە , لای ئەوان گرنگ ئەوەیە هێزێك دژی ئەمەریكایەكان بێت !! ,
من گوتم :

بڕوا بوون بە خەڵك و تیۆرەی ڕەخنە وام لێدەكات بڵێم دیموكراسیەت پرۆژەیەكە لەدوای بەرگریكردن لە بوونی جەستەیی و قەوارەوە دێت , عێراق هەڕەشەی گەورەی جینۆسایدی لەسەر لاچوو , گەر ئەمە سەرەتایەك نەبێت بۆ ئاسایی بوونەوەی ژیان , ئەی ئێوە چ دەرمانێكی سیحری پێشنیار دەكەن , كە لە شەو و ڕۆژێكدا وڵات لە نیعمەتی یەكسانی خوازیدا میهرەبانە كات ؟!! دیارە مەنفاكان و تێكەڵ بوونی كەلتورەكان و ئەو مەوقعە دەبەخشێت بە تاراوگە گراو وەك بوونەوەرێكی بیركەرەوە لەدنیا كە زیاتر چاو لێكار و گوێگرێكی ووردبین بێت , وەك لەوەی ووتار بێژێكی سەرە ڕۆو بكەوێتە نێو چاڵی حەماسەت خوازیەوە , لەبەر ئەوەی وەك خودێك لە كلتورێك و كۆمەڵگەیەكی دیكەوە هاتوپت , توانای بەراورد كردنت بەهێزترە و هەستیارتریت , ئەمەش وات لێدەكات كە بەهەمان ئاست پارێزگاری بكەیت لە بابەتێك لە ڕەش بینی , نەك لە پێناوی پاسیڤیەتدا , بەڵكو لە پێناوی ئەوەی واقیعیەتی تاڵی كێشەكانی نێو سەدەی ئەو كۆمەڵگەیەش لەبیر نەكەین كەلێوەی هاتوین , بەڵام ئەمەش مانای ئەوە نیە ڕۆشنابیەكی دیموكراتیەت نەبینین وەك پرۆژەیەك كە ئێستا من و تۆ و ڕۆژنامە سەرپەست و خەڵكە ڕۆشن بیرەكانی كۆمەڵگە و نەتەوە جیاجیاكانی عێراق بتوانن قسەی لەسەر بكەن و قەیدیش نیە گەر سیاسیانەش بە جدیەوە لەسەری بەشەڕ بێن من لەو گۆشەنیگایەوە بڕوام بەو سەرەتایە هەیە كە ڕێبین بە دیموكراتیەتی تێدەگات تۆش وەك و ( ئەدوارد سەعید ) گووتەنی ( چیرۆكەكەت لەسەرەتاوە گێڕاوەتەوە ) كە گومانی تێدا نیە هەموان هەر دەبێت لەسەرەتاوە چیرۆكەكە بۆ ئەوی دیكە بگێڕنەوە . چیرۆكی پەراوێزەییمان لە ژیان و تەمەن بەسەر بردنمان لەگەڵ سەدام حسێنێكی ئەرجسی عاشق بە كوشتن و لەت و پەت كردنی جەستە و تینو بە خوێن , ئێمە منداڵی و هەرزەكاری و كامڵ بونیشمان لەژێر چەتری ئەو پیاوەدا بەسەر بردووە , بەردەوامیش وێنەی ئەو لەهەموو شوێنێك بوونی هەبووە , تەنانەت لە خەونیش دا , كێ هەیە لە خەونیشدا سەدامی نەبینیبێت , پیاوەك و لە خەونیدا پیاوانی سەدام نەهاتبنە سەری , پیاوەك و نەگیرابێت بە سەرباز !! , من خۆم تاوەك و ئێستاش و لەم مەنفایەش زۆرجاران خەون بەوەوە دەبینم كە لەیەكێك لە تاقیكردنەوەكانی زەمەنی ژیانی زانكۆییم كەوتوم و لە

خەونمدا خەمی ئەوەمە کە ئیدی دەگیرێم بە سەرباز و رەوانەی شەرەکانی ئێران دەکرێم یاوەك و دەبێت هەڵبێم ، زۆرجار کەبەئاگا دێمەوە هێشتا خەم و شتێك لەترس لەدڵمدایە خێرا خۆم دەگەیەنمە بالکۆنە بچوکەکە و سەیری خوارەوە دەکەم ، هێمن دەبمەوە چونکە دەزانم کە بە هەزارەها کیلۆمەتر دوورم لەبەرەکانی شەڕو جگە لەوەش زیاتر بەوە دڵخۆشم کە بەتەواوەتی رژێمی سەدام نەماوە !! ، بەڵام ئەو خەونە هەر ماوە ، ئەو ترسە ، ئەو دڵە راوکێیە بەردەوامیەکی ترسناکی هەیە لە رۆحماندا .. ئێمە هەر وەك ئەوەی کوڕی باوکێکی زۆردار و دڵ رەق بوبێتین ، ئاوەها تەنانەت دوای نەمانیشی بەشێکی زۆری میراتی ئەومان بۆ ماوەتەوە هەر لەترس و دڵەڕاوکێوە تاکو بیرەوەری ئەو ماوە زۆرەی پێکەوە ژیانمان وای لێکردووین بەشێك لە یادەوەریمان بە زەبری رۆژەکانی بەسەرمان بردوون ، پڕن لەوێنەی ئەو خۆ دووبارە کردنەوەی وێنەی سەدام و بەعسیەتیشمان لەدوای راپەڕینی یەکەمەوە بینیو تێیدا ژیاین ..

خۆ ئێستایش هەر وایە حەیاچوونەکانیش هەر وەك و خۆیانن ئێمەی کورد ئەوەندەی بەرامبەر بێگانەکان میهرەبانین ، ئەوەندە حورمەتی ئەو دۆست و ئازیزانە ناگرین کەوا هاو چارەنوسمانن ، ئەمە شتێکی ئاشکرایە و لەدوای رووخانی سەدامەوە ئەوەندەی کورد شەرمنە کەسێکی دیکەم نەبینیوە لەم عێراقە شەرمن و موحتەرەمتر .. ئەوانەی چوارساڵێکی رەبەق لەسەر تەپۆلکەیەکی رووتەن لەیەك شەودا بەکوشت داوە لەڕادیۆو تەلەفزیۆنەکانەوە تەشەنەو چەکلیەتی خۆیان نیشان دەدات و خۆیان بە کوڕی کۆن لەبەرامبەر یەکتری نیشان دەدا ئەوانە ئێستا بەرانبەر مەلایەکی نیمچە نەخۆشی نەفسی وەك فەرتوسی و خانە نشینێکی بیٔ دەسەلاتێکی وەك پارچەچیو ئەوانی دیکە ، موحتەرەم ترین و بەهرەمەند ترین کەسن بەمەرجێك لەشەڕی ناوخۆدالەسەر کراسی زەردوو سوور و شین و سەوز قەپۆز شکاوە و بە پێ لەقە چوونە سەر وورگی یەکتری و خەڵك شاربەدەر کراوە کە تاوەك و ئێستا پەنا هەندەکانی سلێمانی هەولێر نەگەڕاونەتەوە بۆ شوێنی خۆیان ، کەچی پێش ئەوان ( ساجدەخان و کچەکانی سەدام ) باوەشی میهرەبان و مافی مرۆڤیان بۆ دەکرێتەوە لەوەش زیاتر ئەوەیە ئەوەندەی سیانزدە ساڵە حیزبی کوردی ئەنفال و هەڵەبجە بەبەرخوردەی میدیاحیزبیەکانی و جەماوەر کرکردنەوە بەکار دەهێنیٔ و خۆی بە میراتگری ئەو دەزانێت پێمانی دەفرۆشێتەوە ، چی کاتێك عێراق رزگار دەبێت قوڕو قپێکی سەیری لیٔ دەکرێت و کەس باس لە چارەنوسیان ناکات ، تاوەك و

ئێستا سەرکردەیەك نەبووە بەشێوەیەکی سەرەکی و وەك مەسەلەیەکی سیاسی گرنگ و سەرەکی باسی زیاتر لە دووسەد هەزار ئەنفال کراوو جێماوەکانی بکات و بیکات بە خاڵێکی سەرەکی و لە هەموو میدیاکانی جیهاندا و لە ئێستاوە بیکات بە خاڵی جیاوازی داوی میزانی بەپەلە و ئیجرائەتی سیاسیانەی بکات و مۆرکی سیاسەتی کوردی لە عێراقی بەناو نوێ دا ئەو هەنگاوە دەست پێ بکات , لەجیاتی نیشان دانی رۆڵی قوربانی و سیاسەتی بەزەی پێدا هاتنەوە و باسکردنیلە میانەی ئەو مەسەلانەی پێویستی بە یارمەتی مرۆیی هەیە !! , دەبوایە لە مەحفەلە سیاسیەکان دا بە ئاشکرا , نەك شەرمنانە قسەی لێوە بکات , ئێمە ئێستا تەنها لە چەند دیلیکی شەرمننەبێت هیچی دیکە نابیستین و لە تەلەفزیۆنە لۆکاڵیەکانەوە نەبێت هیچی دیکە باس لە ئەنفال ناکرێت . نەك وەك پرۆژەی بەمیدیاکردنی ئەنفال , بەڵك و وەك بە پرۆگرام تیگەکردنی سیاسیانەی ئەنفال , وەك کارێکی سیاسی لەدەستوری عێراقی و ·ۆرکردنی پەیمان نامەیەکی رەسمی و مۆرکردنی بە هەموو حیزبە سیاسیە عێراقیەکان بە ئیدانەی ئەنفال بەشێوەیەکی قانونی کە ببێت بە ماڵ بەسەریانەوە , نەك سبەینێ حەکیمێکی حەوزەش بێت و بڵێت خۆ لە هەموو دونیادا گۆڕی بە کۆمەڵ و جینۆسایت هەیە , پیاوەك و عەرەبێکی تونسی لە پەیوەندیەکی تەلەفونیدا بۆ جەزیرە ووتی :

خۆ هەر عێراقیەکان گۆڕی بەکۆمەڵیان نیە , جگە لەوە کێ دەڵێت ئەوانە ئێرانیە کوژراوەکانی جەنگ نین ؟؟ ئێ خۆ کە پیاو مردووی هەبێت چی لێ دەکات ؟ ئەوا لەچاڵێکدا دەیشارێتەوە !! , گەر ئەمەش سبەینێ بەئێمەش ئەڵێن ئەوا ئاسمان کۆڵەکەی دەوێت نەك لەلایەن عەرەبی غەیری \عێراقی بەڵکو لەلایەن هێزە حەوزەیی خێڵەکەییەکانی عێراقەوە ئەمانە کاری جدی دەوێت نەك ئەم هەموو مجامەلەی شێخانە کە تاوەك و دوێنێ لە پاڵ سەدامدا پاروی چەوریان لێ دەدا , دەبوایە باس لە سەردەمی ئیمتیازات و کردنی ئنفال بە کێشەی هەنوکەیی لەسەر هەموو کێشەیەکی دیکەوە بوایە , ئەمانە و زۆر پێشنیاریی دیکە جێگەی چاوەڕوانی ئێمەوە بوو لە حیزبە سیاسیەکانمان .

ئێستا خەریکە بەهۆی ئەو شەرمنیەوە گۆڕی بەکۆمەڵی بەنێو شیعەکان , بێدەنگی ئێمەی کوردەوە لەمەڕ کارەساتەکانمان , ئەنفالیش دادەپۆشرێت , گەر ئەو موحتەرەمی و شەرمنیە نەبوایە , دەبوایە ئێستا سەرکردەکانی کورد زیاتر لە جاران و لە چوارچێوەی

دۆزینەوەی ئەو گۆڕە بەکۆمەڵانەی باسیان لە چارەنوسی ئەنفال کراوەکان بکردایە و دنیایان پڕکردایە بە دیکۆمێنتو شریت و تەسریحات .

ئەم گاڵتەجاڕیە زۆر دەم ترسێنێت ئەو بێدەنگی و شەرمە سیاسیەش کە بەنێوی دیبلۆماسیەتی کوردیە وە ئەنجام دەدرێت دەمترسێنێت , ئەو لە پڕ بەعێراقی بوونەوە و لێدانی مەقامی عێراقی لە میدیاکانمان دا دەمترسێنێت !! , لە پڕێکدا هەمووان گەڕاینەوە بۆ هەمان بالۆرەکەی سەدام هەر وەك ئەوەی ئەو پیاوە , ئەو باوەپیارە دڵ رەقە قەدەرمان بێت دیسانەوە دروشمەکانی گەڕانەوە بۆ ریزی نیشتیمانی و عێراقی بوونی شەریفانەوە و یەك پارچەیی عێراق , بەکردەیی هاتوەتە نێو کردەی سیاسەتی کوردیەوە , ئەمانە هەمووی گومانی ئەوەم لە مەڕ توانای حیزبی کوردی لاچەکەرە دەکات کە سبەینی گەر بەم شێوەی‌ئێستا بمێنینەوە کورسی تەنفیزی و تەشریعیە کۆنەکەش وەر نەگرینەوە نەخوازەڵە داوای کوردبوونی شاری کەرکوك بکەین , خۆ ئاگات لێیە دروشمەکانی قودسی کوردستان و دڵی کوردستان بوەتە شتێکی تاسوق لە میدیاکانماندا .

ئەوەی کە گەشبینیم کاڵ دەکاتەوە و وای لێکردم لەبەرامبەر رووخانی سەدام زۆر زوو سارد ببمەوە , ئەو پرسیارە بوو چ حیزبێکی سیاسی , یاوەك و چ سیاسەتێکی کوردی بەهێز بوونی هەیە کە بتوانێت لەنێو ئەو هەموو خومەینیە بچوکانەی وەك فەرتوسی و باقر و کوبەیسی و پاچە چی و چەلەبی و جبووری و خەزرەجی و سامەرائی و ئەوانی دیکەدا یاری کوردانەی خۆی بکات ؟ , گەر ئێمە هێشتا بەسەر دوو حوکمەت و دووناوچەی ئیداری و دووخەتی سیاسی شێواز و جیاواز و دوو دونیا بینینی حیزبی تەسکدا دابەش بین , کامە گوتاری کوردی دەتوانێت وەك کورد لە عێراقدا بوونی هەبێت , نەك وەك عێراقیەکی سەر لێشێواو !! , لەکاتێکدا ئەوانی دیکەی غەیرە کورد شارەزای موئامەرەو چوونە نێو دەسەلاتی حوکمەتن , بێ ئەوەی یەك قەترە خوێن لە پەنجەیان بێت بەڵام ئێمە بە لافاوی خوێنەوە لەبەردەم حوکمی زاتی مۆدێرن و خەون بینین بە چەند پۆستێکی لاوازی وەزارەتەوە کە بەنێو کورد بیگرێتە دەست دەگێرسێنەوە و هیچی دیکەمان لێ هەڵنەکراوە و لەوەندەش زیاترمان ناوێت !! هەر لەئەزموونی زەمەنی عبدالکریم قاسمەوە ئەم چیرۆکە کوردیە خەمبارە خۆی دووبارە دەکاتەوە , هیوادارم ئەمجارەشیان چیرۆکەکە خۆی دوبارە نەکاتەوە .

شاردنەوەی نیەتەکان و ئامانجەکان و خۆ کەڕ کردن . ئەو هەڵسوکەوتە سیاسیانەن کە حیزبی کوردی لەکاتی قەیرانە سیاسیەکاندا پەیڕەوی دەکات , خۆیان بێدەنگ دەکەن هیچ ناڵێن هەڵوێستە وەرناگرن , ئیدی هەموو شتێك لەو دیوی پەردەیی جوانی ئوتێل و ڕاڕەوی کۆبوونەوەکان لەگەڵ حوکومەت و موخابەراتەکان و دەزگا جۆر بە جۆرەکاندا ڕودەدات , بیّ ئەوەی کەس بزانێت و ئاگادار بێت کە توشی نوشستیش دەبن , ئینجا دێنە سەر باس کردن و ئاشکراکردنی هەندێ لایەنی مەسەلەکان ,بێگومان ئەمە ئەو کاتانە ڕودەدات کە پێویستیان بە خەڵك و تەنانەت زۆربەی ئەندامانی حیزبەکەی خۆیانە , لەبەر هیچ نا , تەنها لەبەرئەوەی بێگانەکان پشتیان تیّ کردون ئیدی حەماس و دورشماکانی دڵ و قودس دیسانەوە دیچتەوە سەر زاریان .

هەموو ڕێکەوتنەکانی سیاسی کوردی لەگەڵ حوکومەتەکانی عێراقدا , ئەم جۆرە سیناریۆیەی بەخۆیەوە بینیوە . کەچی ئێستاش هەمان بیّ دەنگی و موجامەلەی بەتاڵ و بە عێراقیەتبوونە دەبینین لە موفاوەزاتەکانی دیکەشدا لەگەڵیدا ژیاون لەبەر ئەوەی سەیر نیە بەعسیە هەڵهاتوەکانیش ببن بە پەناهەندە لامان , دەبێت دوعا بکەین کە پارچە زەوی و وەزیفەو مەدالیایی شەرەفی کوردایەتیشان پیّ ئەبەخشریّ .

تۆ هاوڕێم , باس لە پێشوازی لە سەرۆك عەشیرەتە عەرەبەکان دەکەیت و نیگەرانی بەو خۆ خەریك کردنەی میدیایی کوردیەوە بەو مەسەلەیەوە دەردەبڕی , بەڵام من بەهەقەت جیاوازیەك نابینم لەگەڵ سەرۆك عەشیرەتێك لەوی دیکە , گەر بەنەتەوە جیاوازیش بن مادامەکی هەردووکیان لە هۆزو زیندوو کردنەوەی دواکەوتویی عەقلیەتی خێڵ نێزیکمان دەخاتەوە . من تێناگەم حیزبێکی بەنێو سۆسیالیستی و دیموکرات خواز یاوەکو عەلمانی کوردی , بۆ ئەوەندە بە پەرۆشە بۆ باوەش کردن بە خێڵدا , کە بە شێکیان کۆنە جاش و خەفیفە و مەفیفە بوون , بگرێتە خۆی و لەسەر حسابی کۆمەڵگەی مەدەنی , هەیبەتیان بۆ دروست بکات و پشتگیریان بکات و بیان گرێتە خۆی , دێت و دیسانەوە ئەم دیاردە لەسەرجەم عێراقدا زیندوو دەکاتەوە , هەمان هەڵس و کەوتە سیاسیەکانی جارانی دووبارە دەکەنەوە هەروەك ئەوەی لەبەردەم کۆپیەکی سەقەتی سەدامدا بین , ئاوەها سیاسی کوردی چێژ لەدانیشتنی مەجلیسی شیوخی عەشایرەکاندا دەبینێت , یەکێك نەزانێت , مەزەندەی ئەوەدەکات کە بەغدا و عەرەبی عێراقی تەنها لە عەشایر و حەوزە پێك هاتوون !!. ئیدی وەك ئەوەی ڕۆشنبیران و چیرۆك نوسان و عەلمنیە جدیەکان

و مامۆستایانی زانکۆ و هونەرمەندان بوونیان نەبێت لەنێو عەرەب دا . راستە ئەو رۆشن بیرانە پەراوێز کرابوو ن لەلایەن رژێمی کۆنەوە , بەڵام جارێکی تر مەترسی وەلاخستنیان لەسەرە , ئەمجارەیان لەلایەن حەوزە و بەداخەوە حیزبە پێشکەوتو خوازە کوردیەکانیشەوە پەراوێز دەکرێنەوە , هەر وەك چۆن لەناوچەکانی خۆمان دا و لەم دوازدە ساڵەدا ئەم مومارەسەیە بەردەوامی هەبوو تاوەك و ئێستا هەوڵ دەدرێت رۆشنبیران لە عەقلیەتی خێڵ دا بخرێتە گەڕ گەر ئەشکرا پەراوێز و برسی بکرێن . ئێمە بینیمان بۆ لێدلنی چەپکی تۆزێك توند کە تەنها چەند گوتارێکیان دەنوسی بەدڵی خێڵ و دەزگاکانی نەبوو , هەزارەها کلاشین کۆف دەهاتنە دەنگ , بەلام ئیسلامیەك کە دووڕۆژ لەمەوبەر چەکی لەبەرامبەر هەڵگرتبوو سیاسەتێکی نەرم و گفتوگۆخواز پیادە کراوەو تەنانەت تاوەك و ئێستاش موجامەلەی ئەوان بەبەردەوامی هەیە . ئێمە لەجیاتی ئەوەی لەوە تێبگەین کەرۆشنبیرانی عێراقی و هێزێکی گرنگن بۆ پێکەوە ژیان و پەرەپێدانی دیموکراسی , حیزبی کوردی دێت و دەیەوێت ئەوانیش بەدەردی رۆشنبیرانی دیکە بەرێت , خێڵەکانی عەرەب پشت ئەستور دەکات لەسەر حیسابی هێزەکانی تری کە کە تازە لە کابوسی سەدام رزگاریان بووە , ئەمەش ئۆتۆماتیکی لاوازکردن و پەراوێزکردنی رۆشنبیرانە و هەوڵدانە بۆ کردنیان بە فەرمان بەر لەدەزگاکانی خێڵدا .. من و تۆ و رێبین و زۆربەی هاورێکانمان لەنیشتمان و لە مەنفاکان لە رێگەی زمانی عەرەبی و لە رۆشنبیری عەرەبییەوە پەنجەرەی رۆشنبیریەکانی دیکەمان لێکراوەتەوە , هەرچەندە بەزمانی دیکەی بیانیش بخوێنینەوە , چێژی زمانی عەرەبی جۆرێك لە ریتمی بیرکردنەوەمان پێك دێنێ بەحوکمی پێکەوەژیانمان لەنێو ئەم رۆشنبیریەدا , دیارە چ من و چ تۆش زیاتر ئەو عەرەبیە دەناسین کە شانۆی جوان و رۆمانی جوان و تیژی فەلسەفی جوان و شیعری جوانی پێ نوسراوە , لەگەلیشیدا لەگەڵ هاورێی چیرۆك نوس و شانۆکارو رۆشنبیرەکانی ئەو زمانەشدا ژیاوین و موحیبەتێکی زۆرمان هەبوە بۆیەکتری , هەر لە هاورێی خوێندکارەکانی زانکۆو پەیمانگاکانەوە تاوەکو ئەوانی دیکە , کە خەمی هاوبەشمان هەبووە .

کەچی هاورێم ئەوەیەك هەیە لەدوایی راپەرین گەورە بوەو زۆر ئاشنا نەبوە بەو تێکەڵ بونە زمانەوانی و رۆحیە . کە بەدەر لە پەیوەندیە سیاسیەکان . وەکو من وتۆ بە پێی بارو دۆخی ژیانی دوای راپەرین , لە بەغدا و موسڵ و شارەکانی دیکەدا نەژیاوەو

شارەزایی ژیانی ئەوانی دیکەی نیە بەتەواوی . ئیستاش کە لە میدیاوە ئەوانە دەبینیت ,
تەنها چەند عەگالْ بەسەریك و عەمامە ڕەشیکن ئیدی هەلەیەکی نا مۆنیفی لەلایەن
حیزبی کوردیەوە دەخریتە بەردەم , ئەوە زیاتر تەئکید لەو وینە هەلەیەدەکات ( بیگومان
بە پیی ئەو خۆ هیلاك کردنەی حیزبی کوردی لەگەلْ هۆزەکان ), هەروەك ئەوەی عەرەبی
عیراقی تەنها لە هۆزو حەوزە پیك هاتبیت و ئەمانە تاکە هیزی جولینەری سیاسی بن لە
ناوەڕست و خواروودا .

ئەم وینە هەلەیە – ئەم ڕوت کردنەوەیەی مرۆکانْ و کۆمەلگاکان لە هیزە
ڕۆشنبیریەکانیان و بەرهەمهینانەوەی تاك ڕەهەندی خیلەکیە , لە پشتیەوە ئەو
بیرۆرکەیە وەستاوە کەدەیەویت بلیت : کە تەنها خیلْ و دەزگاکانی شتیکی خۆ سە پاو نین
وەکو ڕۆشنبیرن دەلین , بەلکو ئەم عیراقە لە خیلْ پیك هاتووە ئەمە هاوکیشە و
سروشتی نەگۆڕی هەموو عیراقە . ئەمە کاریکی مەترسیدارە بەرامبەر نەوەیەك کە لە
ڕاپەڕیندا تەمەنی دە سالْ یان وەك و تەنانەتە حەوت سالْ بیت , کارەساتیکە ,
شیواندنی دەمووچاوی ئەوی کەیە تەلْخ کردنی بینینی نەوەی نویی کوردییە لەناست
ناسین و پەیوەندی ئینسانی لەگەلْ ئەوی تردا و کوشتنی ڕەهەندە ڕۆشنبیری و
ئیستاتیکیەکانی ئەوی دی کەیە .. من پیم وایە کاری داهاتومان ئەوەندەی دیکە گرانتر
ئەبیت , پەرەپیدانی ڕەخنەو دۆزینەوەی هەولەکانمانەو پەرەپیدانی ڕەخنەی جدی و
پشتگیری کردنی ڕەخنەیە وەك هیلیکی کارکردن لەهەموو عیراقدا , ( بیگومان لەدەرەوەی
حیزب و ئامانجە سیاسیەکان ) , وەك کۆمەلگەیەکی بەشەری کە لە کارکردن دا بیت بۆ
پیکهینانی کۆمەلگەی مەدەنی و لیدانی بنەما چەسپاوەکانی کۆنزەر ڤاتیڤەتی شۆڤیەت
و دیکتاتۆریەت و خیلاکەیەتی , ئەرکیکی قورسی هەمووان دەبیت .

لەوەتەی عیراق هەیە ئەم هیزە خیلەکی و شۆڤیەتیانە لە هەناوی ئەم کۆمەلگایەدا کاری
پیسی خۆی دەکات و هۆکاری بەرهەم هینانی فیگۆریکی وەك سەدام حسین پیم وایە
ڕوخانی سەدام سەرەتایەکە و بۆ پەرەپیدان و دۆزینەوەی ڕۆشن بیرانی عەرەبی جدی و
پەرەپیدانی پەیوەندی هونەری و ڕۆشن بیری بیت لەنیوانمان دا , لەو بڕیارەدام ئەمە
تاکە هۆکاریکە بۆ دەست پیکردنەوەی ئەو دیموکراتیەتیەی کە ڕیبینیش بە گەشبینیەوە
باسی لیوە دەکات .

ئەوەی سەیری واقعی کوردی ئێستا بکات و خوێندنەوەیەکی وردی هەبێت بۆ کولتوری بەعس، دووری ئەو قەیرانەی بۆ ئاشکرا ئەبێت کەلەنێوان شۆڕش و بەعسیزمدا درێژبوونەوەی هەیە . (شۆڕشی ڕووکەشی) کوردی نەك هەر نەیتوانیوە کولتوری بەعس لەزیانی ڕۆژانە و مومارەسەی ئیداریدا ڕیشە کێش بکات، بەڵکو خۆی بەشەرمییەوە درێژ بوونەوەی ئەو کولتورەیە . . .

لە بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوار چرا

دیزاینی بەرگ : هاوبەش عوسمان